| | |
|---|---|
| ناوی کتێب: | ڕێبازی بانگەواز |
| نوسەر: | احمد فائز |
| وەرگێڕانی | ئازاد نجم الدین |
| نەخشەسازی ناوەوە | هەردی |
| بڵاوکردنەوەی: | نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر |
| خــــە ت: | نەوزاد کۆیی |
| بەرگ: | أمین مخلص |
| نۆرە و ساڵی چاپ: | یەکەم ١٤٢٩ك – ٢٠٠٨ز |
| تــــــیراژ: | ( ٢٠٠٠ ) دانە |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان، ژمارەی سپاردنی ١٤١ ساڵی ٢٠٠٨

تفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٢٢ ٥١ ٤٦٠ ٠٧٥٠ - ٩١ ٧٢ ١٣٨ ٠٧٧٠
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# پێشکەشە بەوانەی

- بە دیدی ڕوون و
- بیری تیژ و
- پشووی درێژ و
- گەشبینیەوە

ئەم بانگەوازە هەڵدەگرن

## بسم الله الرحمن الرحيم

انَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ، ونَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِ أنْفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. وأشْهَدُ أنْ لا الهَ إلا اللهُ وأشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ.

يا أيُّها الذينَ آمَنوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِهِ ولا تَمُوتُنَّ إلاّ وأنتُمْ مُسلِمونَ

يا أيُّها النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدةٍ وخَلَقَ مِنها زَوجَها وبَثَّ مِنهُما رِجَالاً كَثيراً ونِساءً واتَّقُوا اللهَ الذي تَساءَلُونَ بِهِ والارْحَامَ إنَّ اللهَ كانَ عليكُمْ رَقيباً

يا أيُّها الذينَ آمنوا اتقوا اللهَ وقُولوا قَولاً سَديداً، يُصلِحْ لَكُمْ أعمالَكُمْ ويَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ ورسولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوزاً عَظيماً

أمَّا بعدُ: فإنَّ أصدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ، وخَيرَ الهَدي، هَدْيُ محمدٍ (ﷺ) وشَرَّ الامُورِ مُحْدَثاتُها، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وكُلَّ ضَلالةٍ في النَّارِ.

# پێشەکی وەرگێڕ

ئەم کتێبەی لەبەر دەستدایە (ڕێبازی بانگەواز) بەشێکە لە کتێبی (**طريق الدعوة في ظلال القرآن**)، کە مامۆستا (**احمد فائز**) لە تەفسیرە گرنگەکەی سەیید قوتب (**في ظلال القرآن**) وەری گرتووە، کە بریتییە لە ڕۆحی ئەو کتێبەو، گوشراوی دیدو بۆچوونی سەییدی ڕەحمەتی دەربارەی دیارو نادیار، دەربارەی گەردوونو ژیانو مرۆڤ، دەربارەی مرۆڤ و گۆڕانکاری.. کە بە شێوەیەکی گشتی بریتییە لە:

## تیۆری سەیید قوتب دەربارەی (بەرنامە) و(کۆمەڵ) و (بزاڤ)

واتە ئەو دیدە (دینی)یەی، کە مسوڵمانان کۆمەڵەکەیات (ئوممەت)ی لەسەر دروست دەکەن، ئینجا چۆن بە **کۆمەڵکاری‌و بە ڕێبازی دینەکەیان لە ناو ئەو کۆمەڵگەیەی تێیدا دەژین، خەبات (بانگەوازو جیهاد) دەکەن..**

**یان بە شێوەیەکی تر بڵێین: چۆن مسوڵمانان بە بانگەوازی ئیسلامی بزاڤێکی** گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی دروست دەکەن، تا ئەحکامەکانی شەرع لە دار الاسلامێکدا لەگەڵ زیادبوونی دەسەڵاتیاندا بچەسپێنن..

ئەم زنجیرە کتێبە ئەوە ڕون دەکاتەوە، کە ئیسلام بەرنامەی ژیانەو خوای گەورە بۆ ئەودی ناردۆتە خوارەوە، تا ببێتە بناغەو بنەمای ڕەفتارو ڕەوشتو نەریتی کۆمەڵایەتی‌و سیستمی سیاسی، تا هەمو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵگەکەی لەسەر بنیات بنرێت.

ئەم ڕوانگەیەی، کە لە دینەکەوە هاتووە دەبوو زۆر ڕوونو ئاشکرا بوایە، بەڵام بە داخەوە زۆر نادیارە، یان زۆر ئاڵۆز بووە! مانای دینەکەش، نەك هەر دیدو ئەحکامەکانی هێندە بچوك و بێ قەدر کراوە لای کەسە بەزیوەکان، بەڵکو بۆتە مایەی شەرمکردنو عەیبە!! لای هەندێك مورتەددو گێلە موسوڵمان بۆتە پەڵەی عار!

سەیید بەرەحمەت بێت خۆی دەفەرموێ: (زۆربەی زۆری زاراوە ئیسلامیەکان لە جێی خۆیان بۆ مانای تر داخزێنراون و ئێستا بۆ مانای تر بەکار دەهێنرێن! بۆیە زۆربەی ئەم خەڵکە دەبینیت وا تێگەیشتوون، کە بەرزترین پلەی ئیسلامەتی ئەوەیە، خۆت لە کونجی مزگەوتێك بئاخنی و حاڵت لیّ بێت و خەریکی زیکرو فیکر بیت، با دڵیشت مەشغول بێت. بابیروهۆشیشت بە شتی تردوە خەریك بێت! خەڵکی وا تیّ دەگەن، کە گۆڕینی کۆمەڵ و بەرهەڵستی کردنی خراپەکاری و جیهادکردن، وەکو جاران شتێکی سەرەکی ئیسلام نەماون!

لە ڕاستیدا فیکرو بیروهۆش و دیدو بۆچوون زۆر گۆڕاوە، تەم و مژێکی زۆر چڕ ڕێی لە بینینمان گرتووە، بۆیە ئاوا واتاو زاراوە ئیسلامیەکان ـ وەك پێویستن ـ لە بیرو ژیرییماندا باش دابین نابن! هەر لەبەر ئەم هۆیەشە ڕێبازوشێوازی کارو جموجوڵی بزاڤمان گەڕەلاوژێیە، بۆیە دەبینیت باوەڕمان بیّ تین و دامرکاوەیە.. کەسمان تین و تەوژمێکی وامان نییە وزەو وورەمان بجاتە گەڕ. سست و مەستین! دەردی هەرە سەختیشمان، بێدەنگی و کڕوکپی مەلاو داعی و زاناکانمانە. ماوەیەکی زۆرە زانای وامان تێدا هەڵ نەکەوتووە، وا بێت کە لە ڕووی دەوڵەتی ستەمکارو کاربەدەست و دەسەڵاتداری زاڵمدا، قسەی حەق بکات و ڕاستی ئیسلام بۆ ئەو خەڵکە پاك و داماوو بیّ ئاگایە ڕوون بکاتەوە.

ئەنجامی ئەم کڕوکپییەی زاناو مەلاکانمان بەرامبەر تاغوتە خوێن تاڵەکان وسەرهەڵدان و پەیدا بوونی واتاو زاراوەی نامۆی وا (کە لە سەدەکانی سەرەتای ئیسلامدا نەبوون)، ئەم واقیعە پڕ ستەمە دروست بووە. سەرەنجامی ئەم هۆیانەیە، ئاوا حاکمە ڕەزا قورسەکان جەماوەری خەڵکەکەیان وەك گاگەل و کەرو وڵاخ بەردو هێنانە دی ئاواتی پیس و چەپەڵی خۆیان و ئاغاکانیان خستۆتە پێش خوا.).

کەوا بوو ئەم زنجیرە کتێبە ئەوە ڕوون دەکاتەوە، کە دین خۆی چییەو دیدیشی دەربارەی ژیان و ئوممەتی موسوڵمان و بزاڤی گۆڕانکاری کۆمەڵگە چۆنە.. ئەوە ڕوون دەکاتەوە، کە دین ئەو باوەڕە مەعریفییە سادەیە نییە ـ ڕاستە یان هەڵە ـ

کە لە مێشکی کەسێکدا، بە سیفەتی شەخسی خۆی، دەچەسپێت، ئەوە نییە کەسانێك وا بزانن دینداری هەستێکی رێژەییەو، خەڵکیش ئازادن چۆن و بە چ دینێك دینداری دەکەن، یان هەر نایکەن..

ئەسڵی کتێبەکە، کە بە عەرەبییە دوو بەرگی گەورەیەو ورد نوسراوە، کە دەشکرێتە کوردی، لەگەڵ پەراوێزو توێژینەوەی حەدیسو راڤەکردنی هەندێ ناوو زاراوە، دووبەرابەر دەردەچێت، ئەوەش بۆ چاپو گواستنەوە زۆر بە تەکلیف زەحمەتە، بۆیە پێشتر وامان بە چاك زانیبوو بیکەینە شەش بەرگ، بەڵام ئێستا کە دەرفەتی چاپمان بۆ رێکەوتووە، بە باشمان زانی دوو کتێب لەوانە بکەینە یەك بەرگو، بەم قەبارەش کتێبەکە بە کوردی دەبێتە سێ بەرگ، دواتریش ئەگەر خوای گەورە کاری بۆ ئاسان کردین، دەزگایەکی بڵاوکردنەوە دەتوانێت هەمووی پێکەوە بە قەبارەی کتێبی ئاسایی چاپ بکاتەوە ان شاء الله..

بەشی یەکەم کە ناوی (دیدیو دین)ە رێڕەوێکی خۆناسینو شەش بەندی ترە، کە هەموویان لە پێناسەو روونکردنەوەی زاراوەی دین لە دیدی ئیسلامەوە راڤە دەکەنو، هەندێك لەو کەندو کۆسپە ناودەکیانە باس دەکەن، کە لە بێئاگاییو نەزانین، یان لە مەکرو پیلانی دوژمنانەوە لەناو بازنەی مسوڵمانانەوە سەرهەڵدەدەن، بە داخەوە هەر بە خودی مسوڵمانان دروست دەبن!

بەشی دووەم دوو کۆبەندە: کۆبەندی یەکەم، رێڕەوێکی ترو شەش بەندی ترە، هەموویان بە دەوری تەوەرەیەکدا دێنو دەچن، کە بریتییە لە سەلماندنو تەسلیم بوونی مسوڵمان بە وەحی خوایی و ئاراستەی پارسەنگی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت، کە سەرچاوەی پەیامی هەموویانو ئامانج لە هاتنیان روون دەکاتەوە، کە یەکە..

کۆبەندی دووەم، کە ئەویش پێنج بەندی ترە، جەخت لەو، دەکەنەوە کە باوەڕ هێنان جگە لەوەی، کە فەرمانی خوای گەورەیە، وەڵامدانەوەیەکی خۆیی سروشتی

مرۆڤی پارسەنگە، بۆ داعیە ئیسلامیەکانیش، کە شوێن کەوتەی پێغەمبەری نازدارن (ﷺ)، هەڵگرتنی پەیامی شاهێدی دانە لەسەر ئەو خەڵکەی ئەم لە ناویاندا دەژی و دەیەوێت پەیامی گۆڕانکاریی خۆییان بۆ روون کاتەوە..

پوختەی قسە ئەوەیە، کە ئەم بەرگی یەکەمی ڕێبازی بانگەواز، موسوڵمان دەخاتە سەرەتای ئاشنابوونی بە پەیامی ئیسلام، یەکەم، بە زانینی ماناو واتای دین، پاشان بە دۆزینەوەی ڕێبازی گۆڕانکاریی کۆمەڵگە، کە دیدێکی سیاسیەو لە زەمینە فیکریەکەوە دێت، ئەم دوو روکنەش (دیدی فیکری و ممارەسەی سیاسەت پێی) چوارچێوەی ئەو بنەمایانەن، کە رەفتاری تاك و کۆی موسوڵمانەکانی تێدا لە قاڵب دەدرێت، ئینجا سەرەنجامی ممارەسە کردنی موسوڵمانان بۆ ئەم رەفتارانە، نەریتێکی کۆمەڵایەتی تایبەت بە خۆیان بۆ دروست دەبێت، ئەم دوانەش (رەفتارو نەریت) دەبنە روکنی سێیەم و چوارەمی دیدە ئیسلامیەکە، کە سەید قوتبی رەحمەتی دەیویست بە نوسینەکانی (لەوانە، ئەم کتێبی ڕێبازی بانگەوازە) ببێتە سیمای جیاوازی کۆمەڵگەی موسوڵمان..

خوای گەورە ئێمەو ئێوەش سەرکەوتوو بکات لە تەواو کردن و بڵاو کردنەوەی بەرگەکانی دیکەش، هیواشم وایە، کە خوشك و برایانی خوێنەر بە وردی بیخوێنن، خوێندن نەك هەر خوێندنەوە.. با لەوە حاڵی بن، کە بۆچی سەید قوتبی رەحمەتی لە کۆتایی ژیانیداو لە زینداندا، ئەم جۆرە نووسینەی دەخستە بەردەست وەك لەوەی دانیشێت و کتێب لەسەر شتی تری فیکریی بنوسێت، یان یاداشتی خۆی و مێژووی ئیخوان بنووسێتەوە، کە نووسین لەسەر فیکر لەو زەمانی زیندانەی ئەودا (ساڵانی شەستەکانی سەدەی رابوردوو) ئاسانتر بوون و رێیان لێ نەدەگیرا وەکو ئەم بابەتانەی زۆر بە نارەحەت لە زیندانەوە دزەیان پێ دەکرا بۆ دەرەوە..

**والسلام عليكم**

١٠/ ١٤٢٨ك ـ ١١/ ٢٠٠٧ز

# ڕێـــڕەوێك[١]

# خـۆناســین

## جاهیلییەت:

جاهیلییەت وەنەبێ ماوەیەکی ڕابوردوو بێت لە ماوە جۆر بـەجۆرەکانی مێـژو، بەڵکو بریتییە لە هەموو بەرنامەو دەستوورێك، کە مرۆڤپەرستی تێدا دەرکـەوێت. ئەم سـیفەتەش لـە هـەموو پرۆگرامـەکانی ئـەمرۆی مرۆڤایەتیـدا بـە ئاشـکرایی دەردەکەوێت. چونکە لە هەموو پرۆگرامەکانی سەر زەمـینی ئـەمڕۆدا، مـرۆڤ لـە مرۆڤی وەکو خۆی ئایدیۆلۆژی و بیروڕاو بەرنامەو ڕێبازو ڕێساو یاساو خوو نـەریت وەردەگرن. جاهیلییەتیش ئەمەیە. ئەمە جاهیلییەتـە بـە هـەموو بنەماکانیـەوە، جاهیلییەتێکـە، کـە بـە ئاشـکراترین شـێوە مـرۆڤ مرۆڤـی تێـدا دەپەرسـتێت، هەندێکیان هەندێکی تریان لە جێی خـوای گـەورە دانـاوەو دەیانپەرسـتن! ئیـسلام تەنها پرۆگرامێکی ژیانە، کە مرۆڤی تێدا ڕزگار بوو بێت. چـونکە لـە ئیـسلامدا خەڵکی ئایدیۆلۆژی و بیرو ڕاو بەرنامەو ڕێبازو ڕێـساو یاسـاو خـوو نـەریتیان لـە خـوای پـەروەردگارەوە وەردەگـرن. سـەریش تـەنها بـۆ ئـەو دادەنـەوێنن، گـوێ ڕایەڵیشیان تەنها بۆ شەریعەتەکەی ئەوە. ملیشیان تـەنها بـۆ سیـستمەکەی ئـەو کەچ دەکەن، بەس. چونکە لە ئیسلامەکەدا مرۆڤ لە مرۆڤ پەرستی ڕزگاری بـوودەو بۆتـە خواپەرسـت. ئەمەشـە ئـەو دووریانـەی وا لـە نێـوان ئیـسلام و شـێوازە جۆربەجۆرەکانی جاهیلییەتدا.. لە جاهیلییـەتی ئـەمڕۆدا ماددەپەرسـتی هـەموو شوێنێکی گرتۆتەوە، هەموو لایەناکانی ژیـان بـۆ مـاددەو نرخـی مـاددە تـەرخان

---

[١] ئەم ڕێڕەوە احمد فائز هەر لە (في ظـلال) یەوە وەرگرتـووەو ویـستوێتی وەکـو پێـشەکیەك بـۆ بـەرگی یەکەمی کتێبەکەی (طریق الدعوة) بینوسێت، ئێمەش وەکو ڕێڕەوێك بۆ بەندەکان دامانناوە..

کراوە، ماددەپەرستی بۆتە خواپەرستی، ئەو، جێو ڕێی خەڵکیو سیستمی حوکمیان بۆ دیاری دەکات! ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە نابێ باری ئابوری تاك، کۆمەڵو کۆمەڵگە وا بکەن، ماددە جێو ڕێی بۆ خەڵکی دیاری بکات. چ جای ئەوەی کارتێکردنیان لە دەستمایەی ڕۆژی دواییدا هەبێت! ماددەپەرستی دەبێتە هۆکارێکی سەرەکی بۆ خولقاندنی بارودۆخی ئاڵۆزو نالەبار بۆ کۆمەڵگە. نەك هەر لە ڕۆژی دواییدا، بەڵکو لە ڕۆژانی ژیانی دنیاشدا.. مەگەر بە چاوی خۆمان ئەو پشێویو بەدبەختییە شارستانێتییەی ئەمڕۆ نابینین؟! کەوابوو حەتمەن دەبێ جۆرە بیروهۆشو بەرنامەیەکی تر بۆ حوکم کردنی ژیانی مرۆڤایەتی بێتە کایەوە، بیروهۆشێکی وا، کە بتوانێت کارزانانە نرخ بۆ پلەی بەها بۆ ئابوریو خەڵکی دانێتو بە شێوەیەکی واش ماددە ئاراستە بکات، کە بەختەوەریو هێمنیو ئاسودەیی خەڵکی تێدا بێت: **﴿قُلْ بِفَضْلِ اللّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾**(١٠ یونس-٥٨)، واتە: بڵێ با بە فەزڵو ڕەحمەتی خوا دڵ خۆشکەن، ئەو چاترە لەوەی کۆی دەکەنەوە. ئەو پرۆگرامەی، کە حوکمی ژیانی کۆمەڵە مرۆڤێك دەکات، هەر ئەوە کە بارودۆخی ئابوریو پلەو بەهای ماددەشیان بۆ دیاری دەکات، کە ماددە دەبێت، تا چ ڕادەیەك هاوکاری ژیانیان بێت، چونکە بە پێی ڕێسای ئەو پرۆگرامە دەبێتە مایەی ئاسوودەیی، یان دەبێتە مایەی کوێرەوەری کۆمەڵە لەبەر ئەم مەسەلەیەشە، کە ئاوا بایەخ بەم ئیسلامە گشتگیرە دراوە، بەو سیفەتەی، کە تەنها پرۆگرامی ژیانە..

ئەم هاتوهاوارە زۆرەی، کە ماددەو ماددەپەرستی وا زل کردووە، تا بەم شێوەیەی کە، هەموو بیروهۆشو هەستو نەستێکی خەڵکی گرتۆتەوە. بەم شێوەیەی کە ئەم خەڵکە بێئاگایەی کردۆتە ئامێرو، شەورۆژ هەڵپەیانە بۆی. تا ئەمەی، کە ماددەپەرستی کردۆتە ژیانو مایەی ڕەنجو تێکۆشانی خەڵکی. ئا ئەم هاتوهاوارەی، کە هەموو دابونەریتو هەستێکی پیاوانەی بۆ دەکرێتە قوربانی! ئەمە هەروا سادە نییەو بە هەوانتە نەهێنراوەتە مەیدانەوە! بەڵکو بە

پێی نەخشەیەکی ورد دەڕوات، ئامانجیش لەمە دانانەوەی بتە! بتی نوێ لە جێی بتەکانی جاهیلییەتی پێشوو، تا خەڵکەکە چەواشە بکرێنەوەو ڕووەو غەیری خواناسیو خواپەرستی پەل کێش کرێنەوە.. دەیانەوێت بتی نوێی سەردەمیش ـ وەکو ئەوانەی پێشوو ـ دەسەڵاتیان بەسەر هەموو هەڵسوکەوتێکی تاكو کۆمەڵدا هەبێت، ئەمە بەو هیوایەیە، کە هەر کاتێكو لە هەر جێیەك، پارەو بەرهەمی ماددی بووە بتو، خەڵکی لەدەوری گەڕانو هەموو ڕەنجیان بۆ خستە گەڕو بە پیرۆزەوە لەبەر دەمیدا وەستان، ئیتر هەموو ئیعتیباراتەکانی تری بۆ دەخەنە لاوە. خووڕەوشت، خێزان، ئابڕوو، سەربەستیو هەموو شتێکی پیرۆزی تر! ئینجا هەرچی شتێکیش بووە بەربەستی ڕێی پارەو بەرهەم ـ لە دیدی خەڵکەکەدا وای لێدێت ـ شایانی تووڕ هەڵدانو خستنە کەنارە، شایانی لادانو ڕادانە! ئەمەشە مانای بتپەرستی، ئەدی ئەگەر ئەمە بتپەرستی نییە، ئەدی بتپەرستی چییەو چۆنە؟ چماقۆچ و کلکی هەیە؟!

مەرج نییە بتپەرستی هەر هەر بریتی بێت لە دارو بەرد پەرستن، نا، هەواو هەوەسیش بتە، لافیتەو دروشمی دیدو بیریش هەر بتە، نازناوو پلەو پایەی سیاسیو کۆمەڵایەتیش بتە، دەیان ئیعتیباراتی تر هەیە، کە بوونەتە بت..

لە ڕاستیدا بەهاو نرخی سەرەکیو دەستمایەی ڕاستەقینە، دەبێ بۆ فەزڵو ڕەحمەتی خوای گەورە بێت، کە لە بەرنامەکەیدا دەردەکەون. ئەو بەرنامە جوانەی، کە هێمنی بە دڵ دەبەخشێتو گەردن ئازاد دەکاتو هەستو هۆشی مرۆڤایەتی مرۆڤ بەڕێزەوە دەپارێزێت. لەژێر سایەی ئەم بەرنامە تاقانەیەشدا، دەتوانرێت سوودی تەواو لەو (رزقو رۆزی)یە وەربگیرێت، کە خوای پەروەردگارو داد بۆ هەموو خەڵکی داناوە، چونکە ڕزقو ڕۆزیو پارەو شێوازە پێشکەوتووەکانی بەرهەم هێنانی ماددی، ئەگەر بە پێی بەرنامە جوانەکەی خوای گەورە نەبێت، دەبێتە مایەی بەدبەختیو کوێرەوەری خەڵکی، چونکە دەکرێنە ئامێرو لە بەڕێز کردنو گەورەکردنی ڕەوشتی ئاژەڵیدا، لەسەر حسێبی ڕێزی مرۆڤ بەکاردێن..

## بانگەوازی ئیسلامی و سێ خاڵی لاوازی

هەر دەبێ بانگەوازێکی نوێ بێتە کایەوە، تا ئەو خەڵکە لەم مردنە ڕاوەستاوە دەرهێنێت وبیانخاتە نێو ژیانێکی بەرفراوانەوە. هەر دەبێ بانگەوازێکی وا هەبێت، کە ڕێزو ئابڕو ووزەی ئەو خەڵکە بپارێزێت ونەهێڵێت زیاتر بخرێنە ژێر باری زەلیلیو بتپەرستی نوێوە. ئەو زەلیلییەی وای لە مرۆڤ کردوە، کە ملی بۆ مرۆڤی وەکو خۆی کەچ کاتو بۆی بچەمێتەوەو کڕنووشی بۆ ببات..

هەر دەبێ بزوتنەوەیەکی تر بێتە کایەوە ـ تا بانگەوازی خوایی وەکو خۆی بخاتە ڕوو. دەبێ پێش هەموو هەنگاوێکیش داعیەکان ـ ئەوانەی خۆیان بە هەڵگری پەیامی خواوویستی دەزانن ـ هۆکاری ئەو لاوازیە بخەنە ڕوو، کە تووشی موسوڵمانانی ئەمڕۆ بووە، پاشان دەبێ هەوڵی چارەسەرکردنی بدەن، ئەوجا ڕاپەڕنو کۆڵی ئەمانەتە خواییەکەیان بەوپەڕی وورە بەرزییەوە هەڵگرن..

سێ هۆی سەرەکی بوونەتە هۆکاری ئەم لاوازییەی مسوڵمانان، کە دەبێ هەر لە سەرەتاوەو زۆر زوو دەستنیشان بکرێن، ئینجا هەوڵی چارەسەرکردنیان بۆ بدرێت:

### ١- نەبوونی تاکی موسوڵمان:

دەبێ داعیەکان ئەوە بزانن، کە هۆی سەرەکی لاوازی موسوڵمانان و گەورەترین دژواری، کە تووشی شەخسیەتی موسوڵمانێتیان بووە؛ نەبوونی تاکی موسوڵمانی بەهێزو لێهاتووە.. لاوازیەکە ئەوەیە، کە تووشی گەنجەکان بووە، خۆ سەختترین دەردیش ئەوەیە، کە لە خۆدا بێت و پەی پێ نەبرابێت. چونکە چارەسەری هەموو کێشەو گیروگرفتێك ئاسانە، ئەگەر تاکەکانی کۆمەڵگەکە واقیعییانە پەروەردە کرا بن. بەڵام کارەساتەکانی بەزین و تێکشکان کاتێك دەردەکەون، کە ئەو جۆرە پەروەردەیە دانەمەزرا بێت. بۆیە کێشە لەسەر کێشە دروست دەبێت..

پیاوی لاواز، عادەتی وایە، کە هەمیشە هۆکاری غەیری خۆی دەکاتە هۆکاری لاوازی، هۆی وا کە گوایە ئەوەندە گەورەو سەخت بوون، ئەم دەرەقەتیان نەهاتووە، ئینجا هەر بۆ هەنجەت و بەهانەو پەڵپ دەگەرێ، تا وەك عوزر بیانهێنێتەوە.

سالّەهای سالّە وا پەروەردە بووین، فێرین غەیری خۆمان بکەینە هۆکاری دواکەوتوویی و لاوازی و دەروون بەزیویی خۆمان. جارێك ئیمپریالیزم خەتابار دەکەین و جارێك نەوەوقۆناغی رابوردوو، جاری دیش ئەو کۆمەلّگەیەی ئێستا تێیدا دەژین! کەس خۆی ناکاتە هۆ!کەس نالّێت: دەبوو من خۆم بایەخم بە خۆم بدایە..

## نموونەیەکی قورئانی:

قورئانی پیرۆز مرۆڤ خۆی دەکاتە خالّ و تەوەری سەرەکی، خوای گەورە روون و ئاشکرا ئەوە روون دەکاتەوە، کە هۆی سەردکی لاوازی کۆمەلّەو کۆمەلّگەی مرۆڤ، هەر مرۆڤ خۆیەتی، دەفەرموێ: (**أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّى هَـذَا قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنْفُسِكُمْ**) **٣ آل عمران/ ١٦٥** واتە: ئەوە بۆچی کە ناڕەحەتیتان تووش بوو (لە تێکشکانەکەی ئوحوددا) کە لەوە پێش هی تری واتان تووش بوو بوو، ووتتان: چۆن وامان لێ بەسەر هات؟! پێیان بلّێ: ئەوە خەتای خۆتان بوو.. خۆتان هۆکاری روودانی ئەو کارەساتە ناخۆشەن.. هەروەها خوای پەروەردگار کە بەسەر هاتی جولەکەکانی بەنونەزی[١] دەگێڕێتەوە، باسی تێکشکانیان بە دەستی موسولّمانان دەکات و خۆیان دەکاتە هۆکاری بەزین، بۆیە دەفەرموێ: (**مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا وَظَنُّوا أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ اللَّهِ فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الأبْصَارِ**) **٥٩ الحشر/ ٢** واتە: واتان گومان نەدەبرد، کە خۆیان تەسلیم بکەن و لە قەلّاو قوللەیان بێنە دەرەوە! خۆشیان

---

[١] بەنو نەزیر (بنو النضير) جولەکە بوون، لە مەدینە دەژیان، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی هێنا بۆ مەدینە، پەیمانی لەگەلّدا بەستن، کە نە تەوان شەڕ لەگەلّ ئەمان بکەن و نە ئەمانیش، بەلّام ئەوان پەیمانەکەیان شکاندو ویستیان پێغەمبەری خوا بکوژن! بەوەی کە ویستیان تاوێرە بەردێکی گەورە لەسەربانێکەوە بخەنە خواردوە بەسەریدا، بەلّام خوای گەورە ئەو پیلانە گلّاوەی ئاشکرا کردن. پێغەمبەریش هێزێکی کردە سەریان. دوای بەزینیان، وا ڕێکەوتن، کە مەدینە جێ بهێلّن و هەرچی دەشتوانن لە سەروەت و سامان ـ جگە لە چەك ـ لەگەلّ خۆیاندا بیبەن. سەیر ئەوە بوو، کە ئەو شتانەی پێیان نەدەچوو وەك دەرگاو کەل و پەلی قورس تێکیان دەشکاند یان دیوار بوو دەیانڕوخاند، یان درەخت بوو دەیانبڕییەوە!

هەر وایان دەزانی، کە قەڵاو قوڵلەکانیان بەرگرییان لێ دەکەن و ناهێڵن خوایان بگاتێ! بەڵام خوای گەورە لەو شوێنەوە بۆیان هات، کە گومانیان بۆی نەچوو بوو، ترس و بیمیشی هاویشتە ناو دڵیانەوە، بۆیە لە تاواندا بە دەستی خۆیان و بەدەستی موسوڵمانان خانووەکانی خۆیان دەرماند! دە ئێوەش ئەی خاوەن چاوو بیر! لەمەوە پەندو ئامۆژگاری وەربگرن..

بەنونەزیر چەك و تفاقی شەڕو بەرگرییان کەم نەبوو، ژمارەیان کەم نەبوو، بێ سەنگەر نەبوون، بەڵام هەر خۆشیان بوونە هۆی بەزینی خۆیان. پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (وَلَيَنْزَعَنَّ اللهُ المَهابَةَ مِنْ قلوبِ عَدوِّكم وَلَيَقْذِفَنَّ الوَهَنَ في قلوبِكُم. قالوا: يا رسولَ الله، ما الوَهَنُ؟ قال: حُبُّ الدنيا وكراهيةُ الموتِ)[1] واتە: پاشان خوای گەورە ترس و بیم لە دڵی دوژمنەکانتان دەردەهێنێت و بەزین دەهاوێتە نێو دڵی ئێوەوە. ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا بەزین چییە؟! فەرمووی: خۆشەویستی دنیاو بوغزاندنی مردنە.

ئەم حەدیسە پیرۆزە ڕێسایەکی گەورە لە ڕێساکانی گۆڕانی کۆمەڵگە دەخاتە ڕوو، ڕواڵەت و جەوهەری ئەو قۆناغە ئاشکرا دەکات، کە کۆمەڵێکی فیترە پیسی تەبیعەت بەد (لەوانەی خۆشەویستی دنیا، دڵ و دەروونیانی داگرتووە) لە ڕێیاندا دەیگەنێ و ناتوانن، نە لێی لادەن و، نە کۆتاییشی پێ بهێنن..

هۆی ڕاستەقینەی بەزین؛ خۆییە نەك دەرەکی. بۆیە نابێت گلەیی لەو ڕەشەبایە بکرێت، کە هەڵدەکات و ملی درەختێکی گەندەڵ دەشکێنێت. بەڵکو گلەیی لە درەختەکە خۆی دەکرێت. قورئانی پیرۆز چۆنیەتی دۆوینەوەی ئەم ڕاستییە ڕوون دەکاتەوەو، هۆی تێکشکان و بەزینی میللەتان دەردەخات. ئەو هۆکارە سەرەکیە

---

[1] ئەم حەدیسە زۆر ریوایەتی تری هەیە، ئەو ریوایەتە سەحیحەی، کە ئیمامان ئەبو داوودو ئەحمەد گێڕاویانەتەوەو شێخی ئەلبانی لە (سلسلة الاحاديث الصحيحة) دا لە ژێر ژمارەی ٩٥٦ دا لە بەرگی دووەمدا هێناویێتیەوە، هەروەها لە (صحيح الجامع الصغير) بەرگی شەشەم ژمارە (٨٠٣٥ و ٣٧٢٦) دایە بەم دەقەیە (يُوشِكُ أنْ تَتَداعى عَليكُمْ الامَمُ مِن كُلِّ أُفُقٍ، كَمَا تَتَداعَى الأكَلَةُ عَلَى قَصعَتِهَا. قِيلَ يا رسولَ الله أفَمِنْ قِلَّةٍ يومَئذٍ؟ قالَ: لا ولكنَّكُمْ غُثاءٌ كَغُثاءِ السَّيلِ يَجْعَلُ الوَهَنَ في قُلوبِكم وَيَنْـزَعُ الرُّعْبَ مِن قُلُوبِ عَدُوِّكمْ، لِحُبِّكُمْ الدنيا وكَراهيَّتِكُمُ الموتَ)

باس دەکات، کـە دەبێتـە هـۆی دروسـت بـوونی زوڵـم و سـتەم و دەسـتدرێژی لـە کۆمەڵگەکاندا، هۆکارەکەش دەناسێنێت، کە هەر مرۆڤ خۆیەتی، ئەوی دەشـیهێنێتە ئەو بارودۆخ و تەنگژەشەوە، بـزاڤ و هـەڵس و کـەوتی خۆیـەتی، کـە بـەو شـێوەیە نایکات، کە خواویست و ڕەسەنە، بـەڵکو بـەو شـێوە لاسـەنگ و نارەسـەنەیە، کـە قورئان ناوی ناوە: ستەم لە خۆ (ظلم الـنفس). نابینیـت لـە زۆر شـوێنی قورئانـدا دەفەرموێ: (وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَـكِن كَانُواْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ) ١٦ النحل/ ١١٨ واتە: ئێمـە ستەممان لێ نەکردن، بەڵکو خۆیان ستەمیان لە خۆیـان کـرد. کـەوا بـوو یەکـەمین خاڵی لاوازی کە دەبێ دیاری بکرێت و، پاشـان چارەسـەر بکرێـت، دڵ و دەروون و ناخی تاك تاکی موسوڵمانانە. بۆیە لە حەدیسی قودسیـشدا[1] هـاتووە، کـە: (فَمَـنْ وَجَدَ خَيراً فَلْيَحْمِدِ اللهَ وَمَنْ وَجَدَ غَيرَ ذلِكَ فَلا يَلُومَنَّ الا نَفْسَهُ)[2] واتە: ئەوی چاکەی هاتە ڕێ، با سوپاسی خوا بکات، ئەوی شتی تریشی هاتە ڕێ، با لۆمـەی کەسـی تـری غەیری خۆی نەکات.. ئێمە تەنانەت مافی گلەیی و بۆڵە بۆڵمان بەسەر شەیتانیشدا

---

[1] حەدیسی قودسی ئەوەیە، کە ئەسڵی ماناکەی لە خوای گەورەوەیە، پێغەمبەر (ﷺ) بە وتەی خۆی دەری بڕیووە، بە زمانی ئەویشەوە دەیگێڕێتەوە. ئێمەش، کە دەیگێڕینەوە دەڵێین: (قال رسول الله فيما يرويه عن ربه) واتە پێغەمبەر (ﷺ) لە خوای خۆیەوە دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ. یان دەڵێین: (قال الله سبحانه وتعالى في الحديث القدسي) واتە: خوای گەورە لە حەدیسی قودسیدا دەفەرموێ..

[2] ئەم حەدیـسە پارچەیەکە لە حەدیـسێکی قودسی درێژ کە ئیمامی موسلیم گێڕاوێتیەوە، ئەمەش دەقەکەیەتی: (عن أبي ذر الغفاري ـ رضي الله عنه ـ عن النبي (ﷺ) فيما يرويه عن ربه عزوجل أنه قال: يا عِبادي إنّي حَرَّمْتُ الظلمَ على نَفْسي وجعلتُهُ بينكم مُحَرَّماً فلا تظالَموا يا عبادي كلكم ضالٌّ إلاّ من هديتُهُ فاستهدوني أهْدِكُمْ، يا عبادي كلكم جائعٌ إلا من أطْعَمْتُهُ فاستطعِمُوني أطعِمْكم يا عبادي كلكم عارٍ إلا من كَسَوتُهُ فاستكسوني أكسُكم يا عبادي إنكم تُخطئون بالليل والنهار وأنا أغفرُ الذنوبَ جميعا فاستغفروني أغْفِر لكم يا عبادي إنكم لن تَبلغوا ضَرِّي فتَضُرُّوني ولن تبلغوا نفعي فتنفعوني يا عبادي لو أنَّ أولَكم وآخرَكم وإنسَكم وجنَّكم كانوا على أتقى قلبِ رجلٍ واحدٍ منكم ما زادَ ذلك في ملكي شيئاً يا عبادي لو أن أولَكم وآخرَكم وإنسَكم وجنَّكم كانوا على أفجرِ قلبِ رجلٍ واحدٍ ما نَقَصَ ذلك من ملكي شيئا يا عبادي لو أن أولكم وآخركم وإنسكم وجنكم قاموا في صعيد واحد فسألوني فأعطيتُ كلَّ إنسانٍ مسألتَهُ ما نقيَ ذلك مما عندي إلا كما يُنقِص المِخْيَطُ إذا أُدْخِلَ البحرَ يا عبادي إنما هي أعمالكم أُحْصيها لَكُمْ ثم أوفيكم إياها فَمَنْ وَجَدَ خيرا فليحمدِ اللهَ ومَنْ وجد غيرَ ذلك فلا يَلُومَنَّ إلا نفسَه) الامام احمد له المسند٥/ ١٦٠ و١٧٧ صحيح الجامع ٤٣٤٥، مختصر مسلم ١٨٢٨.

نییە بیکەین! چونکە خـوای گـەورە باسـی شـەیتان دەگێڕێتـەوە ـ کـە لـە ڕۆژی قیامەتدا تینی بۆدێت ـ تەبەڕا دەکات: (وَقَالَ الشَّيْطَانُ لَمَّا قُضِيَ الامْرُ إِنَّ اللّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ إِلا أَن دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ لِي فَلا تَلُومُونِي وَلُومُواْ أَنفُسَكُم) ١٤ ابراهیم/٢٢ واتە: کاتێك کار گەیشتە کۆتـایی شەیتان دەڵێ: خوای گەورە بەڵێنی حـەق و دروسـتی پێـدا بـوون، منـیش بـەڵێنم دابوونێ! بەڵام من بەڵێنەکەی خۆمم نەبردە سەر، جا خـۆ مـن هـیچ دەسـەڵاتێکم بەسەر ئێوەدا نەبوو، هەر ئەوەنـدن بـوو بـانگم کـردن (بـۆ ئـەو ئامانجانـەی خـۆم هەمبوون) ئێوەش بەدەنگمەوە هاتن، ئـیتر بۆچـی لۆمـەی مـن دەکـەن؟! لۆمـەی خۆتان بکەن..

## ٢- دوور خستنەوەی ئیسلام:

دەروون بەزیویی، موسوڵمانانی گەیاندۆتە ئەو ڕادەیەی، کە دوژمنـانی ئیـسلام بەوە نەوەستن، کە پیاوخراپانی خۆیان بخزێننە نـاو ڕیزەکانیانـەوە، بـەڵکو هـەوڵی گۆڕینی یەکجاری دید و بیرو شۆڕینەوەی مێشکیشیان دەکەن! ئەوەتا (زوەیمـەر) ی قەشەی مەسیحی لەو وتارەیدا، کە لـە کـۆنگرەی موبەشـشیرەکاندا دای(ئەوانـەی مەسیحێتی لە جیهاندا بڵاودەکەنەوە) لە ناوچەی (جبل الزیتون) ی قودسی پـیرۆز، لە سـەردەمی دەسـەڵاتی ئینگلیزی داگیرکەردا، دوای ئەوەی گوێی لە وتاری بەشدار بوانی کۆنگرەکە گرت ـ کە هەر یەکەیان گلەیی وگازاندەی لەوە هەبوو، کە گوایـە بڵاوکردنەوەی مەسیحێتی لە جیهانی ئیسلامدا کارێکی نەزۆك وبێ بەرە.. زوەیمەر ووتی: (ئەی برایانی پاڵەوان! بەڕاستی ئێـوەی ئـازیز بـە جـوانترین شـێوە ئـەرکی سەرشانی خۆتان جێبەجێ کردووە، ئەگەرچـی وا هەسـت دەکـەم، کـە هەنـدێکتان لەگەڵ ئەوەشدا، کە زۆر بە ڕێکوپێکی کاروباری خۆی ئەنجامداوە، بەڵام دەرکی بـە تەواوی بە ئامانجە سەرەکیەکانی مەسیحیەوانی نەکردووە! منیش وەکو ئێـوە لـەو باوەڕەدام، کە ئەو موسوڵمانانەی بونەتە مەسیحی یەکێکن لەم جۆرانە:

ـ منداڵ بوون، هێشتا فامی ئیسلامەتیان نەکردۆتەوە.
ـ یان کەسانێك بوون، کە ئەسڵەن گاڵتەیان بە دین هاتووە!
ـ یان لەو کەسانەن دەیانەوێ لە ڕێی گۆڕینی دینەوە بەرژەوندی خۆیان بێننەدی..

ئێوە دەبێ ئەوە بزانن، کە ئەرکی سەرەکی ئێمە ئەوە نییە، کە موسوڵمانەکان بکەین بە مەسیحی! نا، ئەوە هیدایەتدان و ڕێزلێنانێکی گەورەیە، کە موسوڵمان شایانی ئەوە نییە! کاری سەرەکی وئامانجی بەرنامەکەمان ئەوەیە، ئەم موسوڵمانانە لە ئیسلامەکەیان بهێنینە دەرەوەو بیانکەینە مرۆڤی دوورلەخوا، تا وایان لێ دێت هیچ خوورەوشتێکی وایان پێ نامێنێت، کە میللەت و نەتەوەکانیان ئیعتیمادیان بکەنە سەر، بە هێنانە دی ئەم ئامانجەش، ئێوەی بەڕێز دەبنە پێشڕەوی سەربازانی ئیستیعمار[1] لە هەموو ناوچە ئیسلامیەکاندا..

هۆ برایانی بەڕێزم! لەم ماوەیەدا ـ لە سێیەکی سەدەی نۆزدەهەمەوە، تا ئێستا توانیومانە هەموو بەرنامەوپرۆگرامی خوێندن لە ناوچە ئیسلامیەکاندا بگرینە دەست. توانیومانە دەزگای تەبشیروکلێساوکۆمەڵەو قوتابخانەی مەسیحیەوانی لە هەموو شوێنێکدا دابمەزرێنین. هەر هەمووشیان ولاتانی ئەوروپاو ئەمریکا سەرپەرشتیان دەکەن.. فەزڵ و چاکە ـ لە راستیدا ـ هی ئێوەیە، چالاکیو وزەی ئێوەیە، کە بە جۆرەها شێوازی تازەتان، توانیتان ئەقڵ و بیری موسوڵمانان ئامادە بکەن، کە ئەو ڕێیە بگرنەبەر، کە ئێوەی ئازیز بۆتان دیاری کردوون، ئێوەن لە ڕاستیدا، کە توانیوتانە لە ولاتانی ئیسلامیدا نەوەیەك پەروەردە بکەن، کە هیچ پەیوەندییەکیان بە خواوە نەماوەو ناشیانەوێت بیانبێتو ئەوانەش دەبوغزێنێت، کە خواویستن. توانیتان موسوڵمانەکان لە دینەکەیان دەرکەنو ئەو نەوەیە پەروەردە بکەن، کە ئیستیعمار دەیویست. نەوەیەکن، کە لە ڕواڵەتو

---

[1] داگیر کەرە ئیمپریالیستەکان بە خۆیان دەووت ئیستیعمار! واتە ئەوانەی (عمران: ئاوەدانی) دەکەنەوە تا ساناتر بتوانن خەڵکی فریو بدەن و بە ئەقڵیان پێ بکەنن! بۆیە لالۆ زوەیەریش بەم پێناسەیە دەڵێ ئیستیعمار.

سیفەتە جەوهەریەکانیاندا، هیچ بایەخێك بە شتی گەورە نادەن، نەوەیەکن، کە هەر حەزیان لە تەمبەڵی وحەوانەوەی بەر هەواو هەوەس وتێر کردنی ئارەزووەکانی خۆیانە. نەوەیەك حەزی لە راستی نییەو ناشیەوێت بخوێنێت، گەر بشخوێنێت هەر بۆ تێر کردنی گەدەو داوێنیتی، گەر سامانی کۆکردەوە، بۆ رابواردن و ئارەزوی خۆی سەرفی دەکاتەوە، گەر دەستیشی لە پلەو پایەیەك گیر بوو، بۆ هێنانە دی ئاواتە شەخسیەکانی خۆیان تەرخان دەکاتەوە. ئەمانە نەوەیەکن لە پێناوی تێر کردنی مەیل و کەیف و سەفای خۆیاندا، هەرچی شت هەیە دەیکەنە قوربانی[1].

## ٣- نەناسینەوەی ئیسلام:

زۆربەی زۆری زاراوە ئیسلامیەکان، لە جێی خۆیان بۆ مانای تر داخزێنراون و، ئێستا بۆ مانای تر بەکار دەهێنرێن! بۆیە دەبینیت زۆربەی ئەم خەڵکە وا تێگەیشتوون، کە بەرزترین پلەی ئیسلامەتی ئەوەیە، کە خۆت لە کونجی مزگەوتێك بئاخنی و حاڵت لێ بێت و خەریکی زیکرو فیکر بیت، با دڵیشت مەشغوڵ بێت. بابیروهۆشیشت بە شتی ترەوە خەریك بێت! خەڵکی وا تێ دەگەن، کە گۆڕینی کۆمەڵ و بەرهەڵستی کردنی خراپەکاری و جیهاد کردن، وەکو جاران شتێکی سەرەکی ئیسلامەتی نەماون! لە راستیدا فیکرو بیروهۆش و دیدو بۆچوون زۆر گۆڕاوە، تەم و مژێکی زۆر چڕ، رێی لە بینینمان گرتووە، بۆیە واتاو زاراوە ئیسلامیەکان ـ وەك کە پێویستن ـ لە بیرو ژیریماندا باش دابین نابن! هەر لەبەر ئەم هۆیەشە رێبازوشێوازی کارو جموجوڵی بزاڤمان، گەرەلاوژێیە، بۆیە دەبینیت باوەڕمان بێ تین و دامرکاوەیە.. کەسمان تین و تەوژمێکی وامان نییە، وزەو ورەمان بخاتە گەڕ. سست و مەستین! دەردی هەرە سەختیشمان بێدەنگی و کڕوکپی مەلاو داعی وزاناکانمانە. ماوەیەکی زۆرە زانای وامان تێدا هەڵ نەکەوتووە، وا

---

[1] گۆڤاری الفتح ژمارەی ئەو ساڵانەی کۆنگرەیان تێدا گیرا ١٩٠٦، ١٩٢٤، ١٩٣٥.

بێت کە لە ڕوی دەوڵەتی ستەمکارو کاربەدەست و دەسەڵاتداری زاڵمدا قسەی حەق بکات و، ڕاستی ئیسلام بۆ ئەو خەڵکە پاك و داماوو بێ ئاگایە ڕوون بکاتەوە.

ئەنجامی ئەم کڕوکپییەی زاناو مەلاکانمان بەرامبەر تاغوتە خوێن تاڵەکانو سەرهەڵدانو پەیدابونی واتاو زاراوەی نامۆی وا (کە لە سەدەکانی سەرەتای ئیسلامدا نەبوون) ئەم واقیعە پڕ ستەمە دروست بووە، سەرەنجامی ئەم هۆیانەیە، کە ناوا حاکمە ڕدزا قورسەکان جەماوەری خەڵکەکەیان وەك گاگەلو کەرو ولاخ بەرەو هێنانەدی ئاواتی پیسو چەپەڵی خۆیانو ئاغاکانیان خستۆتە پێش خوا..

ئەم سێ نەخۆشیە سەختە: (بێدەنگی لە ووتنی حەق، زۆربوونی ستەم،و شێواندنی مانای زاراوە ئیسلامیەکان) هۆکاری ئەم بێکەسیو پشێویو بەدبەختیەن، کە تێیداین.

## ئەم سێ نەخۆشیە لە دوو خاڵی سەرەکیەوە سەریان هەڵداوە:

١- نەناسینی حەق. ٢- ئاشکرا نەکردنی حەق.

بۆیە حاکمی وڵاتەکانمان شەوو ڕۆژ خەریکن خەڵکی لەم تەم و مژەدا پەروەردە کەن، تا ڕاستی نەناسن، تا چاوو گوێیان بە حەق و حەقخوازی نەکرێتەوە..

ئاشکرایە ئەگەر خەڵکی حەقیان نەناسیو لە ناحەقیان جوێ نەکردەوە، شوێنی ناکەون، بەم هۆیەشە، کە ئیتر بێ بایەخانە دەژین.. خاڵی (حەق نەناسین) لە خاڵی (ئاشکرا نەکردنی حەق) گرنگترو کاریگەرترە. چونکە تا جەوهەرو ڕواڵەتی حەق نەناسرێت، ووتنی حەق نایەتە دی. ئەگەر خێرو شەڕ بەتەواوی نەناسرێن ولێك جوێ نەکرێنەوە چۆن، چاوەڕوان دەکرێت حەق بووترێتو بناسرێتو بڵاوبێتەوە.. لەبەر ئەمەیە، کە تاغوتەکان سوورن لەسەر ئەوەی، کە خەڵکی هەر وا گێژو هێڕو کەڕو کوێرو بیر ئاڵۆز بمێننەوە، بۆیە دەبینیت ئیسلامەتی لای زۆر کەس وای لێهاتووە، بۆتە نیشانەی زەلیلیو مت بوونو بێ غیرەتی!

مامۆستا ابو الحسنی نەدەوی دەڵێ: گەورەترین ئەرکی ئیسلامی ئەمڕۆمان

نەوەیە، ئەم خەڵکە ڕەشوڕوتە زۆرەی میللەتی موسوڵمانان، لە ئیسلامێکی سەرزارەکیو ڕواڵەتییەوە، بگوێزرینەوە بۆ حەقیقەتی ئیسلام.. ئەمەش گرنگترینو چاکترین خزمەتە بە نەتەوەی ئیسلام دەکرێت[١].

## ئەرکی ئێمە

گەورەترین بەڵاو موسیبەت، کە توشی ئەم ئوممەتە موسوڵمانە بووە، ئەو دوریو تێنەگەیشتنەی موسوڵمانانە لە ئیسلامو دینداریتیەکەی، کۆسپی هەرە گەورەی ڕێمان،ئەو گەرەلاوژێ فیکریەیە، کە لە مێشکی ئەم ئوممەتە موسوڵمانەی ئەمڕۆدا دروست بووە، بە ڕاستی شەڕێکی سەختە.. بۆیە دەبێت داعیەکانی ئەمڕۆش، مەیدانی شەڕو هەموو سەنگەرەکان لێك هەڵاوێرنو بەرەکانی شەڕ ـ کە لەگەڵ کوفرە ـ چاك دیاری بکەن. جا لەو ڕێیەشدا زۆر سوار دەگلێن و، خەسارەتی زۆریشمان دەبێتو، ژمارەی قوربانیانمان هەر زیاد دەکات.. دەبێت داعیەکان چاك شارەزای ڕێبازی خۆو ڕێگای بزاڤی خۆیان بن.. دەبێت گورج بکەونە خۆ، تین و تەوژمیان کاریگەرتر کەن، ورەیان بەرزو متمانەیان بەو پەیمانەی بە خوای خاوەنیان داوە زیاتر کەن.. دەبێت زانستو کردەوەی چاكو دامەزراوو ڕەسەن، لەم ئیسلامەوە فێر بن.. ئینجا بکەونە وەخەبەر هێنانی خەڵکی، تا ئاگاداریان بکەنەوە، دەبێت هەوڵی زۆریان لەگەڵدا بدەن، بێ ئەوەی بێ تاقەت بن، بێ ئەوەی وەرس بینبێ ئەوەی ڕەشبین بن.. نابێت گوێ بدەنە ئەو هەموو سوارچاکە نازیزانەی لە ڕێدا دەگلێن.. دەبێت هەمیشە ئەوەیان لەبەر چاو بێت، کە ئامانجەکەیان زۆر گرنگو گەورەیە، بە هیچ شێوەیەك نابێت هێزی دوژمن ـ هەر چەند زۆرو بەهێزیش بێت ـ چاوترسێنیان بکات. نابێت هیچ کۆسپێکی ڕێ، بە گەورەو سەخت بزانن. نابێت هیچ نارەحەتیەك بە دژوار بزانن. دەبێت هەمیشە

---

[١] گۆڤاری المسلمون / ژمارە ٤ ل ٤٩ ساڵی ١٩٥٥.

ئەوەی لەبەر چاو بێت، کە مادام داعی ئیسلامن، یەعنی لە نـەوەی کەڵـەپیاوانی مێژوون و لەم ڕیش سپێتی زەمانەدا زیت بوونەتەوە.. داعی ئیسلامی، لە کاروانە پیرۆزەکەی پیاوانی بەدرو قادسیەو یەرموك و حەتەین، پاشماوەی نەوەی ئەو پیـاوە دلێرانەن، پاشەنگی سەربازانی بانگەوازە شـیرینەکەی پێغەمبـەری ئـازیزن (ﷺ)، کە هەتا ئێستاش سـالارو سەرقافڵەی جیهادن.. دەبێت داعی ئیسلامی لە واقیعدا بیسەلمێنێت، کە کام جێی پڕ دڕك ودالّ و دژوارییە، ئەم، بێ باکانە خۆی تێ داوێ، سڵ لە کەندو کۆسپ وهەڵدێر ناکاتەوە، دەسـت و گـەردن هەڵـدەبڕێت وبەرهـەمی سەرکەوتنی ئەم ئیسلامە لە واقیعدا دەڕنێت.

دەبێت داعیە ئیسـلامیەکان ئەوەیان چاك لەبەر چاو بێت، کە ئەمانە پیاوی خوان و پەیامی کۆتایی ئەویان هەڵگرتووە، جارێکی دی دەبێت دنیای پێ بەختـەوەر کەنـەوە، جارێکی دی خۆ بکەنەوە بە پێشەواو سەرکردەو ڕێنیشاندەری جیهانیان..

ئەی داعیانی ئیسلام! تاغوتەکان دەتوانن چیتان لێ بکەن؟!ئەو پـەڕی توانایـان ئەوەیە، لاشەتان بهێننە ژێر باری ئەشکەنجەو ئـازار، گۆشـت و ئێـسقانتان هـەنجن هەنجن کەن و خوێنتان برێژن، ئەما ڕۆحتان، ئەوانە بە هـیچ شـێوەیەك دەسـەڵاتیان بەسەریدا ناشکێت، ئێمەش هیوامان بەو ڕۆحە دلێرەیە، هیوامان وایە، کە هەموو هەست و نەست و ختورەیەکتان بۆ خوا تـەرخان بکـەن و بـەس.. خۆشەویـستی و بوغزو تکاو ترس و حەزتان هەر لە خواو هەر بۆ خوا بێت.. هـەر واش بـژین، تـا ئەو ساتەی گیانتان بە خوای گەورە دەسپێرنەوە. هیچ کەس و هیچ هێزێك توانـای نییە ئەجەلتان پێش، یان دوا بخات، بۆیە دەبێت بەم باوڕو قەناعـەت و بـەو وردەو متمانەو بەو ڕۆحە پاکەوە بە دیداری خوای پەروەردگارمان شادو بەختـەوەر بـین.. دەبێت داعی ئیسلامی لە هەموو کەس زۆرترو زووتر، هەسـت بـە زوڵـم و سـتەم بکات و ئازایانە دژی جاهیلییەتی سەردەم ڕاپەڕێت، هەر وەکـو، بـاب و بـاپیرانی دژی جاهیلییەتی کۆن ڕاپەڕین. پێویستە ئەو، پێش هەموو کەس شەق لـە ژیـانی ماددە هەڵداو لێی یاخی بێت، وەکو نەوەکانی یەکـەم، کـە لێـی یـاخی دەبـوون و

شـەقیان تـێ هەڵـدەداو لێـی یـاخی دەبـوون، دەبێـت هـەموو خۆشـگوزەرانیو ئاسودەییو بەختەوەریەکیان، بکەنە قوربـانی ڕێبـازە ئیـسلامیەکەیان. دەبـێ زوو بچنە ریزی کاروانی سەربازانی پێغەمبەری پێشەواوەو، خێرا خۆ بخەنە ژێر سـایەی ئاڵا بڵندەکەی خواویستی، ئەو ئاڵایەی خوای گەورە بۆی دیاری کـردوون وداوای لێ کردوون بچنە ژێر سایەیەوە. وەکو خۆی دەفەرموێ: (وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ هُـوَ اجْتَبَاكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِـن قَبْلُ وَفِي هَذَا لِيَكُونَ الرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ فَـأَقِيمُوا الـصَّلاَةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَاعْتَصِمُوا بِاللَّهِ هُوَ مَوْلاكُمْ فَنِعْمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرُ) ٢٢ الحج/ ٧٨ واتە: لە پێناوی خوادا بەوپەڕی جیددیو سەرڕاستیەوە جیهـاد بکـەن، خـوا ئێـوەی بـۆ پەیامەکەی خۆی هەڵبژاردووە، خوا هیچ جۆرە گرێ وگۆڵ ونارەحەتییەکی لە دیندا نەهێناوەتە ڕێتان، ئێوە لە ریزی میللەتی ئیبراهیمی باپیرەی خۆتـانن، کـە پێـشتر ناوی نان: موسوڵمان، بۆیە دەبێ پێغەمبەر (ﷺ) شاهێد بێت لەسـەرتانو ئێـوەش ببنە شاهێد لەسەر خەڵکی. نوێژەکان بکەن، زەکات بدەن، دەست بە ڕێبازی خواوە بگرن، چونکە تەنها ئەو سەرپەرشتیارتانە، ئەویش باشترین لایەنگرە.

هۆی سەرەکی سەرکەوتنی داعی، وەنەبێ زانایی ومتمانـەی ڕەوانبێـژی بێـت، بەڵکو پێش ئەم جۆرە سیفەتانە هۆیـەکی تـری زۆر کاریگـەر هەیـە، کـە ئـەویش باوەڕی ئەو داعیەیە بە بیروباوەڕەکەی خۆی، ئەوی ئـەم خەڵکـەی بـۆ بانگهێـشت دەکات، ئینجا ڕادەی هەستکردنی بەو دژواریانەی دێنە ڕێی بانگەوازەکەی، ئەگەر کەمتەرخەم بوو. دەبێ داعی بەبایەخ بێـت، خـەمخۆر بێـت، بەمـشور بێـت، لـەو مەترسیانە بە حەزەر بێت، کە ڕووەوڕوی بانگەوازەکـەی دەبنـەوە.. پاشـان دەبـێ داعی ئیسلامی واز لە هەرچی رابوردوی خۆی هەیە بهێنێت و، بە هەموو قەوارەو کیانیەوە بەرەو خوای گەورە هیجرەت کات. دەبێ کۆڵی دنیای سوك بێت، بارگـەی دنیای پێچراوە بێت و، واز لە هەموو شـتێکی دنیـایی بهێنێـت و، بـەرەو خـوای گەورە بکەوێتە ڕێ، خۆی بە تەواویو بێ دوو دڵی وبـێ چەندوچـوون، تەسـلیم بـە

خوای خاوەنی کات، بە شێوەیەکی وا کە، هیچ شتێك بۆ غەیری خوای میهرەبان نەهێڵێتەوە. هیجرەتیش لە بارو دۆخێکەوە دەبێت بۆ بارودۆخێکی تر، لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر، لە هەموو جۆرە پەیوەندیەکانەوە بۆ پەیوەستی خواویستی.. هەر کاتێك ئەو هیجرەتە دەرونیە بە تەواوی دروست بوو، ئەو کاتە ئەو موسوڵمانانە، کە خەڵکی دەدوێنێت، دەیانهەژێنێت و ئاشکراترین شوێنەوارو ناسەوار لە دڵ و دەرونیاندا جێ دەهێڵێت، کارێکی زۆر بەبەرهەم دەکاتە سەریان؛ کاردەکاتە سەر کیان و شەخسیەتیان، با کابرای داعی کەڕو لاڵیش بێت..

## قورئان ڕێبازە

قورئانی پیرۆز بەرنامەی ئەم بانگەوازەیە، ڕۆحیێتی، بوژێنەرەوەیەتی. قورئان ڕونکەرەوەو تەرجومانی ئەم بانگەوازەیە، قورئانە دەستورو بەرنامەو پێڕەوو پرۆگرامی ئەم بانگەوازە، کورتو موختەسەر: قورئان سەرچاوەی هەموو بیروهۆشو کارێکی داعیەکانە. بۆیە دەبێت بەرنامەو شێوازی بزاڤ و توێشوی ڕێیان هەر لە قورئانەوە وەربگرن: (وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ) ١٦ النحل/٨٩ واتە: قورئانمان کە بۆ تۆ ناردۆتە خوارەوە، ڕونکەرەوەو ڕێنیشاندەری هەموو شتێکەو، سۆزو بەزەییشە بۆ موسوڵمانان.

بابەت وباس وخواسی بانگەواز، لە چەندەها سورەت وئایەتی قورئانی پیرۆزدا هاتووە، کە گرنگی وگەورەیی وپلە بەرزی بانگەواز دەردەخەن.. دوژمنانی خوا ـ لە کۆن و نوێدا ـ دەیانزانی، کە ئەم قورئانە ورەو هێزو وزەیەکی وا لە دڵ و دەرونی شوێنکەوتووەکانیدا دروست دەکات، دەست بەجێ دەیانخاتە کار. ئەوسا هەموو هێزی دنیا ناتوانێت، نە کارەکەیان ڕاگرێت، نە بێ بەرهەمیشی بکات. چونکە لە ڕاستیدا دەستی قەدەری خوای میهرەبانو کردگاری ئەم گەردونەیە، کە بزاڤی موسوڵمانان دەگرێتە خۆو، لە بەرژەوەندی دنیاو دوایی موسوڵمانان بۆ خۆی هەڵدەسوڕێنێت.

ئا ئەم قورئانە بیرۆزەی ئەمڕۆ، وا شوێن کەوتوانی قـەدری نـازانن و، ئەوەنـدە دەزانن لە پشت سەری زەیستانەوە ـ بۆ مۆتەکـە دور خـستنەوە! ـ داینـێن، یـان ئەوەندەی لێ دەزانن، کـە ئایەتـەکانی بکەنـە نوشـتە، یـان ئـاوازی بـۆ دانـێن و موسابەقەی دەنگ خۆشی پێ بکەن، تا بزانن کام قورئان خوێن دەنگـی خۆشـترە..

ئا ئەم قورئانەی چەندین سەدەی پڕ مەکرو فێڵ و تەڵەکەبازی دوژمنانی ئیـسلامی بەسەردا هات وچوو، سەدان سەدەی نەزانین و نەناسینەوەی لە شوێنکەوتوانی دیت! سەدان بارودۆخی نالەباری موسوڵمانانی دیت، جۆرەها پەڵە هەوری چـڕو چـڵکنی، دید لێڵی موسوڵمانانی دیت و، ئاهی بۆ واقیعی تاڵی نەوەکانیان هەڵ کێشا!!

دوژمنانی خواویستی، نەوە دوای نەوە دادەنیشتن و لە نهێنیـەکانی ئـەم قورئانـە دەکۆڵینەوە.. قسەو باسی دورو درێژیان لەسەر دەکرد، دیراسـەیان دەکـرد، کـە ئـەو خاڵانە کامانان، کە ئاوا ورەو تین و وزەو هێز دەدەنە تاك و کۆمەڵی موسـوڵمانان، تا ئەو بزاڤە کاریگەرە نەپساوەیان لە گۆڕانکاری کۆمەڵەکانیاندا هەر بـەردەوام بێـت!! ئەوجا پیلانیان دادەنا، نەخشەی نەهێـشتن، یـان لاواز کردنـی ئـەو سەرچـاوەی وزەو ورەیان دادەڕشت، پیلانی ئەوەیان دادەنا، کە چۆن ئەو خاڵە قورئانیانە بشێوێنن، تـا ورەی موسـوڵمانان لاواز کـەن و لـە ڕوی دەرونیـەوە، ڕەشـبینیان کـەن و هێـزە مەعنەویەکەیان بێ ئەسەر بخەنـە لاوەو خۆشـیان بـڕوخێنن! کتـێبی لێکۆڵینـەوەیان دەنوسی، کە بە چ شێوازێك بتوانن واتاو مانای وشەکان بگۆڕن و چـی بکەنـەوە بـە مانایان! چ جۆرە دیدو بۆچوونێکی ساختەیان لێوە داهێنن، تا ئـەم دینـە لـەو هێـزە مەعنەویەیەوە بگۆڕن، لە هێزێکی کاریگەری بەردەوامەوە، کە ناهـەقی لـە ڕەگ و ریشاڵەوە هەڵدەکێـشێت و دەسـەڵاتی تاغوتـانی سـەر زەمـین دەڕمێنێـت و رایـان دەدات، تا حوکمی دادی خواویستی لەسـەر زەوی دامـەزرێنێت.. کۆڕیـان بـۆ ئـەوە دەگرت، کە چۆن و بەچی ئەم قورئانە لەم بەرنامەو ئامانجەوە بگـۆڕن، بـۆ بزاڤێکـی جـەدەلی بـەتاڵ! بـۆ کـۆڕی رۆشـنبیری ساردوسـڕ، بـۆ توێژینـەوەی ماندوکـەری کەلەپوریی، بـۆ بابـەتی تێکـچرژاوو ئـاڵۆزی تیـۆری مـردوو! یـان بـۆ موناقەشـەو دەمەوەری و شەڕە دەنوکی فیقهی خەیاڵی.. بۆ هەوا کێڵان و ئاو بێژانەوە!!!

ئەمڕۆ لە جیهاندا هەفتانە بەلایەنی کەمەوە، کتێبێك بە یەکێك لە زمانی بێگانان دەربارەی خاڵی وردو درشتی ئەم دینەو ئوممەتەو بزاڤەکەی دەنوسرێت و بڵاو دەکرێتەوە، دەربارەی سروشتی دینەکە، دەربارەی مێژوی بانگەوازی، دەربارەی سەرچاوەی هێزو شێوازی ئاراستەو پەروەردە کردنی، دەربارەی پلانی بەرهەڵستکاری بانگەوازەکەی و، شێوازی شێواندن و بەرپەرچدانەوەو چۆنیەتی گۆڕینی ڕێبازەکەی.. زۆربەشیان ـ بێ گومان ـ وا نانوسن، کە نییەتی پیس و نیازی گڵاو قین و بوغزیان دەرخات، چونکە دەزانن هێرش کردنە سەر ئیسلام ـ بە شێوەی زەق و ئاشکرا ـ خەڵکیان لێ دەهروژێنێت، ڕق و قینی میللەتانی موسوڵمانیان لێ هەڵ دەستێنێت، گیانی بەرهەڵستی و بەرگری و تۆڵەیان تێدا دەبوژێنێتەوەو، گەشە بە ڕۆحی جیهاد دەداتەوە لە بیرو ژیری ودڵ ودەرونیاندا، بۆیە دەبینیت زۆربەی ڕۆژئاواییەکان زۆر فێڵبازانە دەکەونە مەدح و سەناو پێدا هەڵگوتنی ئیسلام، باسی جوانی و بلیمەتی ئیسلام دەکەن! تا بە تەواوی هەست و غیرەت و حەماسەت و وردی موسوڵمانان سڕ دەکەن! لە لایەکی تریشەوە متمانەی خوێنەرو گوێ گرەکانیشیان بۆ خۆیان کێش دەکەن، پاشان ژەهریان بۆ دەکەنە ناو کاسەی باسەکانەوەو پێشکەشیانی دەکەن ودەڵێن: ئا ئەمەیە ئیسلام! ئینجا بە موسوڵمانان دەڵێن: ڕاستە دینەکەتان زۆر بەرزو بە قەدرو گرنگە، بەڵام پێویستە لە هەندێك لایەنیدا گۆڕانکاری تێدا بکرێت! لە هەندێ یاساو ڕێساو ئەحکامیدا، تا لەگەڵ شارستانێتی ئەمڕۆی مرۆڤایەتیدا بگونجێت. دەڵێن: دینەکەتان زۆر چاکە، بەڵام پێویستە هەر وەکو باوەڕو قەناعەتی شەخسی لە دڵ و دەرونی خاوەنیدا بمێنێتەوە!! دینەکەتان چاکە بەڵام... !!

ئای چەند بەرهەمی زڕ، کە تاڵ و کاڵی ئەم پلانە ژەهراویەمان بیست وبینی، ئەم بەیت و باڵۆرەمان لە هەزاران کەسی گێلی خۆمانەوە بیست، ئا ئەم زەقنەبوتە بوو، کە بە خوێنی ئەم نەوە موسوڵمانانەی دواییدا تەشەنەی کردو باوەڕیانی کرمۆڵ کرد، ئەوەتا قەناعەتی هەندێکی وا پواندووە، کە بە ناویش لە ڕیزی ئەهلی ئیسلامدا نەماون!

ئەم شەڕە دژوارەی دوژمنانی دین هەر بەردەوامە، چونکە دوژمنانی ئیسلام سورن لەسەر ئەوەی موسوڵمان لەم قورئانە دور خەنەوە، لە هەوڵێکی ماندوو نەناسانەدان، تا نەهێڵن خەڵکی لەم قورئانە حاڵی بێتەوە، نەبادا دینەکە سەر لە نوێ بێتەوە بوون! (وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لا تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ) ٤١ فُصلَت/ ٢٦ واتە: بێ باوەڕان وتیان گوێ لەم قورئانە مەگرن و گاڵە گاڵی تێدا بکەن. یەعنی مەهێڵن خەڵکی لێی تێ بگات!!

لە ڕاستیدا جاهیلییەتی مەکربازی نوێ، شەڕێکی سەخت و پڕ فێڵ و تەڵەکەبازی دژی ئەم قورئانە بەرپا کردووەو، بە هەموو شێوازێك هەوڵ دەدات ئەم قورئانە لە ڕێکخستنی ژیان دور بخاتەوە، چونکە جاهیلییەت زۆر چاك دەزانێت دروست بونی بزوتنەوەیەکی قورئانی لە دڵ و دەرونی خەڵکیدا، چ مەترسیەکی پێوەیە، چ کۆسپێکی دێنێتە ڕێ.. گلادستۆنی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا دەیوت: (تا ئەم قورئانە لە نێواندا مابێت، ئەوروپا ناتوانێت دەسەڵات بەسەر ڕۆژهەڵاتدا بگرێت و، ناشتوانێت دڵنیا لە هیچ شوێنێکدا بمێنێتەوە[1].

سەرەنجامی ڕاپەڕاندنی ئەم نەخشە گڵاوەیە، کە ئەم خەڵکە ئاوایان لێ هاتووە، تەنها ناوی ئیسلامیان پێوە ماوە! ئەوی قورئانیش دەخوێنێت لە دەزولەکانی دەنگی زیاتر، هیچی تری نابزوێنێت! زۆریشیان، یان بۆ ئاوازودەنگ خۆشی دەیخوێنن، یان وەك کاسبی! یان بۆ نوشتەو موشتە بە کاری دەهێنن! لە کاتێکدا کە پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بە توندی بەرهەڵستی ئەو کەسانەی کردووە، کە قورئان دەخوێنن، بەڵام گوێ نادەنە ئامۆژگاریەکانی! وەك دەفەرموێ: (ألا أُخْبِـرُكُمْ بِخَيرِ النَّاسِ وشَرِّ الناسِ؟ إنَّ خيرَ الناسِ رَجُلٌ عَمِلَ في سبيلِ اللهِ على ظَهْرِ فَرَسِهِ أو ظَهْرِ بَعِيرِهِ أو علَى قَدَمِهِ يأتيهِ المَوتُ. وإنَّ شَرَّ الناس رجلٌ يَقرأُ كِتابَ اللهِ لا يَرعَوي بِشيْءٍ مِنْهُ)[2] واتە: پێتان بڵێم چاکترین کەس و خراپترین کەس کێیە؟ چاکترین کەس ئەو کەسەیە، کە

[1] کتێبی: الاسلام على مفترق الطرق ل ٤١.

[2] ئیمامی نەسائی لە ابو سعید الخدریەوە گێڕاویتیەوە، بڕوانە کتێبی (السنن / باب الجهاد / ٨) هەروەها ئیمامی احمد گێڕاویتیەوە لە کتێبی (المسند ٤/٤٤ و ٥٨)

مردنی دەگاتێ و لە پێناوی خوادا لەکاردایە، جا لەسەر پشتی ئەسپی بێت، یان وشترەکەی، یان هەر پیادە بێت. خراپترین کەسیش ئەو کەسەیە، کە قورئان دەخوێنێت، بەڵام گوێ ناداتە هیچی! واتە هیچ تەعلیماتێکی جێبەجێ ناکات.

خوای گەورە، خۆی زامنی پارێزگاری کردنی قورئانی لە فەوتان و گۆڕین کردووە، وەك خۆی دەفەرموێ: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ) ١٥ الحِجر/٩ واتە: ئێمە خۆمان قورئانمان ناردۆتە خوارەوە، خۆشمان پارێزگاری ئەوین. ئەوەش هۆیەکی ترە، کە وای لە دوژمنانی خواو دوژمنانی ئەم دینە کردووە، هەموو هەوڵ و رەنجیان بخەنە گەڕ، بەو هەموو پیلان و فێڵ و فریوو دانەوە هەوڵی پەك خستن و شێواندنی سروشت و تەبیعەتی مرۆڤەکان دەدەن، نەبادا وەدەنگ بانگەوازەکەی خواوە بێن! بە هەموو هۆکارێك خەریکن خەڵکەکە لەو قورئانە دوور خەنەوە.. مامۆستا حسن الهضیبي دەڵێ: (مەگەر نابینی دوژمنانی ئیسلام چەند بێ خەم ودڵنیان لە بێ ئاگایی ونەزانی موسوڵمانان، چەند دڵنیان لەوەی، کە موسوڵمانان هەر چەند قورئانەکەشیان بخوێنن لێی حاڵی نابن. نابینی گاڵتە پێکردنیان گەیشتۆتە چ ڕادەیەك، کە ئایەتی قورئان بۆ موسوڵمانان لە ئیزگەکانی ئیسرائیل و لەندەن و پاریسەوە بۆ دەخوێننەوە؟!!)[1].

ئەم قورئانە کتێبی خوای گەورەیە، کتێبی ئەم بانگەوازەیە. قورئان نورە، ڕۆحە، هەر بەوەندەی بگاتە دڵێکی مردوو زیندوی دەکاتەوە، بەر هەر دڵ و دەرونێکی غافڵ بکەوێت، دەستبەجێ ڕای دەپەڕێنێت و بە ئاگای دەهێنێتەوە.. جا ئەگەر ئەم ملیۆنەها کەسەی لافی ئیسلامەتی لێ دەدەن و خۆیان بە موسوڵمان دەزانن، مانای ژیانی ناو قورئانیان بزانیایە، ئەو ژینەی، کە قورئان بۆ شوێن کەوتوانی ڕون دەکاتەوەو هەمویانی لەسەر پەروەردە دەکات، ئەو کاتە بارودۆخ و ئەحواڵیان ئا بەو شێوەیە نەدەمایەوە، کە ئێستا تێیدان.. ئاوا لاوازو زەلیل و بێ دەسەڵات و نەبو نەدەبون..

---

[1] گۆڤاری المسلمون/ ساڵی ١٩٥٥ ژمارە ٧ ل٤٢

پێویستە لەسەر داعیەکان زۆر لەبەر دەم ئەم ڕاستیەدا بۆ سەرنجدان بوەستن، هەر وەکو، کە پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر دەمیدا دەوەستا. دەبێت داعیەکانی ئەمڕۆش هەر لە خاڵی یەکەمەوە دەست پێ بکەنەوە. چونکە هێنانەوەی دین و جێبەجێ کردن و راپەڕاندنی - چ ئەمڕۆ چ سبەی - هەر لەسەر ئەو خاڵە دادەمەزرێتەوە کە: دەبێت خەڵکی سەر لە نوێ لە جاهیلییەتەوە دەربهێنرێنەوە.. لە سفرەوە بخرێنەوە ناو ئەم دینە. ئەمەشە خاڵی سەرەکی سەرەتا. دوای ئەم قۆناغەش، ئیتر شتێکی سروشتی و چاوەڕوان کراوە، کە تاقی کردنەوە دەست پێ دەکات.. قۆناغی نارەحەتی و بەڵاو موسیبەت.. قۆناغی ئەشکەنجەو ناسۆرو ژان.. قۆناغی راکەو راکەو خۆشاردنەوەو هەڵاتن.. ئینجا هەندێ کەس - سەرەنجامی ناسۆرەکانی رێ - لە دینەکە پاشگەز دەبنەوە.. هەندێکیش خۆ دەگرن سڵ لە مەترسی ناکەنەوە، لەسەر ڕێبازی ئیسلامەتی خۆیان هەر دەمێننەوە، پاشگەز نابنەوەو ناگەڕێنەوە ناو زەلکاوەکەی جاهیلییەت.. چونکە گەڕانەوەیان بۆ ناو جاهیلییەت پێ ناخۆشە، بە قەدەرئەوەی فڕێیان دەنە ناو ئاگرەوە.. ئیماندارەکان هەر بەردەوام دەبن وسور دەبن لەسەر هەڵوێست و پەیمانەکەیان - کە بە خوای خاوەنی خۆیان داوە - هەر دەبەنە سەر. دەمێننەوەو تا کۆتایی تەمەن ئارام دەگرن، تا بە شاهیدی وشەهیدی سەر دەنێنەوە..

ئیتر ئەم ململانێ ودەبەرێك راچوونەی ئەهلی جاهیلییەت وئەهلی ئیسلام بەردەوام دەبێت، تا خوای گەورە داوەری نێوانیان دەکات و دەسەڵاتداری حوکمڕانی دەداتە دەست پیاوچاکان و، پێشڕەوانی خواویستی دێنێتە سەر کار، هەر وەکو کە لە ناو نەوەی جیاوازو لە زەمانە جیاوازەکانی مێژودا ئەو دەسەڵاتەی دەدایە دەست موسوڵمانانی پێشوو.. ئیدی جارێکی تر سیستمی ئیسلامی وسایەی دادی خواویستی لەسەر پارچە خاکێکی خوا، باڵی هێمنی وسۆزو رەحمەتی بەسەر خەڵکیدا دەکێشێتەوە

جاهیلییەتی ئەمڕۆ - لە ناوەڕۆکیدا - هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ جاهیلییەتی کۆندا نییە.. ئەوەی وەکو جیاوازیش جار جارە دەردەکەوێت، تەنها لە ڕواڵەتدایەو

بەس. بۆیە بەڕاستی پێویستە موسوڵمانانی ئەمڕۆ زۆر هۆشیارانە بانگەوازەکەیان بڵاوکەنەوە، تا ڕاستی دینەکەیان وەکو خۆی بخەنەوە پێش چاو.. دەبێت شۆڕشێکی ئیسلامی بەرپا کرێتەوە، شۆڕشێك بێت تەنها لە پێناوی خوای گەورەدا بکرێ، بۆ چەسپاندنی دادی خواویستی و حەق و حەقخوازی.. شۆڕشی موسوڵمانان کاری هەڕەمەکی و بێ سەرو بەر نییە. بەڵکو بزاڤێکی ڕێنیشاندانی هۆشیارانەی بەرپرسییە. چونکە خوای خاوەن هەر زەمانێك، کە پێغەمبەرو پەیامی خۆی بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی نارد بێت، بەو هیوایە ناردونی، کە پێغەمبەران و پیاوچاکان بە پێی تەعلیماتی ئەو بزاڤی ئیسلامی دابمەزرێنن. بە ئاراستەی خوای گەورە کار کەن. وەك دەفەرموێ: (ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الاَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ) ٤٥ الجاثية/ ١٨ واتەپاشان تۆمان خستە سەر ڕاو ڕێبازی شەریعەتێك، دە تۆش شوێنی کەوەو شوێن هەواوهەوەسی ئەو کەسانە مەکەوە، کە نازانن.

خوای گەورە یاساو ڕێسای خەبات و تێکۆشانی لە پێناوی خۆیدا بۆ دیاری کردوین. کەوا بوو هەر دەبێت بانگەوازێکی نوێ بێتە مەیدانەوە، بانگەوازێك، کە شارەزای ڕێگاکە بێتو دوژمن بناسێتو ئاشکرایانە ئاڵای خواویستی هەڵکاتو، سور بێت لەسەر ڕێبازو ئامانج، تا دەگاتە کۆتا مەبەست..

هەڵگرانی مەشخەڵی خواویستی، هەر دەبێت بێنەوە پێشەوەو بەیداخی ئەم دینە خواییە هەڵگرنەوەو، بکەونەوە شوێن پەیامی خواویستی. دەبێت هەنگاو بە هەنگاو، هێمن و دڵنیا پێ هەڵگرن و بەو ڕێیەدا بڕۆن، کە قورئانەکەی خوای زاناو کار بەجێ دیاری کردووە. دەبێت دەرس وپەندو ئامۆژگاریشیان لەو کەڵەپیاوانەوە وەرگرنەوە، کە بونەتە سەر قافڵەی کاروانی خواویستی لە پێغەمبەران و یاوەرانیان..

بەس. بۆیە بەڕاستی پێویستە موسوڵمانانی ئەمڕۆ زۆر هۆشیارانە بانگەوازەکەیان بڵاوکەنەوە، تا ڕاستی دینەکەیان وەکو خۆی بخەنەوە پێش چاو.. دەبێت شۆڕشێکی ئیسلامی بەرپا کرێتەوە، شۆڕشێك بێت تەنها لە پێناوی خوای گەورەدا بکرێ، بۆ چەسپاندنی دادی خواویستی و حەق و حەقخوازی.. شۆڕشی موسوڵمانان کاری هەرەمەکی و بێ سەرو بەر نییە. بەڵکو بزاڤێکی ڕێنیشاندانی هۆشیارانەی بەرپرسییە. چونکە خوای خاوەن هەر زەمانێك، کە پێغەمبەرو پەیامی خۆی بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی نارد بێت، بەو هیوایە ناردونی، کە پێغەمبەران و پیاوچاکان بە پێی تەعلیماتی ئەو بزاڤی ئیسلامی دامەزرێنن. بە ئاراستەی خوای گەورە کار کەن. وەك دەفەرموێ: (ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الامْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاء الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ) ٤٥ الجاثية/ ١٨ واتەپاشان تۆمان خستە سەر ڕاو ڕێبازی شەریعەتێك، دە تۆش شوێنی کەوەو شوێن هەواوهەوەسی ئەو کەسانە مەکەوە، کە نازانن.

خوای گەورە یاساو ڕێسای خەبات و تێکۆشانی لە پێناوی خۆیدا بۆ دیاری کردوین. کەوا بوو هەر دەبێت بانگەوازێکی نوێ بێتە مەیدانەوە، بانگەوازێك، کە شارەزای ڕێگاکە بێتو دوژمن بناسێتو ئاشکرایانە ئاڵای خواویستی هەڵکاتو، سور بێت لەسەر ڕێبازو نامانج، تا دەگاتە کۆتا مەبەست..

هەڵگرانی مەشخەڵی خواویستی، هەر دەبێت بێنەوە پێشەوەو بەیداخی ئەم دینە خواییە هەڵگرنەوەو، بکەونەوە شوێن پەیامی خواویستی. دەبێت هەنگاو بە هەنگاو، هێمن و دڵنیا پێ هەڵگرن و بەو ڕێیەدا بڕۆن، کە قورئانەکەی خوای زاناو کار بەجێ دیاری کردووە. دەبێت دەرس وپەندو ئامۆژگاریشیان لەو کەڵەپیاوانەوە وەرگرنەوە، کە بونەتە سەر قافڵەی کاروانی خواویستی لە پێغەمبەران و یاوەرانیان..

# بەندی یەکەم: دین و ژین

## کێ بەرنامە دیاری دەکات؟

دەبێ ئەو کەسەی بەرنامە گەشتی ڕێیەك دیاری دیاری دەکا، هەر ئەو کەسە بێت، کە شارەزای هەموو ڕێگاکەیە. مادام مرۆڤیش ـ بەپێی سروشتی خۆی ـ ڕێگای هەموو ژیان شارەزانی یەو لێی شاراوەیە، تەنانەت نزیکترین ساتی داهاتوشی لەبەر چاو نیەو چەندین بەربەستی لەڕێدایە. کەوا بوو مرۆڤ بەهیچ شێوەیەك ناتوانێ بەرنامەیەك بۆ گەشتی ڕێگایەك دیاری بکات، کەخۆی هیچ شتێك دەربارەی ئەو ڕێگایە نازانێت. بۆیە دەڵێین: یان دەبێ مرۆڤایەتی بکەوێتە گومڕایی وسەرگەردانی ولارو وێڕیەوە، یان دەبێ بگەڕێتەوە سەر ڕێبازەکەی خوای گەورە. ئەو ڕێبازەی، کە لە خوای کردگاری مرۆڤ وبونەوەرەوە وەردەگیرێت. کەوا بوو، هیچ کەس جگە لە خوای گەورە، مافی ئەوەی نیە یاساو ڕێسا جگە لە شەریعەتەکەی خوا دابڕێژێ.. ئەم مافە تەنها خوای گەورە هەیەتی. چونکە هەر ئەو کردگارو داهێنەرو هەڵسوڕێنەری ئەم گەردونەیە. تەنها ئەویش کارگێڕی هەموو بەش و لایەن و موفرەداتەتی. هەموشیان لەسەر ئەو سیستەم و ڕێسایەن، کە بۆی دیاری کردون، چونکە هەر دروستکراوێك، کە سیستمێکی بون و مان و تەفاعولی خۆی هەیە، لەگەڵ ڕێسا خۆییەکەیدا لازم و مەلزومی یەکن. مرۆڤ و بەرنامەکەی خواش، کەوەکو کەتەلۆکی مرۆڤایەتی وایە، هەم پێکەوە دەسازێن، هەم تەفاعولی هەردوکیان لەگەڵ بزاڤ وسیستمی ژیانیشدا دەگونجێن.. بۆیە دەبێت هەموو لایەنێکی ژیانی مرۆڤ، دەبێ بەگوێرەی سیستم وڕێساو یاسایەك ڕێك بخرێت، کە لەگەڵ یاساو ڕێسا گەردونیەکانیشدا بسازێن. ئەمە کەسێك دەتوانێ ڕێکی خات، کە سروشتی هەردووکیان (مرۆڤ و گەردون) ی لەبەر چاو بێت.. گومانیش لەوەدا نیە، کە هەرچی غەیری خوایە، کەم وکورتە وپەی بەو هەموو

زانیاریە بەرفراوانە نابات. هەر لەبەر ئەوەشە نابێت یاسادانان ورێباز دیاری کردن بۆ مرۆڤ بدریتە دەست خۆی، چونکە ئەویش کەم وکورتە. گەر چی ئەمە ڕاستیەکی ڕونو ئاشکرایەو بەڵگەنەویستە، کەچی زۆر کەس هەن باوەڕی پێ ناکەن، یان هەر خەریکی موناقەشە کردنین. هەندێکیان ئەوەندە چاونەترسن دەڕۆنو یاساو ڕێسای غەیری شەریعەتەکەی خوای گەورە دەهێنن، یان هەر خۆیان دەری دەکەن وخەڵکی ناچاری ڕاپەراندنیان دەکەن! لەڕاستیدا ئەمانە، یان خۆیان لە خوای گەورە زاناترو لێهاتوتر دەبینن، یان خۆیان بەشەریکی خوای گەورە دادەنێن. بۆیە یاسای وا دژبە ڕێبازی خوا دادەڕێژنبەراستی ئەم جۆرە کەسانە زۆر چاو قایمن. خوای گەورە دەفەرموێ: (أَمْ لَهُمْ شُرَكَاء شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ) ٤٢ الشوری/ ٢١ واتە: یان شەریکیان هەیە، کە بۆ خوایان دایاناون، کە یاساو ڕێسای وایان بۆ دادەڕێژن، کە خوای گەورە مۆڵەتی پێ نادات.

خوای پەروەردگار بەپێی زانیاری خۆی، بەرنامەیەکی وای بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دیاری کردووە، کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤ خۆیدا دەگونجێت، کە مرۆڤایەتی دەتوانێ بەو بەرنامەیە بگاتە کۆتا پلەی هاوکاری وهاریکاری نێوان گەلان و تاکەکانیان. هەروەها هەموو چالاکی وجم وجوڵی کۆمەڵگەکەش لەگەڵ هێزە سەرەکیەکانی گەردوندا دەسازێت. خوای گەورە ڕێسای سەرەکی گشتی بۆ ئەم هاوکارییانە دارشتووە، بەڵام مافی دیاری کردن ودارشتنی یاسا لقیە بچوکەکانی ڕۆژانەی داوەتەوە دەست مرۆڤ خۆیان. ئەگەر لە ناوخۆیاندا لەسەر کێشەیەکیش، یان هەڵوێستێك جیاوازیان تێ کەوت، دەبێت زو بیگەڕێنێنەوە بۆ خوای گەورە. واتە بۆ ڕێسا سەرەکیە گشتیەکانی ئەو بەرنامەیەی، کە بۆژیانی خەڵکی دیاری کردووە، ئەو ڕێسا سەرەکیانەش وەك تەرازون، دەبێت مرۆڤ هەموو یاساو بەرنامەو شێوازی کارو ڕاپەراندنیان بەو بکێشن.. بەم شێوەیە بریار دەدرێت، کە تەنها خوای گەورە حاکمەو هەر ئەویش چاکترین فەرمانڕەوایە.. هەموو شێوەیەکی تری غەیری ئەم شێوەیە، لەخوا یاخی بونەو دەرچونە لە

شەریعەتی خوا، لادانە لە دینی خوا.. لەبەر ئەم هۆیەیە، کە دەبێت فەرمان بەچاکەی هەرە سەرەکی بکرێت، کە بریتی یە لە دان نان بە دەسەلات و حوکمی خوا. هەروەها دانان بەودا، کە دەبێت حوکم تەنها بەبەرنامەکەی خوا بکرێت وبەس. هەروەها دەبێت بەرهەڵستی لە خراپەی هەرە سەرەکی بکرێت، کە بریتیە لە وازهێنان لە خوایەتی خوای گەورە. واتە ڕەفزکردنی حوکمی بەرنامەکەی خوای گەورە. ئەوجا ئەگەر ئەم بناغەیە دارێژرا، دەکرێت کۆشکەکەشی لەسەر بنیات بنرێت، جا کەوابو با هەموو ڕەنج و هەوڵ و تێکۆشانە پەرتەوازەو لێك بڵاوەکان کۆبکرێنەوەو هەموی لەبەردیەکدا بخرێنە گەڕ، تا بتوانرێت زوتر ئەو تاکە بناغەیە دارێژرێت، کە لەسەر ئەو نەبێت، کۆشکەکەمان بنیات نانرێت. جاری وا هەیە پیاو بەزدیی بەو موسوڵمانە دڵپاك وسەررشاستانەدا دێتەوە، کە هەموو ڕەنجێکیان دەخەنە گەڕ لە فەرمان کردن بەچاکەیەکی بچکۆلەدا، یان لەبەر هەڵستی کردن لەخراپەیەکی بچکۆلەدا، کە لقێکە لە چاکەی یان خراپەی هەرە سەرەکی. لەکاتێکدا، کە هێشتا ئەو بناغە سەرەکیە نیە، کە ژیانی کۆمەڵگاکەی لەسەر دادەمەزرێت، کە سەرچاوەی هەموفەرمان کردنێکە بەچاکەو هەموو بەرهەڵست کردنێکە لەخراپە..

نرخی ئەو ڕەنج و هەوڵدانە چیە، کە هەرتۆ بۆ نمونە بەرهەڵستی خەڵکی بکەی لەحەرام خواردن، لە کاتێکدا، کە هەموو لایەنی ئابوری کۆمەڵگاکە لەسەر سوو (ربا) ڕاوەستاوە؟ کە هەمو پارەی کابرای پێ حەرام دەبێت وکەس پارویەکی حەڵاڵی دەست ناکەوێت؟ چونکە سیستمی کۆمەڵایەتی وئابوری ئەو کۆمەڵگایە لەسەر بناغەی شەریعەتی خوا دانەمەزراوە. چونکە هەر لە سەرەتاوە واز لەخوایەتی خوای گەورە هێنراوە بەوەی، کە واز لە شەریعەتی خوا هێنراوەو نەیان هێشتووە ئەو بکرێتە بەرنامەی ژیان.

## بنەمای فیکریی مانای دین

ئەو دینەی، کە خوای گەورە دەیەوێت و تەنها بەو ڕازیە و سنوری بۆ دیاری کردووە، بریتی نیە لە هەر جۆرێك لە (باوەڕ کردن بەخوا) بەڵکو بریتیە لە یەك شێوە لە شێوە، جۆربەجۆرەکانی باوەڕهێنان بەخوا.. ئەو شێوەش بریتیە لە یەکخواناسیەکی پاك وڕاست وبنبڕ.. بریتی یە لە پەرستنی خوای گەوردو بەس. بەوەی هەمو مرۆڤ ڕوبکەنە ئەو. وەکو کە هەمو مەخلوقاتی تر ڕویان لەوە.. بەوەی کە دان بنرێت بەوددا، کە تەنها خوای گەورە ددسەڵاتی بەسەر مرۆڤایەتیو بەسەر هەمو گەردوندا هەیە.. بەوە کە هیچ شتێك بێ خوا نابێت وناکرێت. هەمو دروست کراوان هی خوان وبۆ خوان و، دەبێت ڕوشیان هەر لە خوا بێت. دەبێت ئەو دینەی خواشی پێ دەپەرستن، هەر ئەوە بێت، کە ئەو دەیەوێت، کە ئیسلامەو بەس. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: **(إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الإِسْلَامُ) ٣ ال عمران/ ١٩** واتە: ئەو دینەی کە لای خوا پەسەندە ئیسلامەو بەس.. ئیسلام دینە. ئیسلام بریتیە لە خۆتەسلیم کردن بە ددسەڵاتی بەرفراوانی خواو، وەرگرتنی تەعلیماتی ئەو لەهەموو کاروبارێکی ژیاندا. هەروەها گەڕانەوە سەر قورئان لە هەموو داوەریەکدا. چونکە قورئان سەرچاوەی تەعلیماتی خوای گەوردیە. ئیسلامەتی لاف وگەزاف لێدان نیە، ئاڵاو پەرچەمێکی سەوز نیە هەڵکرێت.. قسەیەکی سەر زارەکی نیەو بەسەر زماندا بێت وبڕوات. تەنانەت ئەو بیروهۆشە ناسکەش نیە، کە لە کونجێکی ماتو بێ دەنگدایەو خەڵود ددکێشێت، تا دڵی پێ خۆش کرێت. چونکە بەو شێوازانەی خواپەرستی، کە بە تەنها ئەنجام ددرێن ناوترێت هەموو ئیسلام، وەکو نوێژو ڕۆژوحەج و.. هتد. نا.. ئیسلام زۆر لەوانە بەر فراوانترە. ئەمانە بە جیاو تەنها ئەو ئیسلامە نین، ئەگەر لەخەڵکیدا نەهاتە دی، خوا نەیەوێن. نەخێر. کورتو موختەسەر ئیسلام یەعنی: خۆبەددستەوەدان، خۆ تەسلیم کردن.. ئیسلام بریتییە

لە: مل کەچی وگوێڕایەڵی.. ئیسلام یەعنی: قبولّ کردنی خوای گەورە بە حاکم وداوەر لە هەموو کاروبارێکی مرۆڤدا، ئایەتی: (كَذَلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ) ١٢ یوسف/ ٧٦: واتەئا بەو شێوەیە تەگبیرمان بۆ یوسف کرد، چونکە بە پێی دەستوری پاشای میسر نەیدەتوانی براکەی بهێنێتە لای خۆی. ئەم دەقە قورئانیە زۆر بەڕونی مانای وشەی دین دیاری دەکات. دین لەم دەقەدا، واتە سیستم ودەستورو یاسای حکومەتی. چونکە خوای گەورە، کە باسی سیستمی ژیان ودەستورو یاسا دەکات، بە (دین) باسی دەکات.

ئا ئەم مانا قورئانیە ڕون وئاشکرایە، ئەمڕۆ لە هەمو خەلکی جاهیلییەتی سەردەم شاراوەیە، چ ئەو خەلکەی خۆیان بە موسولّمان دەزانن، چ خەلکە جاهیلییەکە! دین بە لای ئەم خەلکەوە بریتیە لە: باوەڕکردن و بەجێهێنانی دروشمە ئیسلامیەکان. ئەو خەلکە نەزانە، وا دەزانن هەر کەس، کە باوەڕی بە تەنهایی خوای گەورەو کتێبە ئاسمانیەکان و نێرراوانی خواو ڕۆژی دوایی وخێرو شەڕی قەزاو قەدەر هێناو نوێژە فەرزەکانی کرد، ئەوە ئیتر موسولّمانەو لەدینی خوادایە، با لە حاکمێتی ویاساو ڕێسا دارشتنیشدا ملکەچ وگوێڕایەڵی غەیری خوای گەورەش بێت![1]

لە کاتێکدا کە دەقەکەی قورئان بە روون وئاشکرایی (دین الملك)بە سیستم و دەستورو یاسای حکومەت دەردەبڕێت.. ووشەی دین وەك زاراوە لە مێشك و دیدی ئەم جەماوەرە جاهیلییەدا وا لاوازو سووك بووە کە وا دەزانن دین واتە: باوەڕو بەجێ هێنانی فەرزەکانی پەرستن وبەس. بەڵام (دین) بە درێژایی مێژوو مانای وا لاوازو کرچ و کاڵی نەبەخشیوە.. مانای (دین) هەر لە زەمانی سەیدنا ئادەمەوە تا سەیدنا نوح وتا زەمانی پێغەمبەر سەلامی خوا لە هەموویان بێ بریتی بووە لە

[1] ئەگەر سەییدی رەحمەتی بیزانیایە، کە لە کوردەواری ئێمەدا نوێژو ڕۆژوو ئیسلامەتیشی نییەو، بەلکو زۆر دژ بە ئیسلامیشە، کەچی لە سایەی سەری مەلای نارەسەنەوە هەر بە موسولّمان حسێبەو، تەنانەت بە فەقێ و مەلاشی ناو دەبەن. لەسەر ئیسلامیش حسێبە! چونکە مەلا دوازدە عیلمەکانمان دەلّێن: باوکی موسولّمان بووە!!

ملکەچی وگوێڕایەڵی خوای گەورە. بریتی بووە لە ڕەتکردنەوەو وەرنەگرتنی هەر یاسا و دەستورێك کە لەلایەن غەیری خواوە داڕێژرا بێت. هەروەها بریتی بووە لە پەرستنی خوای گەورە لەسەر زەمیندا. هەر وەکو کە تەنها ئەو لە ئاسمانەکاندا دەپەرسترێت. واتە وەك چۆن خوای گەورە خوای ئاسمانەکانە، ئاواش خوای سەر زەمینەو دەبێ تەنها تەعلیماتی ئەویش لەسەر زەمیندا حوکمڕانی بکات.. دین بریتی بووە لە خوایەتی خوای گەورە. واتە: پەرستنی. بەڕاپەڕاندن وبە گەڕخستنی حوکم وشەریعەتەکەی ئەوو دانان بە دەسەڵاتداری ئەوو بەس. هەمیشە دووڕێیانی ڕێگاکان وابووە کێ لە (دینی خوا) دایە وکێ لە (دینی پاشا) دایە؟ ئەوانەی کە لە دینی خوادان، تەنها بە سیستم و بەرنامەو شەریعەتی ئەو رازین وهەر ئەویش جێبەجێ دەکەن. ئەوانیش کە لە(دینی پاشا) دان بە سیستم ویاسا وحوکمی ئەو رازین وهەر ئەویش جێبەجێ دەکەن. واتە بە زاراوەی قورئانی ئەمان بە شیرك رازین وسیستمی موشریکانیان دەوێت، بەوەی کە لەگەڵ باوەڕ بەخوا هێنان و ئەنجامدانی دروشمەکانی پەرستندا غەیری خواش دەپەرستن چونکە بە سیستم و شەریعەتی غەیری خوا رازین و وەری دەگرن و ڕایدەپەڕێنن.. ئەمەش خاڵێکی سەرەکی دینەو دوو ڕێیانی باوەر و بەڵگەنەویستی عەقیدەی ئیسلامیە..

## دینی خوا یان دینی خۆ

هەندێك لە دڵ نەرم وبەبەزەییەکانی ئەمڕۆ، عوزر بۆ ئەو خەڵکە دەهێننەوە، کە بێ دینیشەو هەر بە موسوڵمان دەدرێتەقەڵەم! دەڵێن ئەو خەڵکە ئیسلامیان ئاوا وەرنەگرتووەو، هەوڵ نادەن شەرعی خوا (بەو سیفەتەی کە بەرنامەی دین و ژینە) بچەسپێنن، چونکە نازانن دین واتە چی؟! بۆیە دەبێت ئەگەر جاهیلی موشریکیش بن، عوزریان هەر قبوڵ بکرێت!

من تێ ناگەم ئەم خەڵکە، کە لە دینەکە تێ نەگەیشتوون، چۆن لە سەرەتاوە خراونەتە بازنەی دینەکەوە؟! مەگەر باوەڕ کردن بەڕاستی هەر شتێك، لقێك نییە

لە زانین و ناسینی ئەو شتە؟! جا کە خەڵکی حەقیقەتی ئەو عەقیدەیان نەزانی، چۆن پێیان دەوترێت شوێنکەوتو وهەڵگرانی ئەو عەقیدەیە؟ ئەگەر نەیانزانی خاڵی سەرەکی باوەڕ چییە، چۆن دێنە ڕیزی شوێن کەوتوودکانیەوە؟ کە نازانن ئیسلام چی یە، چۆن بە موسوڵمان دەژمێرێن؟ چۆن خراونەتە بازنەی ئیسلام و ڕیزی موسوڵمانانەوە؟!

ڕەنگە ئەم نەزانینەیانببێتە مایەی لێ بوردنیان لە ڕۆژی دواییدا، یان ببێتە هۆکارێك بۆ کەم کردنەوەی ئازارو ژان لەسەریان. ڕەنگە لێپرسراوێتیان بکەوێتە سەر شانی ئەو کەسانەی، کە شارەزای دینەکە بون و ئەمانیان فێر نەکردووەو ڕاستی ئیسلامەتیان بۆ ڕون نەکردونەتەوە، بەڵام ئەمە مەسەلەیەکی داهاتوی نادیارەو، خوای گەورە خۆی دەزانێ لە ڕۆژی قیامەتدا، چ حوکمێکیان دەبێتو موناقەشەو دەمەوەری و شەڕەقسە لەسەر ئەوەی پاداشت، یان سزای ئەهلی جاهیلییەت لە ڕۆژی دواییدا چیەو چۆنەو چەندە، سودێکی بۆ ئێستای ئێمە نیە. ئەوە جێ بایەخی ئێستای ئێمە نیە. چونکە پەیوەندی بە ئێمەوە نیە، بەتایبەتی، کە ئێمە خەریکین ودەمانەوێت خەڵکی بۆ ئیسلامەتی بانگ بکەین. ئەوەی جێی بایەخی ئێمەیە ئەوەیە، کە ڕاستی دینەکە بخەینەوە پێش چاوی خەڵکەکەو بۆیان بسەلمێنین، کە ئەوان بە هیچ شێوەیەك لە دینی خوادا نین! چونکە دینی خوا بە پێی دەقی ئاشکرای قورئان، واتە سیستم و شەریعەتی خوا.. جا هەر کەس لە سیستمو شەریعەتی خوادا بوو، ئەوە لە (دینی خوا) دایە. هەر کەسیش لە سیستمو شەریعەتی حکومەت بێت، ئەوە لە (دینی پاشا)و دینی حکومەتدایە.. ئەوە ڕاستییەکەو دەمەوەری ناوێ..

ئەو کەسانەی، کە نازانن (دین) چیەومانای چیە، مومکین نیە خاوەن باوەڕ بن پێی. چونکە نەزانین لێرەدا، نەزانینی خاڵی سەرەکی و بناغەی دینە، کە بە گوێرەی عەقڵ و بە گوێرەی واقع، هەر کەس نەیزانێ بە باوەڕدار پێی ناژمێررێت. چونکە باوەڕ لقێکە لە دەرك کردن وزانیین. ئەمیش بەڵگەنەویستە. چاکتر لەوەی

بەرگری لەو خەڵکە بکەین، کە لە (دینی خوا) دا نین و عوزریان بۆ بهێنینەوەو لـە خوای گەورە بە بەزەییتر بین بەرامبەریان! کە خۆی ماناو سـنوری دینەکـەیخۆی بـۆ دیاری کردوون. چاکتر لەوە، ئەوەیە بکەوینەوە ناساندنەوەی ڕاستی مانـای (دیـنی خوا) بەو خەڵکە، تا سەرلە نوێ بێنـەوە نـاوی، یـان ڕەددی کەنـەوە.. ئەمـە بـۆ ئێمەش وبۆ ئەوانیش باشترە. بۆ ئێمە باشترە، چونکە لە خەتای گومڕایی ئەو دیـن نەناسـانە قوتـار دەبـین. بـۆ ئـەوانیش باشـترە، چـونکە ڕوبەڕوبونـەوەیان بـەو حەقیقەتەی، کە تێیدان، ئەوەی، کە ئەوان لە دینی حوکومەتو پارتو کۆمەڵـەی تر دان، نەك دینی خوا. لەوانەیە ئەو قسە ڕەقەمان وا بەتونـدی بیـان هـەژێنێتو یەکسەر لە جاهیلیەتەوە بێن بەرەو ئیسلام. لە دینی پاشا دەرچن وخـۆ بگەیەننـە دینی خواو پێغەمبەران ونێرراوانی خوا ـ سەلامی خوایان لێ بێت ـ کەوابو دەبێت هەڵوێستی داعیە ئیسلامیەکان بەرامبەر خەڵکی جاهیلیەت لە هەرجێ ولـە هـەر کاتێکدا بوون، هەر دەبێت وا بێـت. دەبێـت ئـەوە ڕون کەنـەوە بـۆ خـەڵکی، کـە حەتمەن مادام موسوڵمانن، دەبێ دینی ئیـسلام وشـەرعی خوالـە نێـو خـەڵکی دا ڕاپەڕێنرێت، نەك هەواوهەوەسی مرۆڤ. ئیسلام دەیەوێت هەڵوێستی خەڵکی بۆ ڕون بێتەوە. یان وەرگرتن وڕاپەراندنی شەریعەتەکەی خـوا، یـان وەرگـرتن وڕاپەڕانـدنی هەواوهەوەسی نەزان ونەفامان: (أَهْوَاء الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ) هەڵوێستێکی تر، جگە لەم دوانە نیە. هەروەها ڕێی مام ناوەندی لە نێوان شەریعەتی پاك وڕاست لە لایەك و، هەواوهەوەسی چەوت ولار، لە لایەکی ترەوە، نیە.. ئەوی شەریعەتە پاك وڕاست و ڕەواکـەی خـوا واز لێ دەهێنێـت، دەیـەوێت بـە هەواوهـەوەس حـوکم بکـات، هەواوهەوەسی خۆی بێت، یان هی خەڵکی تر، هـەر یەکـە.. لـە شـەریعەتی خـوا بترازێت ئارەزوپەرستی وهەواو هەوەسی ئەو کەسانەیە، کە نازانن. خوای گەورە بە پێغەمبەرە ئازیزەکەی (ﷺ) دەفەرموێ: (ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الأَمْـرِ فَاتَّبِعْهَـا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاء الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ) ٤٥ الجاثية/ ١٨ واتە: پاشان تۆمان خـستە سـەر ڕاو ڕێبازی شەریعەتێك، دە تۆش شوێنی کەوەو، شـوێن هەواوهەوەسـی ئـەو کەسـانە

مەکەوە، کە نازانن. ئیسلام تەنها شەریعەتێکە شایانی شوێن کەوتن بێت. هەرچی یاساو شەرعی ترە، هەواو هەوەس و نەزانینە.

داعی ئیسلامی دەبێت شوێن شەریعەتەکەی خوا بکەوێت وبەس. دەبێت واز لە هەموو جۆرەکانی هەواوهەوەس بهێنێت. نابێت بە هیچ شێوەیەك لە ڕێ لا بدات. تەنانەت بۆی نیە برگەیەکیش لە هەواوهەوەسی نەزان ونەفامان وەربگرێت. دەبێت ئەوە بزانێت، کە شوێن کەوتوانی هەواوهەوەس، هەموو پشتی یەکتر دەگرن و، وەك بەرەیەك دژی شوێن کەوتوانی شەریعەتی خوا دەوەستن، لەبەر ئەوە نابێت هەندێك لە شوێن کەوتوانی هەواوهەوەس بکاتە جێ هیوای خۆی. نابێت ئومێدی ئەوەی هەبێت، کە تاقمێك لەوانە سەری دەخەن و لایەنگری دەبن! ئەم دینە گاڵتەو گەپ نیە. هەمو بەش و لایەنێکی جیدیە. بۆ ئەوە هاتووە حوکمی ژیان بکات، بۆ ئەوە هاتووە خەڵکی بکاتەوە بە بەندەی خواو وایان لێ بکات تەنها ئەو بپەرستن. بۆ ئەوە هاتووە، تا دەسەڵاتداریی لە هێزە نارەسەنەکان بسەنێتەوەو بیداتەوە بە خوای گەورە. تا هەموو کاروبارێك گەورەو بچوك بگەڕێنێتەوە بۆ شەریعەتەکەی خواو بەس. نەك بۆ ڕاو ڕێساو یاسای هەواو هەوەس. شەریعەتی خوا بۆ ئەوە هاتووە، تا حوکمی هەموو ژیان بکات. تا بە ئەحکامەکانی خۆی ڕوبەڕوی کێشەو پێداویستیە واقعیەکانی ژیان ببێتەوە و، تا حوکمی خوا بە پێی قەوارەو شێوەو گەورەیی، یا بچوکی ئەو کێشانە دەربکات. ئەم دینە بۆ ئەوە نەهاتووە، ببێتە نازناوو دروشمی شان و شەوکەتی ئەم و ئەو، شەریعەتەکەشی بۆ ئەوە نەهاتووە، ببێتە کەرەستەی لێکۆڵینەوەو باس و خواسی تیۆری دور لە واقیعی خەڵکی. ئیسلام وشەیەك نیە هەر بەسەر زماندا بێت و بەس. بەڵکو ئیسلام بریتیە لە بەرنامەو پێڕەو پرۆگرامێکی تەواوی ژیان. کە حەتمەن کەندو کۆسپ وبەندەنی زۆر دێتە ڕێی، هێنانەوەو بوژانەوەو حوکم پێ کردنی. چونکە بانگەوازەکەی بزاڤێکی واقیعیە. بەرنامەیەکە لەسەر ڕێسای (لا الـه الا الله) ولە جیهانی واقیعدا دێتە دی. ئیسلام ڕەنجی ئەوە دەدات، کە هەمو خەڵکی

بگێڕێتەوە سەر پەرستنی خوای ڕاستو تاكو تەنها. ئیسلام دەیەوێت كۆمەڵگای مرۆڤایەتی هەڵنێت بۆ وەرگرتنو ڕاپەراندنی حوكم وشەریعەتی خوا.. ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە، دەستو پێی تاغوتەكان زنجیر كات. ڕەگ وڕیشاڵی ستەمیان لە ناخو بێخەوە هەڵكێشێت، چونكە دەست درێژی كردۆتە سەر خوایەتی خوای گەورەو، دەسەڵاتەكەی ئەویان بۆ خۆیان زەوت كردووە. بۆ ئەوە هاتووە، تا مافی خەڵكی دابین بكات ودادی كۆمەڵایەتیان بۆ بهێنێتە دی.. بۆ ئەوەی سەرزەمین ئاوەدان بكرێتەوەو ئەركی جێ نشینێتی خوای گەورە بەگوێرەی دینەكەی جێبەجێ بكرێت. ئەمانەش هەموی ئەمانەتنو هەر كەسێك بەتەواوی پارێزگاریان نەكات، ئەوە خیانەتی كردووە! خیانەتی لەو پەیمانە كردووە، كە بەخوای خۆی داوەو، ئەو (بەیعەت)ەی هەڵوەشاندۆتەوە، كەبەڵێنەو بە پێغەمبەری پێشەوای داوە (ﷺ). خوای گەورە دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَخُونُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُواْ أَمَانَاتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ) ٨ الانفال/ ٢٧ واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە خیانەت لەخواو پێغەمبەرەكەی مەكەن، خیانەتیش لەو ئەمانەتە مەكەن، كە خراوەتە ژێر دەستتان. خیانەت دەكەن لەكاتێكدا، كە خۆشتان چاك دەزانن ئەوە خیانەتە..

## دین یاساو ڕێساشە:

ئەم ئیسلامە شەریعەتەكەشی وەك عەقیدەكەی وایە. لە ناساندن وحوكمدانی شیرك، یان لە ناساندن وحوكمدانی ئیسلامەتی. چونكە شەریعەتەكە هەر لە عەقیدەكەوە وەرگیراوە. بۆیە دەتوانین بڵێین، كە شەریعەتی ئیسلام هەر عەقیدەكەیەتی. چونكە شەریعەت كاروكردەوەو هەڵوێستی واقیعی عەقیدەیە، ئەم ڕاستیە لە قورئانی پیرۆزدا زۆر چاك ڕون كراوەتەوە. ئەمە ئەو (واتا) یەیە، كە دین بە شوێن كەوتوانی خۆی دەبەخشێت. بۆیە دەبینیت سەدان سەدەیە، بەهەزاران شێوەی پیسی فێڵاوی بۆ شێواندن وشێلوكردنی ئەم ڕاستیە لەدڵی شوێن كەوتوانی ئەم دینەدا هەوڵ دەدرێت، تا گەیشتە ئەو ڕادەیەی، كە كێشەی حاكمێتی خوای

گەورە لە کێشەی عەقیدە جویێ بکرێتەوە، نەك لەدڵی دوژمنە لێزانەکانیدا، بەڵکو لە دڵی موسوڵمانان بە گشتی و، تەنانەت لە بیرو دیدی خوێن گەرمەکانیشیاندا، بووە بە شتێکی جوداو دورو بچوکی وا، کەس دڵی بۆی دانە خورپێت وغیرەتی بۆی نەجولێت! کەس دڵ ودەرونی بۆ ئەم لایەنە عەقائیدیە گرنگە نەجۆشێت! وەکو کە بۆ مەسەلە عەقائیدییەکانی دەجۆشێت. گەیشتە ئەوەی، کە ئەو کەسەی لە حوکمی ئیسلام دەرچوودو بە ئیسلام ڕازی نیە، کەس بە کافرو لە دین بەدەرو پاشگەز بووەوەی حسێب نەکات!! کەس ئەم جۆرە کەسانەی پێ کافر نیە، کە لە (شەریعەت) ی خوا دەرچون وخستویانەتە کەنار، وەکو، کە ئەو کەسانە بە کافر دادەنێت، کە لە (عەقیدە) و (پەرستن) دەرچوون و، کارکەناریان کردون. چونکە مەسەلەی عەقائیدێتی شەریعەتەکە، لە دڵ و دەرون وبیرو بۆچونی خەڵکیدا نەماوە.. بە لقێکی سادەو کەم،بایەخی دینداری دەژمێرن!! بەڵام ئیسلام هیچ جیاوازییەك ناخاتە نێوان سێ گۆشەی(عەقیدە) و (پەرستن) و (شەریعەت). واتە یاساوڕێسا. ئەمە ڕاستیەکە لە دڵ و دەرونی موسوڵمانانی پێشودا قەناعەتێکی بەڵگەنەویست بوو. بەڵام ئەم هەمو دام ودەزگا وشێوازە مەشق پێ کراوە زیرەکانەی، کە سەدان سەدەیە لە هەوڵ وکۆششی ئەوەدان، کە ئەو سێگۆشەیە (دین و ئوممەت و بانگەواز) بۆ حاکمێتی شەرع لێك بترازێنن. تا مەسەلەی حاکمێتیەکە ئاوا لاوازو کرژو بێ قەدر بکەوێت! تەنانەت لە دڵی دیندارەخوێن گەرمەکانیشدا، ئاوا ببێت بە مەسەلەیەکی سادەو کەم بایەخ!! گەرچی قورئانی پیرۆز، چەندەها ئایەتی لەسەر ئەم کێشەیە هێناوەتەوە.. ئەو کەسانەی، کە حوکمی (شیرك) بە سەر بت پەرستێکدا دەدەن، بەڵام لە حوکمی تاغوتێکدا، یان لە حوکمی ئەو کەسەدا، کە حوکم ودادوەری تاغوتی پێ قبوڵە و پێی ڕەوایە، سڵ دەکەنەوە، ئەوانە بە جیدی قورئان ناخوێننەوە و، شارەزای سروشتی ئەم دینە نین. با هەموو قورئان بخوێننەوە. با ئایەتەکانی بە جیددی وەرگرن. با سەرنج دەنە ئایەتی: (وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ) ٦ الانعام/ ١٢١ واتە: ئەگەر مل کەچیتان کردن، ئەوا ئێوەش موشریکن!

زۆر کەسی خوێن گەرم ودڵسۆز، لەوانەی بە تەنگ ئەم دینەوە دێن. زۆرجار بێ ئەوەی هەست بە خۆیان بکەن، خەنجەری ژەهراوی لە جەرگی ئەم ئیسلامە دەدەن! بەوەی کە بایەخ بە هەندێ شتی لاوەکی دەدەن. ئەوانە بەم کارەیان ئەو تۆزە باوەڕو وردەو وزدیەش، کە لەدڵی خەڵکیدا ماوە، لەم لایەنە لاوەکی وکرچ و کاڵانەدا بەفیڕۆی دەدەن. ئەوانە بە خۆیان نازانن، کە وەرنەگرتن و لێك ترازاندنی سێ گۆشەی بەرنامە دینیەکە (عەقیدەو پەرستن و شەریعەت) کارێکی زۆر ناپەسەندو دژوارەو لەبەرژەوەندی جاهیلییەتەکەیە. ئەوەش، کە گوایە دین لەو کۆمەڵگە جاهیلیانەدا ماوەو، هیچی لێ پشت گوێ نەخراوەو (بەتەواوی) ش ئەنجام دەدرێت. مەگەر جارجارە لێرەولەوێ گوناهێك، یان سەرپێچیەك، یان خراپەیەك بکرێت! کە پێویستی بە ڕاست کردنەوەیە!! ئەم بڕیارە زۆر دژوارە، زۆر کاریگەرە، ئەمە·لە کاتێکدا دێت، کە دینەکە هەر لە سەرەتاوە، دەبێ لەسەر (قەوارە) یەك بوەوەستێت. واتە ئیسلام حەتمەن دەبێت لە سیستم و کۆمەڵگە و بارودۆخێکدا دەربکەوێت، کە حاکمێتی تێیدا بۆ خوایەو بەس.. دەرکردنی یاساو ڕێسا هی خوایە، نەك هی مرۆڤ.

بوونی قەوارەو کیانێك بۆ دین پێویستە.. ئەویش پەیوەستە بە بون و چەسپاندنی حاکمێتی خوای گەورەوە. ئەگەر حاکمێتی دینی خوا پیادە نەکرا، واتە هەموو دینی خوا پەك خراوە.. ئەو کێشە گەورەیەی ئێستا دین توشی بووە، بونی دەسەڵاتی ئەو هەمو تاغوتانەیە، کە دەست درێژیان کردۆتە سەر خوایەتی خوای گەورە و، دەسەڵاتی خوایەتیان بۆ خۆیان زەوت کردووە. مافی داڕشتنی یاساو ڕێساو دەستور (شەریعەت) یان بە خۆیان داوە! بەوەی، کە حوکمی گیان و سامان و وەچەیان خستووتە ژێر ڕکێفی خۆیان و بە پێی هەواو هەوەسی خۆیان، یان هی کەسانی تر داوەریان تێدا دەکەن! ئەمەش هەر هەمان کێشە بوو، کە قورئانی پیرۆز لە سەرەتای هاتنە خوارەوەیەوە، بەم هەموو فەرمان کردن و بەرهەڵستی کردن وبڕیارو قەدەغە کردن وڕون کردنانەیەوە، ڕوەو ڕوی دەبووەوە.. هەر ئەم کێشە سەرەکیە بوو، کە

قورئان زو زو باسی دەکردو بەلایەنی باوەڕ بـەخواوەی دەبەسـتەوە.. کێـشەی یاسـاو ڕێسا دانانی، بە خوایەتی خواو پەروەردگارێتی خـواوە دەبەسـتەوە. ئـەم کێـشەیەش بوو دەکرایە تـەرازوو، کـە جاهیلیـەتی پـێ دەکێـشرا.. دەبـووە پێـوەرو نیـشانەی ناسینەوەی ئەحکامی کـوفر، یـان ئـەحکامی ئیـسلامی، کـافرێتی خـەڵکی، یـان ئیمانداریـیان، واقیعەکەی پێ جودا دەکرایەوە.. بەهەرچی تێدا بوو: عەقیدەو فیکـر، پەرستن، ڕەوشت ونەریت، کۆمەڵگـەو دەسـەڵات.. هتـد. حـوکمی هەریـەکێك لـەو موفردەداتانە (کە ئایا ئیسلامیە یان جاهیلیە) بە پێناسەی ئەم کێشەیە دەکرا.. واتـە شەریعەت بڕیاری دەدا حوکمی ئەم واقیعەو پێکهاتەکانی چییە؟

لە ڕاستیدا شەڕە سەختەکەی ئیسلام لـە پێنـاوی سـەلماندنی (بـوون)ی خۆیـدا دەیکرد بەرامبەر جاهیلیەت، شەڕی ئیسلام و بێ باوەڕی (ئیلحاد) نەبوو، تـا لـەو کات وئاست ودۆخەدا کۆتایی پێ بێت، کە (دینداری) بـەو مانـا سـەرەتایەی، کـە گوایە بریتیە لە باوەڕ هەبوون بە هەبونی خوا بێتـە دی! هـەروەها شـەڕێك نـەبوو دژی خراپەکاری کۆمەڵایەتی وداوێن پیسی بەدکاری بێت و بەس.. ئەم ململانـێ و شەڕە بۆ ئەمانەش بەرپا بوو.. شـەڕی ئەمانـەش دەکـرا، بـەڵام دوای بردنـەوەی، شەڕی سەختی سەلماندنی (بوون)ی ئەم دینە کرا، شەڕە سـەختەکەی یەکـەم جـاری ئیسلام بۆ ئەوە بوو، کە بزانرێت ئایا کێ دەبێ حوکم بکات؟

بۆیە ئیسلام هەر لە قۆناغی مەککەیەوە شەیپوری ئەم جەنگەی لێدا. هەر لەو کاتەدا کە عـەقیدەکەی لە دڵ ودەرونی شوێن کەوتووەکانیدا دادەمەزراند. هەر ئەو کاتە، پێش ئەودی باسی سیستم وباس وبڕگەی شەریعەتەکەی بکـات. ئـەو شـەڕە دژوارەی بۆیە دەکرد، تا بۆ جیهانیان بسەلمێنێت، کـە تـەنها خـوای گـەورە مـافی حاکمێتی هەیە. هیچ کەس تەنانەت چاکترین موسوڵمانیش، نەك هـەر ئەوەنـدەی حەددی ئەوەی نیە ئەو مافە بدات بـەخۆی، یـان بەکەسـێکی تـر، بـەڵکو نابێـت بهێڵێت کەسیش لە خوای بسێنێت و، بەهیچ شێوەیەك نابێـت بـۆ خـۆی، یـان بـۆ کەسانی تری زەوت کات!

دوای ئەوەی ئەم کێشە سەرەکیە بەتەواوی لە دڵ ودەروونی شوێن کەوتوانی ئیسلامدا ـ لە مەککە ـ جێگیر بوو، ئیتر ڕاپەڕاندن وجێبەجێ کردنی هەموو دەستورو یاساکانی شەریعەتی ئیسلام ـ لەمەدینە ـ ئاسان بوو.. کۆسپی نەدەهاتە ڕێ. چونکە پێشتر تاك وکۆمەڵ تەسلیم بە دینەکە ببوون، قەناعەتی تەواویان لە(عەقیدەو پەرستن و شەریعەت)دا بە تەنهایی خوایەتی خوای گەورە کردبوو.. ئێستا پێویستە ئەو خوێن گەرمانەی سۆز بۆ ئەم ئیسلامە دەکەن، باش تێفکرن. ورد ببنەوە. بزانن ئەوان لە چ باس وخواستێك دان و، ئیسلامیش داوای چی لێ کردون. بەڵام پێش هەمو شتێك، با لە ڕاستی (واتای دین)ەکە تێ بگەن، ئەوجا سەیری حاڵی خۆیان ودەوروبەریان بکەن..

ئەم خەڵکە ئەم دینەیان لێ تێکچووە، بۆیە لێی دور کەوتونەتەوە. بۆیە ئاوا وازیان لێ هێناوەو بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن، لێی هەڵگەڕاونەتەوە!! ئەمە نەخشەی دوژمنانی ئیسلامە، کە خوای گەورە لە قورئانەکەیدا باسی کردون و دەرهەقیان دەفەرموێ: (لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُواْ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ) ٦ الانعام/ ١٣٧. واتە: تا لە دینەکەیان پاش گەزیان بکەنەوەو دینەکەیان لا بشێوێنن..

ماناو واتای دین ئاوا داخزێنراوە. زاراوەکانی یەقیان کردۆتەوەو بێ کار کەوتوون. بۆیە ئا ئەم هەموو خەڵکەش دەبینیت بیر ئاڵۆزو دیدە لێڵ و وێڵن. وێنەی ڕاستەقینەی دینەکە لە زەین و بیرو هۆشێیاندا نەماوە.

## ناسینەوەی جاهیلییەت:

ئەم هەموو ئایدیۆلۆژی وبیروباوەڕە تێکەڵ وپێکەڵانە. ئەم هەموو خوونەریتە کۆمەڵایەتیانە لەو بیروباوەڕانەوە سەرچاوەیان گرتووە. هەردووکیان تین و تەوژمێکی وا دروست دەکەن، زۆر قورسترە لەو پاڵە پەستۆ کۆمەڵایەتیەی جاهیلیەتی پێشان دروستی دەکرد.. ئەوەتا ئێمە خۆمان لەچەندەها شێوازی جۆربەجۆردا لەجاهیلیەتی نوێدا دەبینین!

ئەم هەموو خوونەریتە قورسەی خەڵکی توشی سەدان ناڕەحەتی ودەردەسەری کردووە، کە ناشتوانن لەسەر خۆیانی لادەن. یان هەر نەبێت کەمێك سوکتری کەن. نەو هەموو نەریتە ماندوکەرە، پێشانگاکانی جل وبەرگ، ئەم هەموو جۆرە مۆدێلەی، گیرفانی ئەو خەڵکە داماوەی هەڵتەکاندووە! ئەم (باو) ە نوێیانەی، کە ژیان وبایەخیان دەخوات وخووردوشتیان دەشێوێنێت و هەراسانیان دەکات. ئەو خەڵکەش ناچارن ملی بۆ کەچ کەن وخۆ بدەن بەدەم شەپۆڵ وتەوژمە بەتینەکانیەوە! مۆدێلی جل وبەرگی بەیانیان، بەرگی دوای نیوەڕوان، بەرگی ئێواران، جلی گەڕان، جلی ئاهەنگ، جلی کورت، کالآی تەسك و تەنگ. جلی هەزدلی سەیرو سەمەرە!! یان ئەو هەموو کەرەستەو ئامرازانەی خۆجوان کردن: مکیاج، چاووبرۆ هەلگرتن، قژ بڕین، گەڤگە کردن. مێش، کرۆڵ، خزولووس.. ئەم هەموو مۆدێلانە خەڵکی زەلیل کردووە.. تۆ بڵێی هەروا لە خۆوە دروست بوو بن؟ یان کەس ودەزگاو دەسەلآتداری لە دواوەیە؟ کێیە وا بەو تەوژم و لافاوە ڕادەرە، ئەو خەڵکە نەفامەی خستۆتە پێش خۆی؟ بێ گومان ئەوەی ئەم پیلانە گلآوانە دادەڕێژێت، ئەو پێشەنگایانەن، کە بۆ مۆدێلی جلوبەرگ خانەی پۆشاك (بيوت الازياء) دادەمەزرێنن.. ئەو پارە دارە سووخۆرانەی بانکەکانن. ئەوانەی پارەی خۆیان لەو کۆمپانیایانەدا دەخەنە گەڕ، تاوەك زەرو ڕەنجی خەڵکی بکەنە بەرهەمێنی خۆیان.

ئەوی کارگێڕی ڕاستەقینەی ئەم دەزگا گلآوانەیە، جولەکەکانن، ئەو جولەکانەن، کە دەیانەوێت هەمو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی برمێنن، تا خۆیان ببنە دەسەلآتداری جیهان وتەنها خۆیان حاکمی بن! ناشیانەوێت بەهێزی سوپاو سەربازو چەك ئاراستەی بکەن، تا دەیگەنێ، بەڵکو بە بیروڕا، بەنەریت، بەو ئایدیۆلۆژیە شەیتانانەی لە قاڵبی ڕۆشنبیریدا دایدەڕێژن. تا بتوانێت پاڵەپەستۆ لەسەر خەڵکی دروست بکەن و تین وفشار بۆ خەڵکی بەشێوەیەك بهێنن، تا ئەو دیاردە نامۆو دوژمنکارانە دەبنە (نەریتی کۆمەلآیەتی)! چونکە ئەوانە چاك دەزانن، کە تیۆری

ڕوت ونوسراو، ڕۆڵێکی وا کاریگەری نابێت. بەڵکو دەبێت ئەو تێورانە لە دیدو نەریتو سیستمو یاساو ڕێساو باروودۆخی کۆمەڵگەکەیدا گەشە بکاتو ببێتە روکنی ژیان! ئەمە کاری شەیتانە شەیتان. شەیتانی جنۆکەو مرۆڤن. ئەمە هەر جاهیلیەتەکەی جارانە، بەڵام لە شێوازو وێنەو رادەو دیاردەیدا گۆڕاوە. ئەمە هەر ئەو جاهیلیەتەی زووە، بەڵام لە قاڵب و دیکۆرێکی تردا هاتووە.. مەگەر نابینیت ئەمیش لەسەر هەمان قەد ڕاوەستاوەو لق وپەل وچڵەکانیشی هەروەکو لقو پەلو چڵەکانی جاهیلیەتی پێشووە؟! دە حەتمەن بەرهەمەکەشی هەروەکو بەرهەمی زەقنەبوتی جاهیلیەتی پێشوو دەبێت.

ئێمە ئەگەر لەو جاهیلیەتەی، کە خوای گەورە لە قورئانەکەیدا باسی فەرمووە، واتێ بگەین، کە جاهیلییەت بیروباوەڕو دیدو تێڕوانین وسیستم دەستورو نەریتی رابوردوە، ئەمە ستەمێکی گەورەیە ولە ئیسلامی دەکەین. چونکە قورئان باسی یەکجۆر جاهیلیی ناکات، باسی هەموو جۆرە جاهیلییەتێك دەکات، لە هەر زەمانێکیدا بێت. هەروەها قورئان هەمیشە بریتی بووە لە ڕوبەڕو بونەوەی واقیعە مونحەریفەکان.. هەوڵدان بووە بۆ ڕاست کرنەوەو هێنانەوەیان بەرەو پەیامی خواویستی. زۆربەی زۆری تاغوتەکانی ئەمڕۆ، کە سەرکردایەتی جاهیلییەتی نوێ دەکەن، ناتوانن وەکو کۆمۆنیستەکان هەڵەوەڕی بکەنو ئینکاری بونی خوای کردگار بکەنو، بە ئاشکرا دژی دین ڕاوەستنەوە. بەڵکو پەنا دەبەنە بەر شێوازی فێڵاوی و نەگریس. دەڵێن: ئێمە ڕێزی دین دەگرین. هەر لە خۆشمانەوە دینی تر ناهێنینە کایەوە. بەڵکو هەموو دەستورو یاسایەکمان، کە بۆ کۆمەڵگەی دادەڕێژین، هەر لەسەر بناغەی ئیسلام دادەڕێژین! ئەمەش شێوازێکی فریودانی شەیتانانەی زۆرگڵاوە! زۆر لە شێوازی کۆمۆنیستە مولحیدەکان خراپترە. چونکە ئەمان ئەو تۆزە هەست و سۆزە دینیە ئاڵۆزەی، کە لە دڵ ودەرونی خەڵکەکەدا ماوە، مەستو سڕ دەکەن. هەرچەندە خۆ ئەم هەست وسۆزە هەتیوە بریتی نیە لە ئیسلام. چونکە ئیسلام پێڕەوو پرۆگرامێکی واقیعی ڕۆشنە. نەك ئەو هەستو

سۆزە ئالۆزە بە ئاڕاستەیە.. ئەوجا ئەو شەستانە لێزانانە دێـن وسروشـت وسـۆزە دینیەکەی ئـەو خەڵکـە عاتفیـە لـە قـاڵبی جاهیلییەتێکـدا دادەڕێـژن، ئەمـەش نەخـشەیەکی زۆر دژوارو شـێوازێکی زۆر شـەیتانی و فێڵاویـە. تاغوتـەکان بـەو نەخشەیەوە خەریکن و، لەملاشـەوە زۆر لـە خـوێن گەرمـە عـاتفیـەکانی ئیـسلام هەموو رەنج و کۆششیان لە لادان و نەهێشتنی خراپەکاری بـچوك بـچوکدا خـەرج دەکەن و، وزەی خۆیان لەلایەنێکی (فـەرعی)انـەی ئیـسلامدا دەخەنـە گـەڕ، کـە کارێکی ئیجابی کاریگەرانە ناکاتە سەر بارودۆخە جاهیلییەتە موشریکیەکان، کـە مافی خوایەتی خوای بۆ خۆی زەوت کردووە. ئەو موسوڵمانە خـوێن گەرمانـە بـەم سۆزە دینیە نارێکەیان، بارودۆخی جاهیلییەتـە موشـریکەکان بـە ئیـسلام سـواغ دەدەن و پۆشاکێکی دینداری بەبەردا دەکەن و شەرعیێتی تێ هەڵدەسون! ئەم کـارە دژوارەو ترسناکەشـیان، بڕیـاردانێکی لاوەکـی (غـیر مباشـر)ە، کـە گوایـە ئـەم بارودۆخە (جاهیلی)انە لەسەر بناغەی ئیسلام دامـەزراون وناشـەرعی نـین! تـەنها ئەوەندەیان هەیە، کە جارجارە لیرەو لـەوێ گوناحێـك دەکرێـت! یـان سەرپێـچیەك لەفەرمانی خوای گەورە لە گۆشەو کەنارێکدا دەکرێت، لە لقە یاسایەکدا، یـان لـە حوکمێکی سادەدا!!

ئێمە زۆر پێویستمان بە بیرخستنەوە هەیە. چونکە رەنجی شـەیتانەکان وپیلانـە گلاوەکانیان هاتۆتەوە بەرو، واتای سەرەکی ئەم دینە پاکەیان لە مێشکی خەڵکیدا گۆڕیووە.. کارێکی وایان کردووە، کە کـەس حـاکمێتی خـوای گـەورەو سـەروەری شەریعەتەکەی بە بەشێك لە عەقیدە نازانێت. تەنانەت لای دیندارە خـوێن گەرمـە دڵـسۆزەکانیش! مەگـەر نابینیـت چـۆن خـەریکی ڕاسـت کردنـەوەی دروشمێکـی پەرستنی وەك بە لابردنی بیدعەیەکن، یان دژی ڕەفتارێکی ڕەوشـتیانەی بـچوکن، یان لە هەوڵی ئەوەدان یاسایەکی فەرعی راست کەنەوە، کە پێچەوانەی شـەریعەتی خوایە! کەچی هیچ قسەیەك دەربـارەی حـاکمێتی وگرنگـی حـاکمێتی وسـەروەری

شەریعەت لە ئیسلامدا ناکەن! دژی خراپە بچووکەکانڕادەوەستن وهەوڵی گۆڕینیـان دەدەن، کەچی واز لە وتەوەرە خراپەی هەرە گـەورە دەهێـنن، کـە دانەمەزرانـدنی ژیانە لەسەر بناغـەی خواویستی.. نەك دیدی ڕەوا، کە تەنها خوای گەورە بە حـاکم دادەنێت. خۆ خوای گەورە پێش هەموو شتێك ئەوەی بـە خـەڵکی فـەرمووە، کـە هیچ جۆرە شەریکێك بۆ خوای گـەورە بڕیـار نـەدەن. ئەمـە ئـەو ڕێـسایەیە، کـە خەڵکی موسـوڵمانی لەسەر پەروەردە دەبێت، دەبێ هەڵویستی یەکەمی موسـوڵمان دەربارەی هەر عـەقیدەیەکی دژ بە ئیسلام، هەر لە یەکەم هەنگاوەوە بریتی بێت لە ڕەتکردنەوەو دوور کەوتنـەوەو تـوخن نەکـەوتنی. دەبێـت هـەمان هەڵوێستیشی هەبێت بەرامبەر هەموو دەستورو یاسـاو ڕێسایەك، هـەروەها هـەموو سیـستەمو نەریتو بارودۆخێك، کە بڕیاری تەنها حاکمێتی خـوا نـادات. دەبێـت هەڵوێـستی ڕەتکردنەوەو تەبەڕرابون بێ لێی. هەر لە یەکەم سـاتی ناسـینیەوە دەبێـت ڕەفـزی کاتەوە، دەبێت لە ڕەگ و ریشاڵیەوە ڕەفزی کات، پێش ئەوەی بـچێتە نێـو باسـی ئەو لق و چڵانەوە، کە لەوانەیە لەگەڵهەندێك لق و خاڵی ئیسلامدا یەك بگرنەوە.

هەرکەسـێك، هـەر کۆمـەڵێك، هـەر میللـەتێك یاسـاو دەسـتوری مرۆڤیـان وەرگرتو پەیڕەویان کرد، ئەوا ئەو مرۆڤانەیان پەرستووە. ئەوە ئەو مرۆڤانەیان بـە خوای خۆیان داناوە، کە ئەو دەستورەیان بۆ دانـاون! ئەمـە ڕون کردنـەوەو ڕاڤـەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە دەربارەی پیاوانی دینی (ئـەحبارو روهبانـەکان)ی جولەکـەو دیانەکان فەرموی، کە ئەو دوو میللەتە ئەحبارو روهبانەکانی خۆیان لەجێی خوا دانا بوو: (کاتێك عـەدی کوڕی حاتەم هاتە خزمـەت پێغەمبـەر (ﷺ) گـوێی لێ بوو ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: (اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّـهِ) ٩ التوبة/ ٣١ واتە: حیبرو راهیبەکانی خۆیان کرد بـووە خـواو، لـە جێـی خـوای پەروەردگار دایان نابوو. عـەدی ووتی: ئەی پێغەمبـەری خـوا، کـوا ئـەوان ئـەو حیبرو راهیبانەی خۆیان پەرستووە؟! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بَلی إِنَّهُـم أَحَلُّـوا

لهمُ الحَرامَ وحَرّمُوا لَهمُ الحَلالَ، فاتّبَعُوهم فَذلكَ عِبادتُهم إيّـاهُم)[١] واتـە: بـەڵێ ئـەوان حەرامیان بۆ حەڵاڵ دەکردن وحەڵاڵیشیان لێ حەرام دەکردن. ئەمانیش پێڕەویـان دەکردن (واتە مل کەچی تەعلیماتەکانیان بون و پێوەی پابەند دەبـون). ئەمـەش پەرستنی ئەو قەشەو حیبرو راهیبانەیە.

## لە دین لادان:

ئێمە لەم زەمانەی خۆماندا زۆر جۆر شیرك لە ڕیزی ئەو کەسانەدا دەبینین، کـە لافی ئیسلامەتی و یەکخواناسی لێدەدەن. پلە بە پلەی شیرك، بە چاوی خۆمـان لـە هەڵس وکەوتیاندا دەبیـنین.. ئـەمڕۆ خـەڵکی جۆرەهـا خوایـان هەیـە (نەتـەوە) و

[١] ئەم حەدیـسە ریوایاتی تری زۆرەو، زۆرینەی ئەهلی تەفسیر لە لێکدانەوەی ئەم ئایەتەی ٣١ ی سورەتی التوبەدا هێناویانەتەوە، چونکە ابن عباس حذیفة بن الیمان و هی تریش لە یاوەران ریوایەتیان کردووە، لەوانە ابن جریرلە ژێر ژمارەی ١٦٦٣١ و ١٦٦٣٢ الترمذي / ژمارە ٣٠٩٥ وابن کثیر لە تەفسیرەکەیدا (٣١٨/٢) و ابن القیم لە هدایة الحیاری ٢٧/١ بە دوورو درێژی هێناویانەتەوە، کردویانە بە بەڵگە بۆ بە کافر دانانی هەر کەس، کە یاسای پێچەوانە بە شەریعەتی ئیسلام دارێژێت.. ابن کپیر دەفەرموێ: رَوَى الْإِمَام أَحْمَد وَالتِّرْمِذِيّ وَابْن جَرِير مِنْ طُرُق عَنْ عَدِيّ بْن حَاتِم رَضِيَ اللَّه عَنْهُ أَنَّهُ لَمَّا بَلَغَتْهُ دَعْوَة رَسُول اللَّه (ﷺ) فَرَّ إِلَى الشَّام وَكَانَ قَدْ تَنَصَّرَ فِي الْجَاهِلِيَّة فَأُسِرَتْ أُخْته وَجَمَاعَة مِنْ قَوْمه ثُمَّ مَنَّ رَسُول اللَّه (ﷺ) عَلَى أُخْته وَأَعْتَقَهَا فَرَجَعَتْ إِلَى أَخِيهَا فَرَغَّبَتْهُ فِي الْإِسْلَام وَفِي الْقُدُوم عَلَى رَسُول اللَّه (ﷺ) فَتَقَدَّمَ عَدِيّ إِلَى الْمَدِينَة وَكَانَ رَئِيسًا فِي قَوْمه طَيِّئ وَأَبُوهُ حَاتِم الطَّائِيّ الْمَشْهُور بِالْكَرْمِ فَتَحَدَّثَ النَّاس بِقُدُومِهِ فَدَخَلَ عَلَى رَسُول اللَّه صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَآله وَسَلَّمَ وَفِي عُنُق عَدِيّ بِصَلِيب مِنْ فِضَّة وَهُوَ يَقْرَأ هَذِهِ الْآيَة " اِتَّخَذُوا أَحْبَارهمْ وَرُهْبَانهمْ أَرْبَابًا مِنْ دُون اللَّه " قَالَ: فَقُلْت إِنَّهُمْ لَمْ يَعْبُدُوهُمْ فَقَالَ " بَلَى إِنَّهُمْ حَرَّمُوا عَلَيْهِمْ الْحَلَال وَأَحَلُّوا لَهُمْ الْحَرَام فَاتَّبَعُوهُمْ فَذَلِكَ عِبَادَتهمْ إِيَّاهُمْ " وَقَالَ رَسُول اللَّه (ﷺ) " يَا عَدِيّ مَا تَقُول؟ أَيَضُرُّك أَنْ يُقَال اللَّه أَكْبَر؟ فَهَلْ تَعْلَم شَيْئًا أَكْبَر مِنْ اللَّه؟ مَا يَضُرّك أَيَضُرُّك أَنْ يُقَال لَا إِلَه إِلَّا اللَّه فَهَلْ تَعْلَم إِلَهًا غَيْر اللَّه؟ ثُمَّ دَعَاهُ إِلَى الْإِسْلَام فَأَسْلَمَ وَشَهِدَ شَهَادَة الْحَقّ قَالَ: فَلَقَدْ رَأَيْت وَجْهه اِسْتَبْشَرَ ثُمَّ قَالَ " إِنَّ الْيَهُود مَغْضُوب عَلَيْهِمْ وَالنَّصَارَى ضَالُّونَ " وَهَكَذَا قَالَ حُذَيْفَة بْن الْيَمَان وَعَبْد اللَّه بْن عَبَّاس وَغَيْرهمَا فِي تَفْسِير " اِتَّخَذُوا أَحْبَارهمْ وَرُهْبَانهمْ أَرْبَابًا مِنْ دُون اللَّه " إِنَّهُمْ اِتَّبَعُوهُمْ فِيمَا حَلَّلُوا وَحَرَّمُوا وَقَالَ السُّدِّيّ اِسْتَنْصَحُوا الرِّجَال وَنَبَذُوا كِتَاب اللَّه وَرَاء ظُهُورهمْ وَلِهَذَا قَالَ تَعَالَى " وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَهًا وَاحِدًا " أَيْ الَّذِي إِذَا حَرَّمَ الشَّيْء فَهُوَ الْحَرَام وَمَا حَلَّلَهُ فَهُوَ الْحَلَال وَمَا شَرَعَهُ اُتُّبِعَ وَمَا حَكَمَ بِهِ نَفَذَ " لَا إِلَه إِلَّا هُوَ وَلَا رَبّ سِوَاهُ.

(نیشتمان) و (گەل) و.. هتد. ئەمانە هەمووی بتن. بەڵام وەکو شێوە سادەکەی جاهیلییەتی جاران پەیکەری دارو بەردی بۆ دانەتاشراوە. بەڵام هەر هەموویان سیفاتی خوایەتیان بۆ دانراوە. قوربانیان بۆ دەکریتو خوینو گیان لە پێناویدا دەدرێت. هەروەکو کە لە بەردەم بتەکانی پێشودا سەر دەبڕران. خەڵکی ئەمڕۆش باوەڕیان بە بونی خوا هەیە. بەڵام تەعلیماتەکانی دەخەنە پشت گوێ! و شەریعەتەکەی دەخەنە کەنار! لە کاتێکدا کە تەعلیمات وداواکاریە قورسەکان ئەو بتانە بە (پیرۆز) دەزانن، گەرچی پێچەوانەی فەرمان وشەریعەتەکەی خواشن! بگرە زۆرجارهەر بەتەواوی واز لە شەرعی خوا دەهێنرێت.. جا ئەگەر ئەمە خوایەتی نیەو ئەمەش شیرك نیەو ئەوانەش موشریك نین؟! ئەدی فرە خوایەتیو شیركو موشریك چینو کێنو چۆنن؟! ئەمانە هەمووی شیركنو لە جاهیلییەتە بۆگەنەکەی ئەمڕۆدا بوونەتە دیاردەو رواڵەتو جەوهەر.. جاهیلییەتی پێشو، زۆر لە جاهیلییەتی ئەمڕۆ بە ئەدەبتر بون چونکە لە جاهیلییەتی پێشودا ئەو بتانە ـ لە جێی خوا ـ دادەنران وقوربانیان بۆ دەکرا، وەك شەریکی خوا دادەنران، واتە هاوبەشی بوون و دەسەڵاتی خوا بون.. لە هەست وسۆزی خەڵکە موشریکەکەی پێشودا، خوای گەورە هەر پاك وبەڕێزو بێ خەوش دەژمێررا.. بەڵام لەجاهیلییەتی ئەمڕۆدا ئەو بتانە بەبەرزترو بەڕێزتر دادەنرێن! داواکاری وفەرمانەکانی ئەو بتانە، بێ چەندوچوونو بێ سلکردنەوە رادەپەڕێنرێن. کەچی شەریعەتەکەی خوا وازی لێ دەهێنرێتو کار کەنار دەکرێت! ئێمە خۆمان هەڵدەخەڵەتێنین، گەر واحساب بکەین، کە بتەرستی تەنها لەو شێوە سادەو ساویلکەی بت دانان وپەرستن وقوربانی بۆ کردنەکەی جارانە!

یان وابزانین تەنها ئەو جۆرە پەرستن و نەزر بۆ کردن و چەمانەوە کڕنووش بۆ بردنەی جارانە، یان وابزانین هەر بەو ئیعتبارەی جارانن، کە گوایە تکاکار(شافع)ی لایخوای پەروەردگارن!

لەڕاستیدا ئەوەی، کە گۆڕاوە تەنها جۆری بت وشێوەی بتپەرستیەکەیە. چونکە دروشمی پەرستنەکان ئاڵۆزتر بوون. ناونیشانی نوێیان لێنراوە.. ئەمما حەقیقەتی

شیرکەکە هەر وەکو خۆی ماوە. ئا ئەمەیە، کە دەبێت ئاگادار بین و خەڵکیشی لێ ئاگادار بکەینەوە. نەهێڵین ڕاستی نە لە خۆمان ونە لەو خەڵکەش بشێوێت، نەبادا ئێمەو ئەوانیش فریوی دوژمنان بخۆین، خوای گەورە فەرمانی بە غیرەتو پیاوەتیو داوێن پاکیو چاکەخوازی داوە. بتەکانی سەردەمیش (پارە)و (بەرهەم)و (نەتەوە)و (نیشتمان)و هتد، فەرمان بەڕوتی ئافرەت ولەش فرۆشیی وچەوسانەوەو روتانەوەی میللەتان دەدەن.. باشە ئەو خوایە کامەیە، کە دەبێت فەرمانو تەعلیماتی راپەڕێنرێت؟ خوای پەروەردگارە، یان ئەم بتە نوێیانەی سەردەم کەلەجێی خوا دانراون؟!

خوای گەورە فەرمانی داوە، کە دەبێت ئەو عەقیدەیەی پەیوەندی هەموو خەڵکی بە یەکەوە دەبەستێت، هەر عەقیدە بێت وبەس. بەڵام بتی نوێ (نەتەوایەتی) و (نیشتمان) فەرمان دەدەن، کە دەبێت پەیوەندی عەقیدە لەنێو تاکی کۆمەڵگەکاندا دوربخرێتەوە! دەبێت (نەژاد) یان (هەستی نەتەوایەتی) ببێتە ئاڵقەی پەیوەندی نێوان خەڵکی!! باشە ئەو خوایە کامەیە، کە دەبێت فەرمانو تەعلیماتی راپەڕێنرێت؟ خوای پەروەردگارە، یان ئەم بتە نوێیانەی سەردەمن، کە لە جێی خوای گەورە دانراون؟!.

ئەمانە هەموی، نمونەی ئەو گۆڕانانەن، کە لەسەر زەمینی ئەمڕۆدا رویان داوە. کە لەڕاستیدا حەقیقەتی بت پەرستی ئەمڕۆ دەردەخەن. حەقیقەتی بتەکان دەردەخەن. ئەو بتە نادیارانەی لەجێی بتە کۆنە دیارەکان دانراونو دەپەرسترێن.. بۆیە دەبێت بەحەزەر بین، هەڵ نەخەڵەتێین، فریو نەدرێین. دەبێت بزانین، کە شیركو بتپەرستی وەکو جاران نەماوە لە شێوەیەکی سادەوساویلکەدا بێت، شیركو بتپەرستی هەر بەردەوامەو هەر ماوە. بەڵام شێوازو دیاردەو رواڵەتی بتو بتپەرستیەکە گۆڕاوە.

ئەگەر شەیتانەکانی خێوو مرۆڤ لەژێری مرۆڤایەتی بگەڕێن، تا سەربەستانە ئەم واقیعە ببینێت، هەرگیز پێی ڕازی نابێت ونایەوێت. بەڵام ئەوی رێی لێ دەگرێت،

هەواوهەوەس وئارەزوی سەرانی گومرایی وفریودانن. ئەوانەی وایــان کــردووە، کــە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ـ دوای چواردە سەدەی تەواو لە هاتنە خوارەوەی قورئــان ـ ئــاوا واز لــە دیــن بهێنێت و هەڵگەڕێتــەوەو، لــەم شــێوە نوێیــەی جاهیلییەتــدا بکەوێتەوە شیرك وهاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات.. لــەو شــەریکە بــێ دەســەڵاتانەی هیچیان لەم گەردونەدا دروست نەکردووە، بەڵکو خۆیان دروست کراون، کە ناتوانن لایەنگری هیچ کەسێك بن و سەری خەن، خۆشیان پــێ ســەر ناخرێــت وەك خــوای گەورە دەفەرموێ: (أَيُشْرِكُونَ مَا لا يَخْلُقُ شَيْئاً وَهُمْ يُخْلَقُونَ. وَلا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصراً وَلا أَنفُسَهُمْ يَنصرُونَ) ٧ الاعــراف/١٩٢ واتە: یان هاوبەشی وا بۆ خوا بڕیار دەدەن، کە هیچیان دروست نەکردووە، بەڵکو خۆیان دروست کراون. هاوبەشی وا بۆ خوا بڕیــار دەدەن، کە ناتوانن سەرکە وتنیان بۆ وەدەست بهێنن وخۆشیان هەر سەرناکەون..

کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ئەمڕۆ، هەروەکو دوێنێــی، پێویــستی بــەوە هەیــە بــەم قورئانە بدۆزرێتەوە، پێویستی بە کەسێکە سەرکردایەتی بکاتەوە، تا جــارێکی تــر لەجاهیلییەتەوە بیهێنێتەوە بەرەو ئیسلام. تا لە شــەوە زەنگــی تــاریکی کــوفرەوە بیباتەوە بەرەو ئاسۆی ڕوناکی باوەڕ.. پێویستی بە کەسێکە بێتەوە ســەر لــە نــوێ بەم دینە دڵ وژیری ودیدو بۆچونی لەم بتپەرستیە نوێیە، لەم بێ مێشکیە نوێیەی، کە دیسان تێیدا جەمەی دێت ڕزگاری بکات. هەر وەکو لە یەکــەم جــاردا هــەر بــەم دینــە ڕزگــاری کــرد بــوو.. تــا دڵ ودەرونــەکان بــە باوەڕهێنــان بــە حەقیقــەتی خوابەیەکناسین ئاوەدان ببێتەوەو هەست و هۆشی پێ بخروشێتەوە. تا نــەوەی نــوێی مرۆڤایەتی ئەم گەشتە دوردی سەرزەمینی لەبەر ڕۆشنایی ڕێنمایی خوادا ببڕێــت.. بڕوات وچاوی لە تەنها ئەستێرەکەی ئاسۆی ژیان بێــت ولــەڕێ لانــەدات. بــڕوات و پشتی بە تەنها سەرچاوەکەی بــوون ببەخــشێت لــە ژیــان و هێــزو ڕۆزیــدا، تــەنها سەرچاوەی سودو زیان.. تەنها سەرچاوەی دان ونەدان، تا لــە گەشــتی درێژخایــەنی بەرەو ئەو سەرچاوەیدا ڕێك وڕاست بڕوات. بەرەوخوا.. هەر لەوێــشەوە وەرگرێــت و لەسەر ڕێبازی ئەویش بڕوات.. لا نەکات بەلای ڕێچکەی تەنگەبەرو بنبەســت، بــا

ئاڵ و والآو ڕازاوەش کرا بن.. تا دڵنیا تـرو هێمـنتر بێـت لـه گەشـتی گەیشتنه هیواوئامـانج.. بـڕوات و بەحـەزەر بێـت. بزانێـت گەورەکـەی چـی پـێ خۆشـه ئەنجامیبدات و، چی پێ ناخۆشه توخنی نەکەوێت.. جا ئەگەر بەم ڕێبازەوە بەردو ئـەو ئاواتەی، کە پشتی بەو سەرچاوە لەبن نەهاتووە بەست وکەوتە ڕێ، گومانی تێدا نیـە، کە هەموو وردو وزەی لەو ڕێیەدا سەرف دەکات.. چونکە لەو حاڵەتـە دابینـەدا، پێـی لەسەر زەمین قایمەو، چاویشی لە خـوای تـاك و تـەنهای زەوی و ئاسمانـەکان بڕیـووە.. خوای گەورە دەفەرموێ: (ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَاءُ مُتَشَاكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ) ٣٩/ الزمـر ٢٩ واتـە: خـوای گـەورە نمونەی دوو پیاوی کۆیلە دەهێنێتەوە، کـە یـەکیان کۆیلـەی چـەند کەسـێکە، کـە هەمیشە ناکۆکییانە لەسەری. دووەمیشیان کۆیلـەی یـەك کەسـە، ئایـا هـەردوو کۆیلەکە وەك یەکن؟سوپاس بۆ خوا. بەڵام زۆریان نازانن.

خـوای گـەورە ئـەم نمونـە دەهێنێتـەوە: نمونـەی بەندەیـەکی یەکخواپەرسـت و بەندەیەکی فرەخواپەرست. بەندەیەکیان کۆیلـەی چـەند کەسـێکە. هـەر یەکـەیان خاوەن حەزو ئاڕاستەیەکە، لەناو خۆیاندا ناکۆکییانە لەسەری وئەویش سـەرگەردان ماوە، نازانێت ڕوو لە کامیان کات وبـە قـسەی کامیـان بکـات!! هـەر یەکـەیان بەجۆرێك ئاڕاسـتەی دەکـەن وهـەر یەکـەیان جـۆرە فـەرمانێکی بەسـەردا دەدەن. ئەویش لە نێوان ئەم هەمو فـەرمان وبەرهەڵـستیەی ئـەو بکـەو ئـەویان مەکـەدا سەرگەردانەو، نازانێت کامیان ئەنجام بـدات. واقـی وڕمـاوە.. سـەری سـوڕماوە. لەسەر هیچ ڕایەك خۆی پێ ڕاناگیرێت! ناشتوانێت ئەم هـەمو هـەواو هەوەسـە دژ بەیەك و تێکچڕژاوانە لێك هەڵاوێرێت وپێکەوە بیان سازێنێت. ئەمە یەکێکیانـە. ئەوی تریشیان: کۆیلەی یەك کەسە. دەزانێت چ فەرمانێکی بەسـەردا دەدەن. چـی لێ داوا دەکەن. بۆیە خێرا وەری دەگرێت وڕای دەپەڕێنێت، پاشان دڵنیاو هێمنانـە ستار دەگرێت و دەحەوێتەوە. چونکە لەسەر یەك بەرنامەو یـەك پرۆگرامـی ڕۆشـن وبەرەو هیواو ئامانجێکی دیار هەنگاو دەنێت.

## بەندی دووەم: مـژدەو ئاگادار کردنەوە

(هَـذَا بَلاغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُواْ بِهِ وَلِيَعْلَمُواْ أَنَّمَا هُوَ إِلَـهٌ وَاحِدٌ وَلِيَذَّكَّرَ أُوْلُواْ الألْبَـابِ) ١٤ ابراهیم/ ٥٢ واتە: ئەمە مژدەیەو ڕون کرنەوەیەکە بۆ خەڵکی، تا پێـی ئاگـادار بکەنەوەو بزانن، کە خوا تاك وتەنهایە، تا خاوەن ژیرەکان لە یادیان بێت.

مەبەستی سەرەکی ئەم مـژدەو ئاگادارکردنـەوەو ڕون کردنەوەیـە، ئەوەیـە کـە هەمو خەڵکی بزانن، کە أَنَّمَا هُوَ إِلَـهٌ وَاحِدٌ: خـوا تـاك و تەنهایـە. ئەمــەش ئـەو بناغەیە، کە ئیسلام پڕۆگرامی خۆی لە ژیانێکی واقیعدا لەسـەر دادەمـەزرێنێت. بێ گومان مەبەست لەمە تەنها زانین نیە. بەڵکو بریتیە لـە دامەزرانـدنی ژیانیـان بە گوێرەی ئەو زانینە. مەبەسـت لەمـە: ڕاپەڕانـدن وجێبـەجێ کردنـی دینەکـەی خوایە. مادام هیچ کەس وهیچ شتێك نیە شایانی پەرسـتن بێـت، جگـە لـە خـوای پەروەردگار، کەوابو هەردەبێت ئـەو بپەرسـترێت، هـەر ئـەویش حـاکمو سـەرۆكو سەروەرو هەڵسوڕێنەرو یاسادانەرو ڕێپیشاندەر بێـت. ئـەوجا دامەزرانـدنی ژیـانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیش لەسەر ئەم بناغە بێـت. ئەمــەش جیاوازیـەکی سـەرەکی هەیە لەگەڵ ژیانی هەموو جـۆرە کۆمەڵگەیـەکی تـری مرۆڤایەتیـدا، کـە لەسـەر بناغەی خوایەتی مرۆڤـ دامەزرا بێت. واتـە لەسـەر حـاکمێتی مـرۆڤ وپەرسـتنی مرۆڤـ. ئەم جیاوازیەش لـە هـەموو شـتێکدایە: لـەباوەڕو بیروهـۆش، لـەدروشمی پەرسـتن، لەخووڕەوشـت و نـەریت، لەرەسـم و عـادەت.. هـەروەها لـە کاروبـاری ئابوریو کۆمەڵایەتی وهەمو لایەنەکانی تری ژیانی تاكو کۆمەڵدا هەیە.

باوەڕهێنان بەخوایەتی و دەسەڵاتدارێتی خوای گەورە، وەنەبێت بریتی بێـت لـە ئایدیۆلۆژییەکی ڕوت، کە تەنها لە بیروهۆشـدا بـچەسپێت. نـا، خوایـەتی خـوای گەورە، پڕۆگرامێکی سەربەخۆیە وهەموو لایەنەکانی ژیانی لەسەر دادەمـەزرێت.. سنوری عەقیدە ئەوەندە بەرفراوانە، کە هەمو لایەنەکانی ژیان دەگرێتەوە. کێشەی

حاکمێتی لە ئیسلامدا بەهەمو لق و پەلەکانیەوە، کێشەیەکی عەقیدەیە. مەسەلە سەرەکییەکانی خووڕەوشتیش، هەرهەمویان مەسەلەی عەقیدەن. ئەو پرۆگرامە بەرفراوانەی ژیانیش، کە خووڕەوشت وعادەت نەریت دەگرێتەوە، هەر لە عەقیدەوە وەردەگیرێت. هەروەها هەمو باروذۆخ و هەڵس و کەوتێکی تری ژیان هەر عەقیدەیین. ئێمە ئەگەر چوارچێوەی عەقیدەی ئەم دینەمان نەناسی وشارەزای نەبووین و، بە تەواوی لە شایەتمانەکەمان (**لااله الا الله محمد رسول الله**) نەگەیشتین، ئەوە لە مەبەستی قورئانەکە تێناگەین. کەوابو پێش هەمو شتێك دەبێت لە واتای (پەرستن تەنها بۆ خوایە) تێ بگەین ودینداریتی بە هەمو لایەنەکانیەوە بیگێڕینەوە بۆ خوای گەورە، نەك هەر لەساتەکانی نوێژدا، بەڵکو لەهەمو گۆشەو کەنارێکی ژیاندا..

ئەو بتپەرستییەی، کە سیدنا ابراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) داوای لەخوای گەورە کرد، کە خۆی و کوڕو نەوەکانی لێ لابدات، وەنەبێت هەرلە شێوە سادەکەی بتپەرستی عەرەبەکاندا بوو بێت، کە لە جاهیلییەتی پێش ئیسلامدا دەیان کرد، یان لە جاهیلییەتی تردا، کە لە بەردو دارپەرستی، یان ئاژەڵ وباڵندە پەرستیدا دەردەکەوت. ئەم شێوانە هەموو جۆرە بتپەرستیەکان ناگرنەوە، هەموو جۆرەکانی شیرك ناگرنە خۆ.

ئەگەر ئەوەندە سادە بین وا بزانین، کە تەنها ئەمانە شیرکننەوا پەردەیەك دێنین بەسەر بینایی خۆمانداو ناهێڵین حەقیقەتی جاهیلییەت و وێنەو جۆرە جیاوەزەکانی شیرك بناسن. کەوا بوو دەبێت زۆر بە قوڵی بە لێکۆڵینەوەکەدا ڕۆچین. دەبێ سروشتی شیرك و مانای بت وپەیوەندی نێوان بت وشیرك شارەزا بین و، جۆرە نوێکانی جاهیلییەتی سەردەم بزانین و، بزانین شیرك لەچی لایەنێکدا هەیە. لەو شیرکەی پێچەوانەی (**لااله الا الله**) یە. کە بریتیە لە هەموو جۆرە باروذۆخ و ڕەوتێك، کە بەگوێرەی دینی خوا دانەڕێژرا بێت. حەقیقەتی شیرك لەمەدا دەردەکەوێت، کە کەسێك لەلایەنێك لەلایەنەکانی ژیاندا، خۆی بەگوێرەی دینی

خوا ساز دابێت، بەڵام لایەنەکانی تری ژیانی بەگوێرەی ڕێبازێکی تر داڕشتبێت! زەقترین نمونەش، ژیانی ئەمڕۆی مرۆڤایەتییە، کە جۆرەکانی شیرك لەزۆربەی لایەنەکانی ژیانیدا دەردەکەوێت.

## بتی بێ پەیکەر:

ئەو کەسەی، کە باوەڕ بەخوایەتی خوا دەهێنێت و نوێژو ڕۆژو حەج و پەرستنەکانی تری، بەپێی شەریعەتی خوا بەجێ دەهێنێت، کەچی لە هەمان کاتدا بۆ کاروباری سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی، لە یاساو ڕێساو بەرنامەی تری غەیری خوای گەوردەوە وەردەگرێت. بیروهۆش و دیدو بۆچونی بەگوێرەی بیروباوەڕێکی تری غەیری ئیسلام دادەڕێژێت، ئەو کەسە لە نێوجەرگەی شیرکدا خول دەخوات. بەتەواوی پێچەوانەی شایەتمان (**لاالە الا الله محمد رسول الله**) دەوەستێتەوە! با پەرستنەکانیشی بهێنێتە دی. ئا ئەوەیە، کە خەڵکی ئەمڕۆ لێی بێ ئاگان وبێ دەربەستانە دەکەونە ناوی وگوێی نادەنێ. چونکە ئەم خەڵکە نازانن، کە ئەم شیرکەی ئەوان، هەر هەمان شیرکە، کە کافرەکان لە هەموو کات و شوێنێکدا کردویانە، خۆ بت مەرج نییە لە شێوە سادەکەی جارانیدا بێت، نەخێر.. ئەو دروشمانەی، کە تاغوتێك بەرزیان دەکاتەوەو خەڵکی پێی لەژێر ئاڵایاندا کۆ دەکاتەوەو، دەیان خاتە سەر دینێکی تر، جۆرێکە لە بت. وەك چۆن بتی جاران کە قسەی نەدەکردو نەیدەبیست ونەیدەبینی، خۆ بتەکانی ئەم سەردەمەش هەروان! جاران کۆمەڵە زێوانێك، کە لە پشت بتەکانەوە بوون، کە خۆیان لەڕواڵەتدا بۆ خزمەتی بت وبتگاکان تەرخان کرد بوو، ئەمانەی، کە وێردیان دەخوێندو دوعایان دەکردو شاڵ وموفەڕك وتەبەڕوکیان دابەش دەکرد، هەر ئەمانەبون، کە حوکمیان دەردەکردو دەیان ووت: ئەمە حوکمی بتە پیرۆزەکانە! ئەمان دەیان ووت، کە (جەنابی بت) فەرموویەتی چی حەڵاڵەو چی حەرامە! پیرۆزی بتەکان ببووبووە خەرمانەی ڕێزی دەوری ئەمانیش، هەرچی ئەمان دەیان

ووتو دەیانکرد، هەر بەناوی (جەنابی بت) ەوە بەناو خەڵکدا بڵاودەبۆوەو دەبووە یاساو دەستور! ئەمڕۆش هەر وایە. هەزاران دروشمو هێماو لافیتەی بتین هەن، کە زێوانو حاکمو سکرتێرو ڕێبەرو سەرکردایەتی حزبەکان لەژێر ناو لەپشتی ئەو دروشمانەوە یاساو ڕێساو حوکم دەردەکەن، هەر بەناوی ئەوانەشەوە ڕێبازو بەرنامەو یاساو ڕێساو خوونەریتو بەهاو ڕەهەند دیاری دەکرێت.. بەڕاستی ئەمانەش هەر بتن، سروشتی بتن. حەقیقەتی بتن، ئەرکی بت جێبەجێ دەکەنوو ڕۆڵی بتیش دەبینن..

ئەگەر لەجێیەك نەتەوایەتی کرا بە ئالا، نیشتمان کرا بە ئالا، گەل و دەسەلات کرا بە ئالا، یان چین وتوێژێکی کۆمەڵ کرا بە ئالاو، خەلکیان بۆ پەرستنی کۆکردەوەو لەجێی دینی خوا کرانە بەرنامەی ژیانو، قوربانیان لەپێناودا دراو، سامانو تەمەنو ئابڕویان لە پێناودا بەخت کرا.. ئەوە کراونەتە بتو لەجێی خوا دانراون تا بپەرسترێن.. ئەگەر یاساو ڕێساو دەستور بەناوی ئەم لافیتەو ئالایانەوە دەرکراو، شەریعەتەکەی خوا خرایە کەنارو، ئەو دەستورانە بونە سیستمی حوکمی ژیانی کۆمەڵگەکە.. یان بە واتایەکی تر بڵێین: ئەگەر دیدو بۆچون وپێناسەو یاساو ڕێسای تاغوتان بووە بەرنامەی ژیان، ئەوە بتپەرستی لە زەقترین شێوەیدا نیشان دراوەو چەسپیووە! ئیتر خۆ مەرج نیە لەجێی ئەم ئالاو بەرنامانە، بت داتاشرێتو بپەرسترێتو بەشێوە ساویلکەکەی پێشوو، لەدەوری گەڕێنو وێردی بەدەورداً بخوێنرێت.

بتپەرستی مەرج نیە داروبەرد پەرستی بێت. واتە چەمانەوەو کڕنوش بۆ بردن تەواف کردن بێت بەدەوری بتێکدا، نەخێر.. لەوانەیە بیروباوەڕێك، هەستو سۆزێك، ڕێبازێك بوو بێتە بت. خۆ ئیسلام هەر بۆ ئەوە نەهاتووە بتی داروبەرد لاداو ڕاداو پەیکەرەکانیان بڕوخێنێت، نەخێر، ئەم ئیسلامە بۆ ئەوە هاتووە، کە دووڕێیانی نێوان کوفرو باوەڕ، شیرك ویەکخوا پەرستی، جاهیلییەت وئیسلام دیاری بکات.. دووڕێیانی نێوان دینی خواو دینی غەیری خوا.. تا بەرامبەر هەموو ڕەوتو ڕەفتارو هەڵسوکەوتێك حوکمی شەرعی خۆی دیاری دبکات. تا هەموو دیدو بیروباوەڕو بۆچونو پێناسەو ڕێبازو شێوازی خەباتو سیستمو

پڕۆگرامێك بناسێنێت‌و شایەتی لەسەر یەك یەكیان بدات.. تا بزانرێت ئایا ئەمانە هی خواناسین، یان هی فرەخواناسین، تا بزانرێت ئایا ئەو خەبات‌و هەوڵدانە بۆ سەروەری یاساو رێساو دەستوری تاغوتانە، یان بۆ دامەزراندنی حوكمی خوایە لەسەر زەوی و بۆ چەسپاندنی شەریعەتی خوایە..

## دین هەر شایەتمان نییە:

ئەوانەی وا دەزانن هەر بەوەندەی بەزمان شایەتمان دەهێنن ونوێژ دەكەن ورۆژو دەگرن وژن هێنان وتەڵاقدانیان، یان میراتگرییان بەگوێرەی تەعلیماتی ئیسلام دابەش دەكەن، ئیتر ئەمەندە بەسەو هاتونەتە (دینی خوا) وە، بەڵام لەولا ترەوە ملكەچ‌و گوێڕایەڵی یاساو رێسای دژ بە ئیسلامن، نوێژ دەكەن بەڵام گیان‌و ماڵیان لە پێناوی ڕێبازێكی جاهیلییەتدا دەكەنە قوربانیو، لەخەباتێكی بەردەوامدان‌و وزەیان دەخەنە گەڕ، ئەوانە ئاواتی بتێكی نوێ‌دێننە دی!!

ئەوانەی كە دەبینن ئابڕوو ڕەوشت ونەریت وڕەهەندو بەهاو بڕیارەكانی دین، كە دەبێتە ڕێگری داواكارییەكانی جاهیلییەت وتەعلیماتی بتە نوێكان، ئەو بەها ئیسلامیانە دەخەنە لاوەو داواكارییەكانی جاهیلییەت جێبەجێ دەكەن! پێشیان وایە موسوڵمانی دیندارن، نابێ لە خۆیان بپرسن، كە ئەمە چ دینداریيەكە؟! چما ئەوانەی ئەمە هەڵس وكەوت وحاڵیانە، هەروا دەزانن لە (دینی خوا) دان وحوكمی كوفریان ناكەوێتە سەر؟

ئەوانە دەبێت بەهۆش خۆ بهێنرێنەوە.. دەبێت سەر لە نوێ لەوە حاڵی بكرێنەوە، كە ئەو حاڵەتەی ئەوانی تێدان شیركێكی زۆر گەورەو دژوارە! ئەوانە لە دینی خوادا نین! دینی خواگاڵتەبازاڕ نیە.. دینی خوا ئاوها لاوازو هیچ و پوچ و بێ قەدرو قیمەت نیە!! ئەمەی ئەمان گرتویانەتە بەر، (دینی خوا) نیە.. ئەم جۆرە كەسانە لاف وگەزافی موسوڵمانێتی لێ دەدەن، خۆیان وخەڵكی هەڵدەخەڵەتێنن.. ئەمانە یان زۆر گێل وهێڕو گەلحۆن، یان زۆر نەزانن، یان زۆر لا ئوبالین و گوێ نادەن بەگرنگی

دین وجیددیەتی دینداری.. دینی خوا بەرنامەو پەیڕەوو پڕۆگرامی هەموو گۆشەو بارێکی ژیانی ڕۆژانەیە. دینی خوا بریتیە لە: ملکەچی دەربڕین بۆ هەموو فەرمانو بەرهەڵستی (امر و نهی)یەکی خوای گەورە.. دینی خوا: ئەو ئیسلامەیە، کە خوای گەورە، غەیری ئەوی پێ قبوڵ نییە.. ئەو بەرنامەیە، کە هەموو لایەنی ژیانی کۆمەڵگا دەگرێتەوە.. بەپێی ئەو ئیسلامەش، شیرك تەنها لەبیروهۆش وباوەڕدا نیە.. بەڵکو پێش هەموو کێشەیەك، لە بەحاکم دانانی غەیری خوادایە. لەوەدایە، کە کەسێك، یان دەستورو یاساو ڕێسایەك، لەجێی شەریعەت وسیستەمەکەی خوای گەورە بکاتە حاکم و دەسەڵاتدارو سەروەر.. یان حەکەم وناوبژیوان ودادوەر.. یا پێیان ڕازی بێت.. ئەوە شیرکە، ئەوە کوفرە، جاهیلییەتە..

بتپەرستی بریتی نیە لە دارو تەختە پەرستن، بەڵکو پێش هەموو شتێك، بریتیە لە بەرزکردنەوەی ئاڵاو درووشمی غەیری ئیسلامی و، کۆکردنەوەی خەڵکی لە دەوریان و دانان بە دەسەڵاتداریتی وسەروەری هێزو دادوەرییان..

با هەموو خەڵکی ـ لە هەر وڵاتێك هەن ـ سەیری دەسەڵاتی باڵای وڵاتەکەو سەروەری یاسایان بکەن، بزانن ئەو دەسەڵات و سەروەرییە بۆ کێیە؟ دینی ئەو وڵاتە بەو سیفەتەی باسمان کرد چیەو ملکەچی بۆ کێیەو تەعلیماتی کێ جێبەجێ دەکرێت وخەڵکی گوێڕایەڵی کێن؟ ئەگەر ئەمانە هەرهەموی بۆ خواو شەریعەتەکەیەتی، ئەوا ئەو خەڵکەش لە دینی خوا دان. ئەگەر بۆ غەیری شەریعەتەکەیەتی، ئەوا با چاك حاڵی بن، کە لە دینی تاغوت وبتپەرستیدان.. خوا پەنامان بدات[١]..

**(هَـذَا بَلاغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُواْ بِهِ وَلِيَعْلَمُواْ أَنَّمَا هُوَ إِلَـهٌ وَاحِدٌ وَلِيَذَّكَّرَ أُوْلُواْ الألْبَابِ) ١٤ ابراهيم/٥٢..**

---

[١] بێگومان ئەوە حوکمی ئەو کەسانەیە، کە بەو بەرنامەو ڕێبازو سیستمی جاهیلییە ڕازین و هەوڵنادەن بیگۆڕن.

# بەندی سێیەم: طاغوت و دیـــن

## چی طـاغوتـــە؟!

وشەی (طاغوت) لە (طغیان) وەرگیراوە، وەزنی وەکو ( مَلَکوت ورَحَمُوت)ە، خـوای پەروەردگار دەفەرموێ: (وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَـابُوا إِلَـى اللَّـهِ لَهُـمُ الْبُشْرَى فَبَشِّرْ عِبَادِ. الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ أُوْلَئِـكَ الَّـذِينَ هَـدَاهُمُ اللَّـهُ وَأُوْلَئِكَ هُم أُوْلُوا الالْبَابِ) ٣٩ الزمر/ ١٧- ١٨ واتە: ئەوکەسانەی، کە توخنی تاغوت نـە کـەوتن، چ جـای ئـەوەی بیپەرسـتن. ئەوانـە ئەوکەسـانەن، کـە بـەرەو خـوا گەڕاونەتەوە. مژدەیان لێ بێت.. مژدەش بدە ئەو عەبدانەم، کـە گـوێ لـە قـسان دەگرن، بـەڵام تـەنها چـاکترینیان دەگرنـە گـوێ وشـوێنی دەکـەون. ئەوانـە، ئـەو کەسانەن، کە خوا ڕێنمایی کردون وئەوانەشن خاوەن دڵ وژیری..

کەوابوو ئەو کەسانەی دورن لە تاغوت و توخنی ناکەون وغەیری خـوای گـەورە ناپەرستن؛ هەر ئەوانەن، کە بەرەو خوای گەورە گەڕاونەتـەوە وکڕنوشـی ملکەچـیو پەرستنیان تەنها بۆ ئەو دەربڕیوە. تـاغوت هـەموو دەسـەڵاتێك دەگرێتـەوە، کـە شەرعیەتی دەسەڵاتەکەی لە خوای گەورەوە وەرنەگرتبێت. هەروەها هەموو حوکمو یاساو سیستمێکە، کە لە شەریعەتی خواوە هەڵنـەقوڵابێت. بۆیـە هـەر جـۆرە لـە سنور دەرچونێك، هەر جۆرە لەحەق لادانێك، دەستدرێژی کردنـە سـەر دەسـەڵاتو خوایەتی خوای گەورە، دەستدرێژییە بـۆ سـەر حـاکمێتی خـوای گـەورە. ئەمـەش نارەواترین وناقۆڵاترین دەستدرێژییەو لە هەمووستەم ولە سنور دەرچونێك خراپترە. ئەمە یاخی بونێکە پێناسەی تاغوتی لە هەموو ڕویەکەوە بە سەردا دەبڕێت، کـە خوای گەورە دەرهەق ئەهلی کیتاب (جولەکەو دیان) دەفـەرموێ: (اتَّخَـذُواْ أَحْبَـارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ) ٩ التوبة/٣١ واتـە: حیـبرو ڕاهیبـەکانیان (کـە پیـاوی

دینەکەیانن) لە جێی خوای گەورە دادەنا. خۆنەیان دەپەرستن (بە مانای کڕنوش بـۆ بردن)، بەڵکو یاساو ڕێساو شەریعەتیان لێوە وەردەگرتن. خوای گەورە ئەمەشی بـە (عیبادەت) لە سەر دانان وبە موشریکیشی ناساندن. چونکە ئەو خەڵکـە گومڕایـە تاغوتیـان دەپەرسـت، واتەئـەو دەسـەڵاتدارانەی بـە نـاوی خـواوە لـە سـنوری عەبدایەتیو ئەرکی خۆیان دەردەچون. خۆ ئەو خەڵکە گومڕایە نوێـژو ڕۆژویـان بـۆ ئەو حیبرو قەشەو راهیبانـە ئـەنجام نـەدەدا، بـەڵکو ملکەچـییان بـۆ دەردەبـڕین، گوێڕایەڵی تەعلیماتیان دەبون. ئەمـەش پەرسـتنەو بۆغـەیری خـوای پـەروەردگار ئەنجام دەدرا. بەمەش ئەو پەرستیارانە لـە دیـنی خـوای گـەورە دەچـوونە دەرەوە. مەبەستی بانگەوازی خواویستی ڕونو ئاشکرایە. مانای دینداریتی بۆ خوای گەورە ڕونو ئاشکرایە، کە بریتییە لە سەندنەوەی دەسـەڵات لـە بەنـدە گـومڕاو ملـهوڕە تاغوتەکانو گێڕانەوەی بۆ خوای گەورە. گەرچی لای تاغوتەکان مانـاو مەبەسـتی بانگەوازی خوایی (خراپەکاری)یە! یان بەدەردی لـە فەرهـەنگی سیاسـی ئـەمڕۆدا دەڵێن (**محاولة لقلب نظام الحكم**)ە، واتە: **هەوڵدان بۆ هەڵگێڕانەوەی سیستمی حـوکمی وڵات!** بڕوانە ئەم گفتوگۆیەی سیدنا موسا لە لایەك، و فیرعەون دارودەستەکەی لە لایەکی تر: (**وَقَالَ مُوسَى يَا فِرْعَوْنُ إِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ**) ٧ الاعراف/١٠٤. واتە: موسا فەرموی: ئەی فیرعەون، من نێرراوی خوای پەروەردگاری جیهانیانم.. (**وَقَـالَ الْمَلأُ مِن قَوْمِ فِرْعَـونَ أَتَـذَرُ مُوسَـى وَقَوْمَـهُ لِيُفْـسِدُواْ فِـي الأَرْضِ وَيَـذَرَكَ وَآلِهَتَكَ**) ٧ الاعـراف/ ١٢٧ واتە: دەستەی حاشیەو ڕاوێژکارەکانی فیرعەون پییـان ووت: تۆ چون لە موساو گەلەکەی دەگەڕێیت خراپەکاری لە وڵاتەکـەدا بکـەنو واز لە خوایەتی تۆ بهێنن؟!!

سیستمی حوکم لە جاهیلیەتدا لەسەر ئەو ڕێساو بناغەیە دادەمـەزرێت! یـەکێك لە بەندەکان خۆی لەوانی تر دەکاتـە خـوا!! لـە بانگـەوازی ئیسلامیـشدا خوایـەتی (پەرسـتن ویاسـا دانـان) هـەرهی خـوای گەورەیـە، کـە دەسـەڵاتی بەسـەر هـەموو بوونـەوەردا هەیـەو دەسـەڵاتی بەسـەر هـەموو بەندەکانیـدا وەکـو یەکـە.. ئـەو

سیحربازانەی، کە باوەڕیان بە خوای پەروەردگاری جیهان هێنا، تەسلیم بە دەسەلاَتو خوایەتی خوای گەورە بوون. بەمەش ئیعلانی ئەوەیان، کرد کە لەژێر رکێفو دەسەلاَتی لادەری تاغوت دەرچون، کە مافی خوایەتی خوای گەورەیان بۆ خۆیان زەوت کردووە، ئەو سیحربازانەی بۆ دژایەتیو بە درۆخستنەوەی سیدنا موسا هاتبوونە مەیدان دوای ئەوەی، کە موسوڵمان بوون زانیان شەڕی داهاتویان شەڕی عەقیدەیە. دەیانزانی هەر بەوەندەی ئەم عەقیدە دینی یە ئاشکرا بکرێت، ئەمە نیشاندانی مەترسی دژوارو هەڕەشەی کاریگەری عەمەلی یە لە دەسەلاَتی تاغوتەکان. بگرە هەر بەوەندەی ئیعلان دەکرێت، کە خوای پەروەردگار خوای هەموو جیهانیانە، هەر ئەمە خۆی ئیعلانی رەفزی دەسەلاَتی ئەو تاغوتانەیە.. پاشان فیرعەون پێی ووتن: ‌(**إِنَّ هَـذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ فِي الْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُواْ مِنْهَا أَهْلَهَا**) ٧ الاعراف/ ١٢٣ واتە: ئەمە هەر فاکوفیکی خۆتانە، دەتانەوێ خەڵکی ولاَت ئاوارەبکەنو بیانبەنە دەرەوە.. ئەمەش هەر وەکو ئەو تۆمەتانە وایە، کە جاهیلیەتی نوێ دەیخاتە پاڵ ئەو کەسانەی، کە پێناسەی خوایەتیان بە مانا حەقیقییەکەی رون دەکردەوە، ئەم تۆمەتە دزێوانەیان دەخستە پاڵ داعیە چاکە خوازەکان.. مەگەر فیرعەون نەیدەوت: ‌(**إِنِّي أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي الارْضِ الْفَسَادَ**) ٤٠ غافر/ ٢٦ واتە: دەترسم دینەکەتان (بەرنامەی ژیانو ڕێبازتان) بگۆڕێت، یان بکەوێتە خراپەکاری لە ولاَتدا! مەگەر ئەم قسە هیچو پوچانە، هەر هەمان قسەی شەڕخوازە ڕقنەکان نیە، کە بەڕووی پاکی ئەهلی چاکی حەق و ڕەوادا دەکرێن.. مەگەر هەمان پڕوپاگەندەی فریودان وقسەی لوسی هەڵخەڵەتاندنی ئەهلی باتڵ نیە لە هەموو کاتو شوێنێکدا، کە دەیانەوێت خەڵکێکی گێل بەرامبەر حەقو ئەهلی ئیسلام بهروژێنن؟ بەڵێ هەر ئەمانەن!! هەمان هەڵوێست، قسەو قسەڵۆك.. هەر کاتێك حەقو ناحەق بەیەکتر دەگەن، ئەم بەیتو باڵۆرانە دوپات دەبنەوە.. هەمان تۆمەتی نارەوایە.. هەمان پێناسەو دیدە، هەرکاتێك چاکەخوازیو شەڕخوازی دەبەرێکرادەچن، ئەمانەش دیسان بەکار دەهێنرێنەوە.. کۆن نابن.. ئەم تانەو بوختانانە دەڵێی لەگەڵ چەرخی زەمانەدا دەچەرخێن..

## تاغـوت دەڵــێ دیندار ترم!

هەر تاغوتێك، كە رێی خواویستی نیشان دەدرێت وئامۆژگاری دەكرێت، هەواو هەوەس ونەفسی هەرالّی ناهێڵێت گوێبیستی هەق بێت. هەر سور دەبێت لەسەر دیكتاتۆری فیرعەونێتی وخۆپەسەندییەكەی خۆی. مەگەر نابینیت فیرعەون دەیووت: (مَا أُرِيكُمْ إِلَّا مَا أَرَى وَمَا أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ الرَّشَادِ) ٤٠ غافر/ ٢٩ واتە: تەنها ئەو رێیەتان نیشان دەدەم، كە خۆم دەیبینم، خۆشم جگە لە رێی سەرفرازی، هیچی ترتان نیشان نادەم! بەلێ.. تاغوتان هەر رێی سەرفرازی و بەختەوەری و ئاسودەیی دەبینن و هەر ئەوەش نیشانیجەماوەرەكە دەدەن!! دیوتانە بەدرێژایی مێژوو تاغوتێك رای كەسێكی حەق خوازی بەراست زانیبێت ئەگەر پێ ی ووتبێت: لەوانەیە بەهەڵەدا چوبیت؟! هێشتوویانە كەسێك رایەكی تر، جگەلەوەی تاغوت خۆی هەیەتی هەبێت؟! جا ئەگەر گوێیان لە خەڵك بگرتایەو هێندە خۆپەرست نەبونایە، بۆچی دەبونە تاغوت؟!... تاغوت سوورە لەسەر باتڵی خۆی و، كەللە رەقە لەبەرهەڵستی بانگەوازی خوای پەروەردگاری جیهانیان. چونكە زۆر چاك دەزانێت كە ئەم بانگەوازە خۆی لە خۆیدا، شەری ریشە كێشكردنی ئەوی بە دەستەوەیە.. ناهێڵێت شەریعەتە تەزویردكەی بێنێت.. بە مەش تەخت و تاراجی دەسەڵاتەكەی هەڵدەتەكێت. بۆیە مومكین نیە تاغوتێك رێگا بە خەڵكی بدات بڵێن: لاالـه الاالله.. مەگەر لەوكاتو شوێنانەدا، كە خەڵكی حەقیقەتی مانای ئەم شایەتمانە نازانن.. دڵنیان، كە ئەو جەماوەرە زۆرە نازانێت (لاالـه الاالله) واتە چی؟! بۆیە لەوكاتو شوێنانەدا رێ دەدەن، چونكە دڵنیان خەڵكی هەروەكو وێردێكی زیكری سەرزمان، ئەو رستەیە دەڵێن. ئەمەش هیچ جۆرە زیانێك لە بوون (وجود)ی تاغوتو جاهیلیەتیان نادات. بۆیە تاغوتان هەر هەقیان بەسەر ئەوانەوە نیە، كە سەرزارەكیو بێ تێگەیشتن دەڵێن (لاالـه الاالله)، ئەمما ئەگەر كۆمەڵێكی خواویستی سەرراست، بەراستی لە واتای دینو شایەتمان تێگەیشتن، حەتمەن

تاغوت تەحەمولی بونیان ناکات.. چونکە تاغوت ئەوجەماوەری خەڵکەی بە خوایەتیەکی تەزویر بۆ خۆی نیغفال کردوە! بەوەی دەسەڵاتی حاکمێتییەکەی، کە دەبوو بە گوێرەی شەریعەتی ئیسلام بێت بە فریودان، یان بە زۆر بەسەر ئەو خەڵکەدا سەپاندووەو خەڵکەکەشی کردۆتە کۆیلەو بەندە..

## دین و سیاسەت؟!!

هەموو جارێكو لە هەموو جێیەك باتڵ وا لە خەڵکی دەگەێنێت، کە گوایە ئەم بانگەوازە دینییە، تازدیەو مەبەستی تری لەژێر سەرەودیە!! ئامانجی تری لە پشتەوەیە.. ئەهلی ئەم بانگەوازە خواو یستیە (تازە) یە، دینەکە بۆ ئامانجی سیاسی خۆیان بەکار دەهێنن.. ئەمەش هەموو کەس پەی پێ نابات.. تەنها ئەمانی تاغوتو دارو دەستەو سیحیربازانی فیرعەون، ئەمانی گەورە پیاوو ئاقڵو ماقوڵ، دەرکی پێ دەکەن! چونکە ئەمان سیاسەتمەدارن ودەزانن لە شت بکۆڵنەوە.. دەزانن لە پشت بانگەوازی دینیئاواوە چ مەبەستێکی تری شاراوە هەیە!! (**وَانطَلَقَ الْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَى آلِهَتِكُمْ إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ**) ٣٨ سورة ص/ ٦ واتە: دەمڕاست و حاشیەکان دەیان ووت: لەسەر ڕێبازی خۆتان بەردەوام بنو ئارام لەسەر خواپەرستی خۆتان بگرن و خوای خۆتان گەرچی بتیش بن بوێت!! ئەم بانگەوازە نوێیە شتی تری لەژێر ئاڵادایە.. ئەم بانگەوازەیان بۆ ئامانجی تری شاراوە دەوێت[١].. لاوەکیش بەخەڵکیان دەووت: باجەماوەری خەڵکی، چارەسەرو بەرگری و ڕاگرتنی ئەم جۆرە بانگەوازە نوێیەو، کەشف کردنی ئامانجە شاراوەکانی لێ گەڕێن بۆ ئەمانی تاغوت.. بۆ ئەمانی پسپۆر! چونکە ئەمان ژیرن، پەی بەو ئامانجە پەنهانانە هەمووی دەبەن، کە ئەم بانگەوازە نوێیە لە خۆی گرتون.. لێی گەڕێن!!

---

[١] ئێستاش بە موسوڵمانان دەوترێت: کۆنەپەرست وگێل و ئوسولیگەرو تارویست و تیرۆریست.. پێمان دەڵێن: دەتانەوێ دەسکەوتەکانی شۆڕش و گەل و حکومەت بفەوتێنن و دژی دیموکراسی و مافی مرۆڤ و خەباتی مرۆڤایەتی بوەستنەوە..!

جەماوەریش دەچێتەوە سەر عادەتی کۆن وخوا بێ دەسەڵاتەکەی خۆی! ئیتر هەقی بەسەر ئەم جۆرە مناوەرانەوە نییە.. تەواو.. کەشف کردنی ئەم بانگەوازو ڕێبازە نوێیەو ئەو تاقمەی لە پشتییەوەن، ئەمە ئیتر ئەهلی تایبەتمەندی خۆی بۆی چونەتە پێش.. گەورە پیاوان وسیاسەتمەدارانیولات چوونەتە مەیدان بۆیان.. دڵسۆزانی گەل لە شەونخویدان و هەمیشە پەرۆشی بەرژەوەندی دین و دینداری جەماوەرن!! ئەم شێوازانەی فریوو دان. ئەم جۆرە ڕەفتارانە.. ئەم دوو سێ ڕوییە.. بۆتە پلانێکی عادەتی ولە گەڵ زەمەندا دوپات و سێ پات دەبنەوە!! بەم نەخشانەیە، کە تاغوتان نایەڵن گەل بایەخ بە کاروبارە گشتیەکانی ژیانی بدات، ناهێڵن گەل چاوی بکرێتەوەو بەدوو حەقیقەتی هەڵوێستەکاندا بچێتەوەو، ڕەفتارەکان هەڵسەنگێنێت وناوەرۆکیانی بە ماهییەتی خۆیانەوە بۆ دەربکەوێت، چونکە ئاشکرایە ئەگەر جەماوەری هەر میللەتێك خۆی بە دووی حەقیقەتی شتەکاندا چوو، خۆی چووە بنج و بناوانی مەسەلەکان، خۆی سەریلە کێشەکان دەرکرد؛ دژوارییەکی گەورە بۆ تاغوتان دەخولقێنێت.. دژواری لەسەر ڕێبازو سیاسەتمەدارەکان، چونکە درۆو دەلەسەکان ئاشکرا دەبن. دەردەکەوێت، کە ئەم تاغوتانە میللەتەکەیان نوقمی دەریای وەهم وخەیاڵ پلاوکرد بوو.. ئەم خەڵکەیان لە ئەڵقەیەکی بۆشدا هەڵدەسوڕاند!جا کە تاغوتان هەست دەکەن وا زەمینەی ژێر پێیان دەجمێت، کورسیەکانیان وادەلەقێن، کە دەبینن جەماوەر ڕابووە وهۆشی هاتوەتەوە، لە ترسی بون وقەوارەو دەسەڵاتە فشەڵەکەی خۆیان، قسەی نەرم و نییان لەگەڵ خەڵکی دەکەن و دەڵێن: بەلێ، ئەو کێشانە هەن.. بەلام با بزانین ڕای گەلەکەمان چیەو چی بە چارەسەر دەزانن؟!! (قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُ إِنَّ هَذَا لَسَاحِرٌ عَلِيمٌ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ) ٢٦ الشعراء/٣٤ واتە: فیرعەون بە حاشیەو دەست وپێوەندەکەی دەوروپشتی خۆی ووت: ئەم پیاوە(سیدنا موسا) جادوگەرێکی زۆر شارەزایەو دەیەوێت بە سیحرەکەی خۆی ئێوە لە ولاتی خۆتان وەدەرنێت! جا ئێوە فەرمانتان بەچییە؟

ئــەوە لــە چ زەمانێکــەوە تــاغوت وای لێ هــاتووە فــەرمان لــە شــوێنکەوتوو وەرگرێت؟ ئەوشوێنکەوتووە گەلۆرو گەمبۆلانەی کڕنوشی پەرستن بــۆ ئــەو دەبــەن؟ ئەمە مەکری سیاسەتمەدارانی جاهیلیە، کە هەر کات هەستیان بە تەوژمی دژواری کرد، پەنا دەبەنەوە بەر گەل! ئەو گەلەی تا دوێنێ لەژێر پۆستاڵی خۆیــان دادەنــا، ئەوەتا ئەمڕۆ خۆ وا نیــشان دەدەن، کــە نــەك پرســوڕای پێدەکــەن، داوای فــەرمان کردنیشی لێ دەکەن، با گەل فەرمان بدات جەنابی تاغوتیش جێبــەجێی دەکــات!! ئایا ئەمــە وایــە؟! ئەمــە ماقوڵــە؟! تــاغوت وازی لــە ڕای دیکتاتۆریــەتی خــۆی هێناوەو، چاوەڕوانی مەشورەتی (پیاوماقوڵ) انی جەماوەرە!!

ئەم مناوەرەیەش تا ماوەیەکە! تــا ئــەو زەمانــەی لــەکات وشــوێنە دژوارەکــە دەردەچن، تا ئەو زەمانەی ڕەشەبای قینی مەحرومان کپ دەبێتەوە.. ئەوجا دیسان دەکەونەوە وێزەی خەلکی!! چونکە ئەم تاغوتانە هەر هــەمان دیکتــاتۆری دڕنــدەو ئاغای ڕقن و دەسەلاتدارە سپلەکەی پێشون!

## دین شۆڕشە!

ئیعلان کردنی خوایەتی خوای پەروەردگاری جیهانیان، ئــیعلان کردنــی ئــازادی مرۆڤە. ئازادکردنێتی لە ملکەچی و گوێڕایەڵی وشــوێنکەوتن وپەرســتنی غــەیری خوا.. ئازادکردنی لە یاساو ڕێساکانی مرۆڤ.. لە خوونەریت وداب ورەسمی مــرۆڤ.. لە حوکمی مرۆڤ.. چونکە ئیعلان کردنــی خوایــەتی خــوای پــەروەردگاربۆ هــەموو جیهان؛ لەگەڵ ملکەچی و گوێڕایەڵی و بەندایەتی بۆ غەیری خوای گەورە، لە یــەك دڵ ودەرون و ژێریدا کۆ نابنەوە.. ئــەوی ئازادانــە ئیعلانــی خوایــەتی و حــاکمێتی خوای پەروەردگار دەکات، ناکەوێتەوە ژێر حاکمێتی غەیری شــەریعەتەکەی خــوای گەورە.. ئەو کەسانەی هێشتا وان لەژێر سایەی یاساو ڕێسای مرۆڤی وەکو خۆیــان واش دەزانن هەر موسڵمان ماون، ئەوانە کە خوایەتیەکی تری غــەیری خوایــەتی

خوای پەروەردگاریان بە سەرەوەیە و وا دەزانن هەر موسڵمانن! وانیە.. ئەوە هەر گومانی خۆیانە و بەس، ئەوانەی لەژێر سایەی حوکمی حاکمێتی غەیری خوای پەروەردگاردان، لە دینی پاشا (الملك) دان! نەك لە دینی خوای گەورە دا[١]..

تاغوتەکان خۆیان پەی بەم نهێنییە دەبەن و دەشزانن ئەم هەڵوێستە چەند دژوارو کاریگەرە لە سەر بانگەوازی خوایی و خواویستان. بۆیە کابرای عەرەبی - هەر بە سروشت و سەلیقەی دەشتەکی خۆی- کە گوێی لێ بوو پێغەمبەر (ﷺ) خەڵکی بانگ دەکرد بۆ شایەتمان (**لااله الا الله محمد رسول الله**) ووتی: (**هذا أمْرٌ تَكْرَهُهُ الْمُلُوكُ**) واتە: ئەمە کارێکە پاشاکان دەیبوغزێن.. عەرەبێکی تریش هەر بە سەر سروشت وسەلیقەی خۆی ووتی: (**إذنْ تُحَارِبُكَ الْعَرَبُ والْعَجَمُ**) واتە: جا کەوابوو عەرەب وعەجەم، جەنگ دژت بەرپا دەکەن.. ئەم دوو عەرەبە لە ماناو واتای زمانەکەی خۆیان تێدەگەیشتن.. دەیزانی **لااله الاالله** شۆڕشێکە دژی ئەو کەسانەی، کە بە شەریعەتی خوا حوکم ناکەن، جا عەرەب بن، یان غەیری عەرەب.. عەقیدەو جیددیەت و کاریگەری شایەتمان لە هەست وهۆشیاندا زۆر قوڵ ڕۆ چوو بوو.. دەیان زانی، کە ممکین نیەنە لە یەك دڵ و دەروندا و، نە لە یەك ناوچەی سەر زەویدا(**لااله الاالله**) و حوکمی غەیری خوای گەورە پێکەوە ناسازێن.. چونکە ئەستەمە ئەو دوو دیدو بەرنامەیە پێکەوە هەڵکەن! نابێ و ناشێ وناکرێ خوای تر لە گەڵ خوای پەروەردگاردا دابنرێت. کەس لەو زەمانەدا واحاڵی نەبوو بوو وەکو موسڵمانانی ئەم زەمانە، کە لاف وگەزافی موسڵمانیش لێ دەدن، وا لێڵ حاڵی بوون، ئەوان وەکو موسوڵمانانی ئەم زەمانەی ئێمە ئاوا سەتحی و کزۆڵ وساویلکە لە واتای ئەم دینە تێ نەگەیشتبوون! کاتێ ئەو خەڵکەغەیری خوا دەپەرستن، ئیتر دڵ ودەرونیان

---

[١] بێگومان مەبەستی سەیید ـ رحمه الله ـ ئەو کەسانەن، کە بە ئازادی و سەربەستی خۆیان یاساو رێساو حاکمێتی غەیری خوای گەورەیان پێ قبوڵەو پێی رازی بوون و وەریان گرتووە و ملکەچانەش رایدەپەرێنن. حەتمەن ئەوانە لە بازنەی ئیسلامدا نەماون.. ئەمما ئەوانەی ناچار (موکرەهـ) کراون و موستەزعەفن و هەوڵی گۆڕینیشی دەدەن، یان ناتوانن بیگۆڕن و هیجرەتیشیان بۆ ناکرێت، ئەوانە خاوەن بەهانەی شەرعین و عوزریان هەیە..

لە سەر زەلیلی ڕادێت! خوای گەورەش دەیەوێت خواپەرستی لە سەر ڕێـزو عیـزەت دابمەزرێت.. کاتێ خەڵکی، غەیری خوای گەورە دەپەرستن، ژیانیان لە سەر ستەم و دەسدرێژی دادەمەزرێت! خـوای گـەورەش نایـەوێ ڕەنجـی دینـداران لـە پەرسـتنی غەیری خوای گەورەدا بێ هودەو بەهەدەر بـڕوات.. نایـەوێت وزەی جـەماوەر، لـە تەپڵ و دەهوڵ کوتی وزوڕنا ژەنیدا سەرف بێـت، کـە لەگـەڵ سـەمای مەسـتانەدا بەدوای خوا درۆزنەکاندا ئەنجام دەدرێت.. نایەوێت فوی هـەڕاڵی (غـرور)و خۆبـەزل زانین بە لوتی تاغوتەکاندا بکرێت، تا دەگەنە ئەو پلەیەی، کەوا حاڵی بکرێن، کـە فیعلەن خوان و مافی پەرستن و شوێن کـەوتنیان لەسـەر جـەماوەر هەیـە، چـونکە ئەمانە خۆیان لاوازن، بچوکن، گرگنن، کەم وکورت وبێ دەسەڵاتن! ئیتر چۆن جێـی خوای گەورەو کاربـەجێ دەگرنـەوەو مـافی شـەرعیانەی ئـەو زەوت دەکـەن؟! ئـەم تاغوتانـە.. ئـەم درۆزنانـە.. جـەماوەرە چەواشـە کراوەکـە وا ڕا دەهێـنن، تـا بەدەوریاندا بێن و بـچن.. شـەو ڕۆژ لـە هەلەکەسـەمادا بـن ولـە دەوری سـەریان گـەڕێن، بۆنـاوو سـومعەو نازنـاوی فـشەو قەبـەیان! زێوانـە زوڕنـا ژەنـەکانی دەورو پشتیشیان زیاتر بەشان وباهویاندا هەڵدەدەن.. مەدحیان دەکەن.. بە ڕەفتـارو کاروکردەوەی بەدو ناپاکیاندا هەڵ دەدەن.. سرودیان بۆ دەڵێن.. تا ئـەو جـەماوەرە وای لێ دێت بێ هۆشانە لەدەوری تاغوت دەگەڕێ، ئەو حاشیەو زێوانە هامانیانە، کە ئاوا خەرمانەی زێڕینی دەوری مانگی چواردە دەکەن بەبـەر ئەمانـدا و، پـێ و قەدەمیان لەبەر چاوی میللەتبۆ فەڕو پیرۆزی ماچ دەکەن وسەڵاواتیان لـە دیـار لێ دەدەن.. مافی بونی جەماوەر بە وزەو وورەو ڕەمزیانەوەدەکەنە سوتەمەنی مانـەوەی ئەوان و بۆیانیان دەتوێننـەوە.. تـا هـەر هـەموو دەبنـە دەروێـشیان.. دەروێـشی فریودراو ودەسخەڕۆ.. دەروێشی ماندوو هـیلاك و ڕەنـج بەخەسـار.. ئـیتر گـەل و میللەتی داماو، غەیری ئەوان کەسی تر نابینێت.. خۆشی لە دەستاڕی دەستدرێژی وتوغیـانی خۆیـدا هـەر دەهاڕێـت! خۆشـی ڕەنجێکـی وا ئاڕاسـتە کـراوی پـێ نامێنێتەوە، کـە لـە دنیـادا بەرهـەمێکی بـۆ ئاسـودەیی و بەختـەوەری خـۆی و

کۆمەڵگەکەی پێ بمێنێتەوە.. بەڵکو هەر ئاوا.. نەوە بە نەوە.. جەنجەڕی گێرە رادەکێشن و، هەر لە ناسۆرو زەحمەتدا هەر یەك بە جۆرێك هەڵپە دەکاتحاشیەو جەماوەرەکە بێگومان زەلیلتر دەبن، چونکە بونییان نەماوەو چاوەڕوانی کەرەمی تاغوتن! چاوەڕوانن جارجارە تاغوت مستێك کا، کەرتە نانێك! بۆ ژیانێکی کولەمەرگی بکات بەدەمیانەوە.. نەبادا یەکجاری بکەون! ئەم جەنجەڕو دەستاڕو هاڕینەش هەر بەردەوامە، تا گۆڕانکاری کۆمەڵگەکە بەرە و خواویستی دێت و هەستی گۆڕان و گۆڕین لە ناخی تاك و بەرپرسی گۆڕان و گۆڕین لە ناو ڕیزی کۆمەڵگەکەوە دەست پێ دەکات.. خوای پەروەردگار سروشتی ئەم مرۆڤە دەناسێت، چونکە خۆی دروستی کردووە، دەشزانێت سنوری وزەو توانای، تا کوێیە. بۆیە شتێکی وای لەم دینەی، کە بۆ هەموو کۆمەڵگەی مرۆڤی ناردووە، لەسەر فەرز نەکردووە قورس بێت وبۆیان ئەنجام نەدرێت.. هەرچی فەرز کردووە، جێبەجێ کردنیشی ئاسانە.. موسوڵمانان ئەگەر ویستیان بونیان هەبێت وجیددی بن لە ویستەکەیاندا، دەتوانن هەموو دینەکە وەرگرن وهەموشی بچەسپێنن.. ئەگەر سروشتیان ساغ وپاك و هاوسەنگ بێت ونیەتیان وابێت، کە خوای گەورە لە خۆ ڕازی کەن، دەتوانن سەر لە نوێ ئەم دینە خواییە بهێننەوە.. ڕونکردنەوەو بەرچاو خستنەوەی ئەم حەقیقەتە، گرنگییەکی زۆری هەیە. گرنگە بۆ ڕوبەڕو بونەوەکانی ڕۆژانەی شەڕخوازی جاهیلیەت، کە تاغوتەکان سەرپەرشتی دەکەن. ئەوان دەیانەوێت مرۆڤ لە ژیانێکی بەرەڵایی ئاژەڵیدا بژی.. دەیانەوێت مرۆڤ وەکو سەرەمێکوتە لە زەلکاوێکدا بژی.. گوایە (ئەمە واقیعە، واقیع!)سروشت وسنوور، پێناسەیەکی ئایدیالییەو لە واقیعی سەرزەمینی ئەمڕۆدا ناچەسپێت!! دەڵێن تا یەکێك دەتوانێت دیندار بێت، سەد کەس لێی هەڵدێن! بەڵام ئەمە پاڵانتەو گەزافە.. هەم درۆیە، هەم پڕوپاگەندەی فریودانە.. هەم بانگەشەیەکی نەزانانەشە.. ئەو کەسەی وا دەڵێ مرۆڤی نەناسیووە.. ئەو سیفەتانەش، کە لە مرۆڤدا هەن، کە خوای گەورە شارەزایانە، ئەو هەموو جۆرە تەبیعەتە تەنها خوای

گەورە دەیانزانێت چین وچۆنن؟ مرۆڤ خۆی پەییان پێ نابات، خـوای گـەورە خـۆی مرۆڤی دروست کردووە، دەزانێ چۆنی دروست کـردووەو، زۆرچاکیـشی دەناسـێت، بۆیە تەکلیفی ئەو دینداریەی بـەو شـێوە لێکـردووە.. خـوای گـەورە و میهرەبـان دەزانێ، کە ئەم مرۆڤە دەتوانێت ئەم داواکاریانەی دین راپەڕێنێت.. خـۆ دیـن بـۆ کۆمەڵە خەڵکێکی تایبەت نەهاتووە.. بەڵام، نا.. مەسەلەکە هەر ویست وئـیرادەو عەزیمەتە.. ویست و ئیرادەی مرۆڤی ئاسـاییە، پاشـان نیـەتی پـاکی خواویـستیە، ئینجا کەوتنە رێ.. ئینجا هاوکاری خـوای گەورەیـە بـە ڕێنمـایی و پـشتگیری و پاداشت.. ‌(وَلَو أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيرَاً لَهُمْ واشَدّ تثبيتاً. وإذا لآتيناهُم مِـنْ لَدُنَّا أجْرَاً عظيماً ولَهَدَينَاهُم صـرَاطاً مُـسْتَقِيماً) ٤ النـسـاء / ٦٦ واتـە: ئەگـەر ئـەوان ئەوەیان بکردایە، کە ئامۆژگاری کرابون، چاکتر بوو بۆیان. زیاتر جێگیرو جـێ پـێ قایم دەبون و ئێمەش لەلایەن خۆمانەوە پاداشتی زۆر گەورەترمان دەدانەوەو، زیاتر ڕێنمایمان بۆ ڕێگای ڕاست دەکردن.. کـەوابوو هـەر لەگـەڵ دەسـت پـێ کردنەکـە، یارمەتی خوای گەورەش مسۆگەرە.. ئینجا ڕاگری و مانەوەو جێ پێ قـایم بـوون. ئینجا بەردەوامی و پشوو درێژی و هیوا ڕونـی.. ئینجـا پاداشـت وخـەڵات.. پـێ هەڵگرتن لەم سەرەتا ڕاستەوە، حەتمەن خاوەنەکەی دەگەیێنێتە ڕێنمایی خوایی..

(وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطاً مُسْتَقِيماً) صدق الله العظيم

# بەندی چوارەم: بزاڤی دین

جارجارە گومانێکی فێڵاوی، یان خۆزگەیەکی بە گلەیی و گازاندەی گێلانـە بـە شێوەی پرسیار دێتە گۆڕێ، کە (خوایە، بۆچی وا ڕویدا؟! بۆچی حـەق ئـاوا توشـی نەهامەتی هات و باتڵیش ئاوا بۆی دەرچوو؟! بۆچی ئەهلی حەق ئاوا دوچاری بەڵاو موسیبەت دێن و ئەهلی باتڵیش، نەك هەر قوتار دەبن، زاڵیش دەبن؟!! بۆچی هەر کاتێك و لە هەر شوێنێك حەق و باتڵ دەبەرێك ڕادەچن، باتڵەکـە سـەردەکەوێت؟!! مەگەر ئەم حەقە هەر ئەوە نییە، کە دەبێت حەتمەن هەمیشە سەرکەوتن بەدەسـت بهێنێت؟! ئەدی بۆچی لەوەتای هەین! جەولەی خۆبادان، شان هەڵتەکاندن هـەر بـە نسیبی باتڵ دەبێت و، دڵ و دەرون و ئیرادەی حەقخوازانیش توشی دەیـان نەکـسەو بومەلەرزەی دەرونی دەبن؟!!.

خۆ یاوەرانی پێغەمبـەریش (ﷺ) هەنـدێکیان ئەمـەیان لـە غـەزای ئوحـوددا فەرمووبوو: (قُلْتُمْ أَنَّى هَـذَا)؟! ٣ آل عمران/١٦٥ واتە: خوایە ئەمە چۆن بوو؟ بەڵام خوای گەورە گورڕو تین لە ئیرادە لاوازو جەستە ماندوو دڵە بێ تاقەتەکان دەکاتەوەو لەو وەسوەسانە پاکیان دەکاتەوە، بەوەی کە ڕێـسای کـارو گۆڕانکـاری و ئیـدارەی خوایەتی، دوێنێ وئەمڕۆو سبەی، خۆیان بۆ ڕون دەکاتەوە. بۆیان دەردەخـات، کـە کاتێك باتڵ لە زەمان و سەردەمێکدا گـرەو دەباتـەوەو، لـە جەولەیـەکی ڕو بـەڕو بونەوەدا بە زاڵ و هەڕاڵییەوە بۆی دەردەچێت و فشەو فیشاڵ دەنوێنێت، مانـای وا نییە، کە خوای گەورە لێی گەڕاوەو هەقی بەسەریەوە نەماوە!! ئەوە ناگەێنێت، کە هێزی باتڵ وای لێ هـاتووە، هـیچ هێزێـك دەرەقـەتی نایـەت و هـەموو سـاتێك دەتوانێت ئاوا سەرکەوێت و، حەق دوچاری زیان وژان و ناسۆری شکـستی بکـات.. هەروەکو چۆن، کە حەقیش لەو جەولەدا شکستی هێناوەو کزۆڵ و بێ تاقەت و بـێ ناز کەوتووە، مانای وا نییە، کە خـوای گـەورە پـشتی تـێ کـردووەو فەرامۆشـی کردووەو، لێگەڕاوە باتڵ بە کەیفی خۆی گورزی لێـدا، تـا دەتاسـێت و هەناسـەی

لەبەر دەبڕێت!! نەخێر، ئەمە ویست و حیکمەتی خوای گەورەو کاربەجێیە، هەر دوو هەڵوێستەکە هەر بە گوێرەی قەدەری خوا بون، حیکمەتی خوای گەورە وای دیاری کر، کە بوارێك بۆ باتڵ بڕەخسێنێت، تا ماهییەتی خۆی بە تەواوی بخاتە ڕوو، تا هەرچی ناشیرینە لێوەی دەرکەوێت، تا کام تاوانەی ناقۆڵاو دزێوە لەبەر چاوی خەڵکی بیکات، تا کۆڵی فەسادو خراپەکاری قورستر کات، تا دوایی بە ژانترین سزای بەسەردا بدرێت و خەڵکی بڵێن: ئۆخەی، بەڕاستی موستەحەققە!

دیسان هەر حیکمەتی خوای گەورەی، کە دەیەوێت حەقیش دوچاری تاقی کردنەوە بکات.. تا پاك و پیس لێك جودا ببنەوە، تا پاداشتی ئەوانەی بەردەوام بون وسور بوون لەسەر ڕێ و سور بون لەسەر هەڵوێستی ئیماندارانەی خۆیان، زۆرترو گرانترو گەورەتر بێت..

ئەنجامی کۆتایی، هەر بردنەوەی حەق و دۆڕاندنی باتڵە، هەم لێرە، هەم لەوێ.. خوای گەورە دەیەوێت ئەم جەنگ و ململانێیەی حەق و باتڵ بکات بە هی خۆی. بیکاتە کێشەی خۆی.

ئەو گومان وگرێ وگۆڵەش، کە لە دڵ و دەرونی هەندێکدا پەیدا بووە، خوای گەورە بە لوتفی خۆی دەیڕەوێنێتەوە. چونکە گومانی جاهیلییانەن و لە جێی خۆیدا نین.. کزی باوەڕو نەفەسی کورت و تینی دەرەکی دروستی کردون. لەوە هاتون، کە خاوەن ئەو دەرونە لەرزۆك و باوەڕە کزانە، کە دوژمنانی خواو بەرهەڵستکارانی حەق دەبینن، نەك هەر توشی نەهامەتی و زیان نەهاتون، بەڵکو ئەوەتا دەبینرێن گرەویان بردۆتەوەو بونەتە خاوەن هێزو دەسەڵات و سەروەری و سامان! ئەمەش خۆی بۆ خۆی دڵە ڕاوکەیەکی تر لە دڵ و دەرونی خەڵکی دەوروبەریاندا دروست دەکات و، باوەڕ لاوازەکان بەرامبەر خوای گەورە دەخاتە گومانی خراپەوە! وا دەزانن، کە خوای گەورە وازی لەم دەبەرێك ڕاچون و ململانێیەی نێوان حەق و باتڵ هێناوەو حەقی، بەسەر هیچ لایەنێکیانەوە نەماوەو تەدەخولی ئەم جەنگە ناڕەوایە ناکات!! بەڵکو لێ دەگەڕێت باتڵی ناپەسەند ئاوا

حەق تێکشکێنێت و بیبەزێنێت و، خوای گەورەش هەر چەندە بە توانـاو بەبەزەییشە دەستێك ناداتە باڵی حەقخوازان، تـا هاوکێشەکە بگۆڕێت!! یـان وا حاڵی دەبن، کە باتڵ لەسەر حەقە، بۆیە ئاوا خوای گەورە ڕێی داوە، نەك هەر بێتە کایەوە، بەڵکو زاڵیش بێت وگەشە وتەشەنەش بکـات. یـان وا دەزانـن سروشـتی ململانێکە وایە، کە باتڵ گرەوی خۆی لەم دنیایەدا حەتمەن دەباتەوەو ژیـانی دنیـا هی ئەوە، بۆیە هەر زاڵ دەبێت! بـواری سـەرکەوتنی حـەقیش ئێرە نییـە! سـەر زەمینی ئەم دنیایە نییە! پاشان وا دەزانن هاوکێشەی ئەم ناکۆکیە، هەر دەبێ لـەم دنیایەدا ئاوا لاسەنگ بێت! هەر دەبێ بوار بـۆ جـەللادو زاڵـم و سـتەمکاران والآ بێت، تا زیاتر بە زەلکاوی فەسادو خراپەکاریـدا ڕۆ دەچـن، تـا کـوفرو بـێ دیـنی خۆیان زیاتر ئاشکرا دەکەن، تا ئیتر قەناعەتی وایان لا دروست دەبێـت، کـە هـەر خۆیان ڕاست و ڕەواو دادپەروەرن، هەر خۆیان ئازاو بەهێزو نەفەس درێـژن و، هـیچ هێزێکی خواویستی ناتوانێت لە ڕێیاندا بوەستێتەوە!!

ئەمانە هەموی وەهم وخە یاڵن.. بە هەڵەدا چونن.. خراپ تێگەیشتنن.. گومـانی خراپن، کە بە خوای گەورە دەبرێن.. ئەمانە هیچیان لە جێی خۆیاندا نین..

ئەوەتا خوای گەورە بە حەزدرەوە بە کافرەکان ڕادەگەیێنێت، کە گومانی وا بەد، بە خوای زاناو کاربەجێ نەبەن.. چونکە خـوای گـەوردو بەدەسـەڵات، لەگـەڵ ئـەو هەموو کوفرو بێ دینیەشدا، کە ئەوان دەیکەن، هێشتا تێکی نەشکاندون و لەناوی نەبردون، ئەو دەسەڵات و پلەو سـامانەی خـوای گـەورە پێـی بەخـشیون، مـادەی تاقیکردنەوەو مایەی بەدبەختی و سەرئێشەیە، لە مەدای دوردا دەردەکـەوێتا کـە ئەوە زنجیری جلەوە! پەتی هەوسارەو گوریسی بەستنەوەیە بە ئەنقەست بۆیـان شـل کراوە!! ڕۆژی خۆی دێت لە لا لغاوەیان توند بکرێتەوەو سەریانی پێـوە بادرێـت و، پێیانی پێوە ببەسترێتەوە و لە جێی خۆیان مۆڵ درێـن و بەشـەتەکی ببەسـترێنەوە: (وَلا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ أَنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ خَيْرٌ لانفُسِهِمْ إِنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ لِيَـزْدَادُواْ إِثْمًـا وَلَهُـمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ) ٣ آل عمران/١٧٨ واتە: ئەوانەی کافر بون، باوا نەزانن ئـەوەی پێمـان

بەخشیون خێرو فەڕەو هاتۆتە ڕێیان، نا، ئەمە هەر هەموی بۆ ئەوەیە، کە تاوانی تری پێ زیاد کەن و گوناحی پێ کەڵەکە کەن، دواییش سزای بەژان دەدرێن!!

بەڵاو موسیبەت و نەبونی و چەرمەسەری، گێرەو کێشە، تاقیکردنەوەی خوای گەورەن، خوای گەورە بە زانستی وئاگایی حیکمەتی خۆی و، بۆ سودی خودی موسوڵمان دەیهێنێتە سەر ڕێی ئەو کەسانەی چاکن. خۆی دەیەوێت توشی چاکەی تریان کات. خوای گەورە، کە دۆستە پیاوچاکە خۆشەویستەکانی خۆی دوچاری ئەم هەموو کەندو کۆسپ و هەڵدێرانە دەکات، بۆ ئەوەیە خێری تریان بۆ زەخیرە کات، کە ئەو پاك وسەرڕاست و ساڵحانەی خۆی، موبتەلای ئەو کێشە سەختانە دەکات، لە سودو قازانجی ئەو پیاوچاکانە خۆیانە، خۆ خوای گەورە، کە ئەوان لە خۆشەویستی ئەمدا دەیپەرستن، حاشا وەلیللا ئەوە لەوی بە بەزەیی و میهرەبان ناوەشێتەوە، لە جێی ئەو پەرستن وسوپاسگوزارییە، ئەم ئیهمالیان کات، ئەم لە بێ بایەخیدا لێیان گەڕێ بە دەست کافرە ڕقنەکانەوە بە زەلیلی بناڵێنن!! نا، هەرگیزاو هەرگیز ئەمە لە دادی خوایی ناوەشێتەوە، بەڵام بە تەئکید ئەم کۆسپانەی سەر ڕێ سروشتین و ئاسایین و هەر دێنە ڕێی پیاوچاکان و دۆستانی خوا..

باوەڕو دینداری‌و خۆشەویستی خوا، ئاوا لە دڵو دەروندا دەبێ دابمەزرێن، ڕەگ‌و ڕیشاڵی حەقەیقەتەکان دەبێ ئاوا سادە، بەڵام ڕەسەن‌و پەسەن لە بیرو ژیری موسوڵماندا ڕۆ چن.. دەبێ دیدو بۆچوونی ئیسلامی ئاوا بەو ڕون وئاشکرایی‌و ڕاست و ڕەوانیە خۆ بگرێت ونەش ونما بکات، چونکە هەر ئاواش دێتە بەر!! دەبێ موسوڵمان ئەوەی لا بەڵگەنەویست بێ، کە هەموو گۆڕانکاریەکانی بون و ژین بە ویست وزانست وتوانای خوای گەورەو، بە پێی حیکمەتی ڕەهای ئەو ڕو دەدەن. سۆزو خۆشەویستی خوای گەورە بەرامبەر موسوڵمانان وا بوو، کە ڕیزەکانیان لەو دوروانە پاك بکەنەوە، کە خۆیان خزاندۆتە ناو ڕیزەکانیانەوە، خوای گەورە دەیویست بە هۆی هەڵس وکەوت و هەڵوێستی ناپەسەندی ئەوانەوە هەمویان موبتەلا کات، هەمویان تاقی کاتەوە، تا خولاسەکەیان بە پاڵفتە کراوی ئامادە

کات بۆ هەڵگرتنی پەیامەکەی.. دەبویست ڕاست و چەوتەکان لێك هەڵاوێرێت، ئینجا سەرڕاستەکان، کە لەبەر چاوی هەموان سەلماندیان، کە شایانی خەڵاتی خواین، بە هێزو هۆشەوە بخاتە سەر ڕاستە شەقامی بانگەوازەکەی: (مَّا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىَ يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ) ٣ آل عمران/ ١٧٩ واتە: نەدەکرا خوای گەورە لە موسوڵمانە پاکەکان گەڕێ، هەر لەو بارودۆخەتانەدا بمێننەوە، کە هەموتانی تێدا بون، نا، هەر دەبوو چەپەڵ و ناهەموارو دەغەڵەکان لە پاك و سەرڕاستەکان جویێ کاتەوە..

خوای گەورە ناهێڵێت ڕیزی موسوڵمانان ببێتە سەرەنگوێلکی خڵتەو پلتەی دەغەڵان، تا نە نەوان و، نە هیچ دەرون لاوازێکی تر نەتوانن بە لاف و گەزاف، باوەڕو دینداری خۆیانی تێدا مەلاس دەن.. تا کەسی دووڕوو نەتوانێت خۆی دەم بە وێردو سەلاوات نیشانداو، دڵیشی بیابانی بێرونی وشکە سالی بێت! نە تۆوی ئیمانی بەر کەوتووەو، نە نەمامی ئیسلامەتیش چەکەرەی تێدا کردووە!!

خوای گەورە دەیەوێت ئەم ئوممەتە موسوڵمانە ڕۆڵێکی گەردونی گەورە ببینێت، دەیەوێت بەرنامەو پەیام و بانگەوازی خوایی هەڵگرێت، تا لە واقیعێکی زیندوی سەر زەمیندا، سیستمێکی نویێ وتایبەت بهێنێتە کایەوە. ئەم ڕۆڵە گرنگەش وا دەخوازێت، کە ئەندامانی ئوممەتەکە لە خۆ بورا بن، خۆیان چاك و ڕیزیان پاك دارشتبێت، خۆیان بەرێزو ڕیزیان بەهێزو پێز بێت، نابێ لە ناخیاندا ئاسەواری خۆویستیان بە هیچ شێوەیەك تێدا ما بێت، یان لە ڕیزیاندا نابێت بە هیچ کلۆجێك دەمارگیری و خەت خەتێن و پەت پەتێنی بۆ هیچ لایەن و کەس و تیرەو هۆزێك تێدا بێت.. ئەمەش هەمو ئەوە دەخوازێت، کە ڕیزەکانیان بە تاقی کردنەوە لە بێژەنگ بدرێت و بە میحنەت داتەکێنرێن! تا چەکوشی ناسۆرو میحنەتو غەریبی ڕێ، وەك سنگ بیان چەقێنێت، تا خۆلێککێشانەوەو تەوەزەلیو نەرمەلیقەیی سێبەرنشینی ودنیاویستی موسوڵمانەکان لادەکەوێتو، دڕك وداڵو دەغەڵی دوڕوەکان دەکەونو، چیدی کۆڵی ئەم بانگەوازەیان پێوە قورستر ناکەن،

ئـا ئـەم موسـوڵمانە حـازرخۆرو دووڕووە مرۆرانـە، چـیدی ڕەوتـی ئـەم کاروانـە خواییەیان نەشێوێنن و خۆی پێوە هەڵنەڕۆسکێنو هەنگاوەکانی سست کەن!، نا، بإ لەژێر تین و فشاری میحنەتدا خشتە ڕزیوو داخوراوەکـان بکەونـە خـوارێ، دیـوارو سەربانی ئەم ئیسلامەتییە لەسەر ئەو دەروون بەزیوو نـاو ڕزیـوو غـیرەت پواوانـە بنیات نانرێت..

قورئان بە نووری ڕوناکی خـۆی، تیـشك دەهاوێتـە نـاو پـێچ وپـەناکانی دڵ و دەروون، ئـەو گۆشـانە دەردەخـات، کـە دەبـە بـوون، ڕزیـوون، کـون وکەلەبـەرو قوژبنەکان نیشان دەدات، کە ڕۆحی دووڕوویی و بەزین دەیکەنە کولانـەو پەناگـەی خۆ حەشار دان!

قورئان بەرنامەی ئەم دینەی دارِشتووەو، مەشخەڵو بەردەبازی ڕێگاکەشـی بـۆ هەڵگرانی پەیامی ئیسلام دیاری کردووە، کردوونـی بـە مەشـخەڵی نـەگۆڕی ڕێو باسی کردوون، لەوانە:

## ١- ئەم دینە سیحری نییە:

لە شێوازو سروشتی ئەم دینەدا، کە بەرنامـەی خوایـەو بـۆ مرۆڤـی نـاردووە، ڕاستیەکی سەرەتایی زۆر ئاسان و سادە هەیە زۆر جارو زۆر کەس لـەبیری دەکـەن، یان گوێی نادەنێ، یان وەکو بەڵگە نەویـستێك نایخەنـەوە پـێش چـاو.. پـەی پـێ نەبردنی، یان بیر چوونەوەی، یان بە هەندو بایەخ وەرنەگرتنی ئەو ڕاستییە، هەڵەی زۆر دژوارو کوشندەی لێوە دروست دەبێت، کە دیدو بۆچوونەکان بەرامبـەر خـودی دینەکە لێڵو تەم ومژاوی دەکەن، چ لە تێگەیشتنی ڕاسـتیەکانی، چ لـە واقیعیـە مێژوییەکەی، کە لەگەڵ ژیانی مرۆڤایەتیـدا بـە درێـژایی زەمـەنێکی دوورو درێـژ ڕەفتارو مامەڵەی کردووە، ئەو لێڵ دیتنەش کارتێکردنی خراپـی لێ دەبێتـەوە، چ لە لێکۆڵینەوەو تێگەیشتنی دوێنێ، چ لە هی ئـەمڕۆی، یـان هـی سـبەی.. ئـەو ڕاستیەش ئەوەیە، کە: هەنـدێکمان وا لـەم دینـە چـاوەڕوان دەکـەین، کـە مـادام

لەلایەن خوای گەورەو بەدەسەڵاتەوە هاتووەو، ئەو خۆی بۆ مرۆڤایەتی ناردووە، دەبێت بە شێوەیەکی ناناسایی و سیحری و دوور لە ڕێسای گەردونی و گۆڕانکاری مرۆڤ کار بکات، بە مانایەکی لاوەکی واتە هەر دەبێ خوای گەورە بۆمانی سەرخات!! خۆیان وا حاڵی کردووە، کە نابێت سروشتی مرۆڤ و مرۆڤایەتی، کارتێکردنی لە سەرخستن وسەرنەخستنیدا هەبێت! تاقەت وتوانای شوێن کەوتوان و واقیعی ماددی قۆناغەکانی ژیان وکەش وبارودۆخ، نابێت ببنە هۆی سەرکەوتن، یان شکستی ئەم دینە!! جا ئەم کەسانە، کە دەبینن وا نییەو لە خۆوە دینەکە زاڵ نابێت، بەڵکو دوای خوای گەورە هەر ئیعتیماد دەکاتەوە سەر کارو کاردانەوەی وزەو تواناو کارامەیی مرۆڤەکان وسنوری واقیعی ژیانیان وکارو کارتێکردنی قۆناغەکانی بانگەوازەکەیان، باوەڕیان لەق و دیدیان لێڵ ودەرونیان ڕەشبین دەبێت!!

ئەم دوو لایەنە هۆکارەش (وزەو توانای مرۆڤەکان و سنوری واقیع و دەرچەکانی) لە بڵاو بونەوەی بانگەوازەکە و وەڵامدانەوەی خەڵکەکە بۆی کاریگەرن، جا جاری وا هەیە کاریگەرییەکە خراپە، واتە سلبی (نێگەتیڤ) ە و جاری واش هەیە چاکە، واتە ئیجابی (پۆزەتیڤ) ە. جاری وا هەیە خەڵکەکە هێزی ڕاکێشانی هەواو هەوەس و حەزو ئارەزووەکانیان زیاتر وەك لە بانگەوازە خواییەکە کەمەند کێشیان دەکات! چ لەوەی بە تەواوی بێنە ناوی و بۆی دابڕێن، چ بەوەی هاتوونەتە ناوی، بەڵام دینداریەکەیان شل گرتووەو لە تێگەیشتنیدا جیددی نین! یان لە کار بۆ کردن وهەڵگرتنی بانگەوازەکەدا، خۆ بە بەرپرس نازانن، یان وا نازانن لە پاراستنی بەرپرسن! جا کە ئەو دیاردەیەش دەبینن (تین و فشاری جاهیلییەت وشکستی حەقخوازان) ئیدی دووچاری بێ ئومێدی دێن. چونکە هەر لە سەرەتاوە وایان بە بیردا نەهاتبوو، کە ئەم دینە بەرنامەی خوای بەهێزو بەدەسەڵات وزانایەو، ئەم دیندارانەش، کە خۆشەویستی خوان و ئەولیای ئەون، ئاوایان لێ بەسەر بێت! بۆیە توشی ئەو ڕەشبینییە دەبن، یان باوەڕیان لەق دەبێت، یان متمانەیان بە جیددیەتی بەرنامەکەی خوا، کە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی داناوە

کەم دەبێتەوە.. هیوا براو دەکەون لەودی، کە ئەم دینە لە واقیعدا بە کەس بێتە دی!! ڕەنگە ئەم بۆڵە بۆڵ و خوتە خوتەیان خوا لاماندا سەر بکێشێت بۆ گومان کردن لە دینەکە خۆشی..

ئەم زنجیرە هەڵەیە، هەموویان بە دوای یەك هەڵەی سەرەتاییدا هاتوون، ئەویش: پەی نەبردنە بە سروشتی ئەم دینەو شێوازی تایبەتی کارکردنی. یان لەسەرەتاوە ئەم خەڵکەئەم خاڵەیان لا بەڵگەنەویست بوودو زانیویانە، بەڵام دوایی بیریان چۆتەوە.. گەرچی حەقیقەتێکی سەرەتایی زۆر ساناو سادەشە..

ئەم دینە بەرنامەی ژیانی مرۆڤایەتییە و، دەبێ بە ڕەنجی مرۆڤیش لە ژیاندا بچەسپێت. سەرەتای کار بۆ کردنیشی هەر لەو خاڵەوەیە، کە مرۆڤەکان لە ژیانی ماددی خۆیاندان، ڕەنجی مرۆڤانەی خۆیان بۆ سەرخستنی دینەکە دەخەنەکار، دینەکەش ڕەنجی هەموو شوێن کەوتووەکانی دەوێت بەو سیفەتەیان، کە مرۆڤن ولە واقیعی مرۆڤایەتیدا دەبزوێن، دینەکە هەر لە سەرەتاوە وا لە شوێن کەوتووەکانی دەخوازێت، کە دەبێ بۆ سەرخستنی بانگەوازەکەی هەموو وزەی خۆیان بە گەڕ خەن، چ وەك تاك و بە تاککاری، چ وەك کۆمەڵ و بە کۆمەڵکاری، هەر یەکەیان بە جیاو هەمووشیان بە هەرەوەزی و دەستەجەمعی و پێکەوە..

دیسان یەکێك لە سیفەتە سەرەکیەکانی شارەزا بوون لە سروشتی ئەم دینەو کار بۆکردنی ئەوەیە، کە لە هیچ ساتێك ولە هیچ پلانێك ولە هیچ هەنگاوێکدا، سروشتی مرۆڤ وسنووری تواناو واقیعە ماددیەکەی، کە تێیدا دەژین لە یاد نەکرێت. لە هەمان کاتیشدا ئەم دینە هەر بەو تواناو وزەی مرۆڤە خۆیەوەو بەبەرنامە خواییەکەوە دەیگەێنێتە ئاستێکی وا، کە بە هیچ بەرنامەیەکی تری مرۆڤکرد نەگاتە ئەو ئاستە.. بۆ بەڵگەی ئەم ڕاستیەش نموونەی واقیعی لە مێژووی ئیسلامەکەدا زۆرە، بۆیە باش حاڵی بوون لە سروشتی دینەکەو کار بۆ کردنی زوو شوێن کەوتوان دەگەێنێتە ئەو قەناعەتەی، کە هێنانەوەو چەسپاندنەوەی دینەکە سەر لە نوێ و لە واقیعی نوێی خۆیاندا زۆر ئاسانە، بەو

مەرجەی دینداریێتی بەم ئیسلامە وەکو جاران بێت و هەوڵ و ڕەنجیشی بە جیددی وەکو جاران بۆ بدرێتەوە

بەڵام هەڵەی سەرەتایی هەرە گەورە ئەوەیە، کە ئەم بەڵگەنەویستەی سروشت و تەبیعەتی دینەکە لە دڵ و دەرون و بیرو ژیریدا بە تەواوی و وەکو خوای گەورە دەیەوێت نەچەسپا بێت، یان ئالۆزانە بچەسپێت، یان بیر چوو بێتەوە.. چاوەڕوان کردنی سەرخستنی ئەم دینە بە ڕێسای غەیری سروشتی وا، کە لە واقیعی مرۆڤدا نەبێتدیدو بۆچوون و بیروهۆشی مرۆڤەکان دەگۆڕێت و بە شێوەیەکی تری پێچەوانەی سروشتی ئەم دینە دروست دەبن کە پەیوەندییان بە سروشت وحەزو تواناو ئامادەباشی و واقیعی ماددی مرۆڤ خۆیەوە نابێت.. بۆیە گەر وا نەبوو، پرسیارە ساویلکەکان وەك ئەوەی یەکەم: (خوایە ئەوە بۆچی وا بوو؟!) سەر هەڵدەدەنەوە! ئەم پرسیارە ساویلکەو گومانە گێلانە لەوە دێن، کە هەر لە سەرەتاوە پەی بە ڕاستییە سەرەکیە سادەکانی سروشتی ئەم دینەو شێوازی کار بۆ کردنەکەی نەبراوە، یان وەکو وتمان بیر چوونەتەوە!!

بێ گومان خوای گەورە دەیتوانی سروشتی مرۆڤ چ بەم دینە، چ بە شێوەیەکی تر بگۆڕێت، دەشیتوانی هەر لە سەرەتاوە بە شێوەیەکی تر خەلقی بکات، بەڵام ویستی وا بووە، کە هەر ئاوا بێت، ویستویێتی، کە سروشتی مرۆڤ هەمیشە لە کاردا بێت، ویست و ئیرادەو وەڵامدانەوەی هەبێت، ئیلغا نەکرێت و نەگۆڕرێت و پەك نەخرێت، ویستویێتی، کە ڕێنمایی خوایی هەر بە ڕەنجی مرۆڤ خۆی بێتە دی.. بەو ڕادەو بڕەی لە تواناو وزەی مرۆڤ خۆیدا هەیە. ویستویێتی مرۆڤ ئەوەندەی خۆی لە توانایدایە ڕەنج بدات وتێ بکۆشێت و، بەرهەمی تێکۆشانەکەی خۆشی لە هەمان واقیعی گۆڕاوی خۆیدا وە دەست بهێنێت..

خوای گەورە نایەوێت یەکێك لە مەخلوقاتەکانی، مادام وەکو خۆی نین لێی بپرسێت، کە بۆچی وای ویست، یان وای کرد؟! خۆ ئەم مەخلوقاتانە وەکو خوا زاناو بە دەسەڵات و بەبەزەیی نین، وەکو ئەویش پەی بە سیستم و نەزمی گەردون و ژیان

نابەن و، حیکمەتی نادیاری شاراوەکان نازانن، ناشزانن بۆچی فلان دروست کراو بەو شێوازو بەو چۆنیەتی و چەندێتییە دروست بووە؟! نازانن فلان ڕوداو بۆچی ئاواو لەو کات وشوێنەدا وا ڕویدا؟! ئیتر ئەو پرسیارە سەیرە چییە؟ خوایە بۆچی وا بوو؟

(خوایە بۆچی!!) ئەم پرسیارە نە موسوڵمانی ڕاستەقینە دەیکات، نە کافری ڕاستەقینە. موسوڵمان هەر ناپرسێت، چونکە سنووری ئەدەبی خۆی لەگەڵ خوای پەروەردگاری گەورەو خاوەنیدا دەزانێت و نایبەزێنێت.. موسوڵمان لە ناخی دڵییەوە خوای ناسیووەو هەستی بە بوون وحەقیقەت وسیفەتەکانی کردووەو دەشزانێت، کە ئیدراکی مرۆڤ ئەوەندە ئامادە نەکراوە، تا لە زاتی خوای گەورەی خۆی بکۆڵێتەوەو حیکمەت ونهێنیەکانی هەموو بڕیارو فەرمانەکانی بزانێت.. هەر لە سەرەتاوە کە باوەڕی هێناوەو موسوڵمان بووە، قەناعەتی بەوە هێناوە، کە خوای گەورە زاناو کاربەجێیەو هەموو شتێك لە جێی خۆی ولە کاتی خۆیدا بۆ بەرژەوەندی بەندەکانی ئەنجام دەدات..

کافری ڕاستەقینەش ناڵێ: خوایە بۆچی؟! چونکە هەر لە سەرەتاوە باوەڕی بە بونی خوا نییە! گەر باوەڕی بە خوای گەورە هێنا، حەتمەن قەناعەت بەوەش دەکات، کە ئەمەی ڕوو دەدات، ویست و حەزی خوای گەورەیەو، بە پێی زانست و ویست و توانای خۆی ئەو کارەی کردووەو ئەویانی نەکردووە..

پرسیاری وا کابرایەکی بیر کولی باوەڕ کۆڵ، یان هەرزە بیرو هەزەلی دەیکات! کە نە موسوڵمانی سەر ڕاستە ونە کافری جیددیشە! بۆیە بە لای ئێمەشەوە ئەمە پرسیارێك نییە لای لێ بکەینەوەو خۆمان بکەینە خاوەنی وەڵامەکەی.. ئەگەر کەسێك لەوانە پرسییان، کە حەقیقەتی خوایەتی خوای پەروەردگاری نەدەزانی، وەڵامی ئەو کەسە ئەوەیە، کە حەقیقەتی خوایەتی خوای گەورەی تێ گەیەنرێت، تا پەی بە حەقیقەتی خوایەتی و بوون و مرۆڤ و ژیان و گەردوون ببات و موسوڵمان بێت، یان ئەوسا لە زەمینەی زانینەوە نکوڵی دەکات و کافرانە ڕەفتار دەکات، بەمەش ئەو جەنگ و جیدالە بەتاڵ و نەزۆکە کۆتایی دێت..

کەوا بوو کەس بۆی نییە لە خوای گەورە بپرسێت، کە بۆچی مرۆڤی لەسەر ئەو سروشتشێوازە دروست کردووە! یان بۆچی وای ویستووە کە ئەم مرۆڤە دەبێت خۆی کارو کارتێکردنی لە گۆڕانکاریەکانی کۆمەڵگەکەی خۆیدا هەبێت. یان بۆچی ویستی وا بووە، کە هەر دەبێ ڕەنجی مرۆڤ لە چوارچێوەی توانایدا، لە چەسپاندن و هێنانە دی بەرنامەی خوادا لەسەر زەوی بەرپرسیار بێت؟!

دەبێ هەموو کەس ئەم بڕیارەی لا بەڵگەنە ویست بێت، دەبێ ورد دیقەت بداتە ئەوەی، کە چۆن لە واقیعی مرۆڤدا لە کاردایەو چەندیش بەکارو کاریگەرە؟!دەبێ لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی ڕەوتی مێژوو لەبەر ڕۆشنایی ئەم سروشتەی مرۆڤ بێت. تا لە لایەکەوە بزانرێت بۆچی فلان ڕوداو، یان فیسار هەڵوێست وا ڕویداو وا قەوماو وا گیرایە بەر؟ لە لایەکی تریشەوە بزانرێت چۆن لەگەڵ ئەم سروشتەی مرۆڤدا ڕەفتار دەکرێت؟!

ئەم بەرنامەیەی خوا بەو شێوەیەی، کە پێغەمبەر (ﷺ) هێناویێتی، لەسەر زەوی ولە دنیای خەلکیدا هەر بەوەندە ناچەسپێت بۆ خەلکی ڕون بکرێتەوەو پێیان بگەێنرێت! یان بەو سیفەتەی، کە پیرۆزەو هەڵبژاردەی خوای گەورەیەو، خواش بەدەسەلاتەو هێزی بێ پایانی هەیەو، دەتوانێت وەك چۆن گەردونی دروست کردووەو، لەسەر ڕێسای خۆی ئەستێرەکان دەخاتە گەڕو هەموویان ناچارن بە ویست و ئیرادەی خوای گەورە بکەن، خوای گەورە دەشتوانێت ئاوا بە ڕێسایەکی ناچارکردنی خۆی، ئەو خەلکە (قەهر) کات، تا دینەکەی وەردەگرن و شەریعەتەکەی جێبەجێ بکەن.. ئیسلام ئاوا نایاتە دی.. بەڵکو بەوە دێتە دی و دەچەسپێتەوە، کە کۆمەڵێك مرۆڤ، باوەڕێکی پتەوی پێ بهێنن و قەناعەتی تەواویان پێی هەبێت و، بە گوێرەی توانای بیرو ژیری وجەستەیی خۆیانەوە بە تەعلیماتەکانیەوە پابەند بن و، هەموشیان بلاو کردنەوەی بانگەوازەکەی بکەنە ئەرکی ڕۆژانەی تاك و کۆمەڵەکەیان وەکو ئامانجێکی ستراتیژیش ژیانی خۆیان تەرخان بکەن بۆ گەیاندنی دینەکە بە حوکمی ناوچەکەیان و، ئینجا خەلکی تریش بانگهێشت بکەن، تا بێنە ریزی دینەکەیانەوە..

دەبێ هەموو رەنجەکان بۆ ئەو ئامانجە بخەنە کار، لە لایەکەوە دژی لاوازی مرۆڤایەتی خۆیان وخەڵکی ترو هەواو هەوەس ونەزانی ونارەزوپەرستی خۆیان و خەڵکی تر راوەستنەوەو لە هەمان کاتیشدا خۆگر بن وبەرەنگاری بەرهەڵستکارانیان بکەن، کە ئەوانیش هەر بە هۆی لاوازی مرۆڤایەتی و هەواو هەوەس و نەزانین و نارەزو پەرستی خۆیانەوە، ئەو هەڵوێستە دژەیان بەرامبەر بەرنامەکەی خوای گەورە گرتۆتە بەر.. ئەو جا هێنانە دی و چەسپاندنی بەرنامەکەی خوا دەگاتە ئەو ئاست و سنوورەی سروشتی، مرۆڤ دەتوانێ بیگاتێ و پێوەی پابەند بێت، بێ ئەوەی واقیعی تاك و ئوممەتەکەو کۆمەڵگەکەی تێیدا کار دەکەن ئیهمال بکەن..

هەنگاوی گۆڕانکاری کۆمەڵگە، تەریب وهاوشانە لەگەڵ بڕە تەعلیماتەکانی بەرنامە خواییەکە. ئینجا دەبینی ئەم کۆمەڵە مرۆڤە دیندارە، جاری وا هەیە زاڵ دەبن بەسەر نەفسی خۆیان و نەفسی خەڵکانی تردا. جاری واش هەیە لە ناوجەرگەی شەڕی نەفسی خۆیان وشەڕی نەفسی خەڵکیدا تێك دەشکێن.. سەرکەوتن وشکستەکانیان بەسەر نەفسی خۆیان ونەفسی خەڵکیدا؛ پەیوەستە بە رادەو بڕی پابەند بوونی خۆیان بە دینەکەو رادەو بڕی ئەو رەنج وهەوڵەی داویانە بۆ دینەکەی خوا، هەروەها پەیوەستە بەو شێوازو هۆکارو وەسیلانەی لە مەیدانی کارو رەفتاردا گرتوویانەتە بەر..

بەڵام پێش هەموو شتێك، پێش هەموو رەنجێك، پێش هەموو شێوازو هۆکارێك، ئەم کۆمەڵە دیندارەی بەم دینە بزاڤی گۆڕانکاری دەکەن، دەبێت بە نیازێکی پاکەوە بۆ خوا بە تەواوی ساغ بوو بنەوە، دەبێ لە خۆیان پرسی بێت: چەند بۆ ئەم دینەو بۆ بانگەوازو ئامانجەکەی لێ بڕاون؟ تا چ رادەیەك خۆیان بە بەرنامەکەیەوە پەیوەست کردووە و، تا چ رادەیەك تەعلیماتی ئەم دینە لە خۆیان ودەروبەریاندا دەچەسپێنن؟ ئەمانە وەکو تاك و، وەکو کۆمەڵ چەند بۆ خوا سوڵحاون؟ چەند پشتیان بەو بەستووەو چەند متمانەیان بەوە؟!

ئەمە حەقیقەتی دین ودینداریەکەیە، ئەمەشە نەخشەو پـلان و شـێوازی بزاڤـە کۆمەڵکاریەکەی.. ئەمە ئەو حەقیقەتەیە، کە خوای گەورە دەیویست بە کۆمـەڵی موسوڵمانانی یەکەمی رابگەیێنێت و لەسەری پەروەردەیان کات..

کاتێك موسوڵمانان لە پابەند بوون بە حەقیقـەتی ئـەم دینـەو چەسـپاندنی لـە خۆو، درەوشاندنەوەی لە هەڵوێست و ململانێکانیاندا کەمتەرخەم دەبن، کاتێك لە گرتنـە بـەری شـێوازە عـەمەلیـەکانی راسـتییە سـەردتاییەکانی دیـن و دینـداری کەمتەرخەم دەبن، یان کە لە بیری دەکەن، یان کـە ئـاوەژوو لێـی حـاڵ دەبـن و وا دەزانن گەرچی دید لێڵ و رەفتار چەوت و بار لا سەنگیش بن، مـادام موسـوڵمانن هەر سەر دەکەون! کە ئاوا ساویلکانە لـەو دینـە تێدەگـەن، خـوای گـەورە لێیـان دەگەڕێ تا توشی هەندێك دەردەسەری وناسۆر ببن، با کـەمێك شکـست بخـۆن، بـا ماوەیەك بە ژان و خەمی بەزین و شکستیەوە بتلێنەوە، بـا تـاڵاوی سـاویلەکیی و کەمتەرخەمی و گوێ نەدان بچێژن.. ئەمەش یەکێکە لەو حەقیقەتانەی خوای گەورە بە راشـکاوی بـۆ یـاوەرانی پێغەمبـەری (ﷺ) دەربڕیـووە، کـە دەفـەرموێ: (**أَوَلَمَّا أَصابَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّى هَـذَا قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنْفُسِكُمْ إِنَّ اللّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ**) ٣ آل عمران/ ١٦٥ واتە: ئەوە بۆچی، کـە نارەحـەتیتان تـووش بـوو (لـە تێکشکانەکەی ئوحوددا)، کە لەوە پێش هی تری واتان توش بوو بوو، ووتتـان: چـۆن وامان لێ بەسەر هات؟! پێیان بلێ: ئەوە خەتای خۆتان بوو.. خۆتان هۆکاری ڕودانـی ئەو کارەساتە ناخۆشەن، دەنا خۆ خوابە توانایە بەسەر هەموو شتێکدا..

خوای میهرەبان، موسوڵمانان لەم سەرزەنشت کردنەدا جێ ناهێڵێت، بەڵکو بـە هۆکارو ئەنجامی کارەکانی خۆیانەوە پەیوەستیان دەکاتـەوە.. بۆیـان دەسـەلمێنێت، کە ئەو لەم بەسەر هێنـانی شکـستیەیاندا، لـە هێنـانی ئـەم بـەڵاو موسـیبەت و ناسۆرەی سەر رێیاندا، خێری ئەوانی ویستووە، ویستوێتی بۆیـان رون بێتـەوە، کـە ئەو رەفتارانەی ئەوان خۆیان لە واقیعی حاڵدا کردویانن، لە ئاسـتی بەرپرسـی ئـەم بانگەوازەدا نین، بۆیە بونە هۆکاری ئەم ئەنجامە تاڵە..

کار کردن وگەشەو چەسپاندنی بەرنامەی خوای گەورە، لە ڕێی ڕەنجی مرۆڤەوە، کە کارو کارتێکردنی بەردەوام لە نێوان بەرنامەکەو ڕەنجەکەدا دروست دەبێت، خێرێکی گشتی وشتێکی چاکە، چونکە لە لایەکەوە ژیانی مرۆڤایەتی چاك دەسازێنێت و ناهێڵێت پەکی بکەوێت، یان لاسەنگ ببێت، یان پێوەری نامۆو ناقۆڵای بۆ ببێتە حاکم! لە لایەکی تریشەوە سروشتی مرۆڤەکانیش دەبزوێنێت و، زیتیان دەکاتەوەو ڕەفتاری واقیعیانەیان لەگەڵدا دەکات و، ناهێڵێت سروشتی مرۆڤ تێك بچێت و پەڕیدانە یاخی ببێت. چونکە ڕاستیەکانی باوەڕ، ئەگەر جیهادیان لە پێناودا نەکرێت لە دڵ ودەروندا جێگیر نابن! جیهادی زمان (خەباتی سیاسی) بە بڵاوکردنەوەو گەیاندنی بانگەوازەکەیە، جیهادی دەست وبازوو(خەباتی چەکداری) بۆ ڕاوەستاندنی ستەمکاری و بەرپەرچدانەوەی تاغوتان وپاراستنی بەرنامەکەی خوای گەورەو مافی شوێن کەوتووەکانێتی..

کاتێك داعی وموجاهیدو ڕەنجدەرو تێکۆشەرانی ئەم دینە دووچاری ناخۆشی دێن، دەبێ ئارام بگرن، لەسەر ئازارو ناسۆر خۆگر بن، دەبێ لەسەر زاڵ بوون و سەرکەوتن بە ئارام بن و خۆ گر بن، هەر وەکو لەسەر بەزین و شکستدەبێ بە ئارام و خۆگر بن.. خۆگرتن و هەڕاڵ (مەغرور) نەبوون لە سەرکەوتندا قورسترو نارەحەتترە لە خۆگرتن لەسەر تێکشکان و میحنەتەکانی بەزین..

کەندو کۆسپی سەر ڕێ وکێشە قورسەکانی خەبات، دڵەکان پاڵفتە دەکەن، ریزەکان لە بێژنگ دەدەن، سەرڕاست و سەرەڕۆکان لێك هەڵدەوێرن.. بەمەش کۆمەڵە موسوڵمانەکە دەکەوێتە سەر ڕاستە شەقامی ڕێبازە خواییەکەو، پارسەنگانە هەنگاو هەڵ دەهێنێتەوە، چونکە لەگەڵ موسیبەتەکان را دێت و بە میحنەتەکان فێری بەرگری و بەرەنگاریی دەبێت و گەشەو نەش و نما دەکات.. ئاوا کامڵ تر دەبێت و پێ دەگات.. ناسینی خوای گەورەو پشت پێ بەستنی بەهێزتر دەبێت..

ڕاستیەکانی باوەڕ لە ناخی دڵ و دەروندا ڕەگ داناکوتن، تا لە واقیعی تێکۆشاندا نەڕوێن.. دەبێ گورزی میحنەت ئیرادە قایمتر کات، باوەڕیش دەبێ لە

دەبەرێك ڕاچوون و ململانێدا جێگیر ترو پتەوتر بێت.. هەر واشە، چونکە موسوڵمان لە لایەکەوە بەرامبەر نەفسی خۆی لە ململانێدایە، لە لایەکی تریشەوە بەرامبەر نەفسی چەواشەو سەرکەشی ئەو خەلکەش لە بەرەی شەڕدایە.. ماهییەت و کرۆکی شت لەم ململانێ و پێکدادانانەدا رون دەبنەوە! لەم ناکۆکیە واقیعەدا شتی زۆر سەیر کەشف دەبێت. وەك دڵنیایی و دڵەڕاوکێ، هەڵوێستی ئیماندارانەو هەڵوێستی لەرزۆك، ورەی بەرەکانی روبەڕو بونەوەو پێك هەڵپڕژان، دەیان حەقیقەتی تری دینداریی و ژیان و مەرگ، قەدەرو ئەجەل.. جەوهەری هەموو ئەمانە لە کاتی ململانێدا دەردەکەون! خڵتەو خۆڵ و پێچاوپێچی دڵ ونەفسی موسوڵمانی خۆنەگرتوو، یان ئەوانەی دڵنەخۆشن، وەکو کرۆك و، رواڵەت و هەڵوێستی دووڕوو کافران دەردەکەون.. ئەم ماهییەت و راستیانە هەرگیز بۆ خەڵکانی هێمن وموسالیمی دانیشتووی بەر سێبەر دەرناکەون.. بۆ ئەوانەی پێیان وایە نابێت خەڵکی لە خۆمان بکەینە دوژمن!![1].

---

[1] جێی سەرسوڕمانە کەسێك قورئان بخوێنێت و قسەی وا بکات، چونکە قورئان خوێن دەزانێت، کە قابیلی کوڕی سەیدنا ئادەم، کە هابیلی برای کوشت، هیچ ناکۆکیەکی کوفرو ئیمان لە ئارادا نەبوو، زەوی بۆ وولات و، وولاتیش بۆ دەسەلات دابەش نەکرابوو، بەروبوومی زەوی بۆ هەموان بوو، خاوەنێتی نەبوو، ئەدی لەبەرچی قابیل هابیلی کوشت؟! لەبەر ئەو رقە بوو، کە لە ناخیدا بەرامبەر پیاوچاکی ئەم دروست ببوو. خۆ مەرج نیە، کە جاهیلییەت دەمانخاتە ژێر تین وفشارو حەملەی ریشەکێشی خۆیەوە، لەبەر ئەوە بێت هەڵەمان کردووە، یان وەکو هەندێك ساویلکە دەڵێن لەخۆمان هورروژاندوون!! نا، وا نیە، سروشتی ململانێ فیکریەکە وا دەخوازێت، ساحەی ململانێکە دوو بەرەیە، بەرەکان دیدو تێڕوانینیان جودایە، خەتی سیاسی و بانگەوازی گۆڕانکاریان جودایە، رەفتارو رەوشتیان جودایە، ئینجا نەریتی کۆمەلایەتیان جودایە، کۆمەڵە ئیسلامیەکەش، کە قورئان ناوی ناوە ئوممەت لەسەر ئەم چوار بنەما فیکریە دامەزراوە، بۆیە لە بەرەی موسوڵمانێتیەکەدا، ئوممەتێکی موسوڵمان بە بانگەوازێکی جودا لەژێر ئاڵاو سەرکردایەتیەکی جودادا وەستاوەو، بەرامبەرەکەشی بە جاهیلییەت دەناسێنێت و لەگەڵیدا ئامادەی مساوەمە نیە بۆیە لەسەر ئەم هەڵوێستە رەقە تووشی ئەو میحنەتانە دێت، کە پێغەمبەرە مەعسومەکانیش سەلامی خوایان لێ بێت، بێ ئەوەی هەڵەیان کردبێت تووشی دەبوون....

موسوڵمانی خاوەن باوەڕ، خاوەن پەیامی بزاڤ و گۆڕانکاری، چونکە لە واقیعی کارو کاردانەوەدا خەریکی بانگەوازو سەلماندنی بوون و هێنانەوەی حوکمی ئیسلامە، زیاترو خۆی دەناسێت، زووتر دەگاتە ئاسۆی بەرفراوانی هەست ونەست ودیدو بۆچوون و ناسین و پێناسەو داب و ئاداب و نەریت و بەهاو ئینفیعال و هەستی نەگۆڕ.. زووترو زیاتر هەست بە زەرورەتی بەهانا هاتنی خەڵکەوە دەکات.. چونکە هیچ کەس لە ژیانیدا بێ ئەم جۆرە تەفاعول و تەجروبانەی کارو ڕێ، بێ ئەم جۆرە خەبات و ڕەنجە پڕ ناسۆرە کاریگەر نابێت.

ئەو کاتانەی ڕاستیەکانی باوەڕ لە کۆمەڵێکدا دەچەسپن و ڕەنگ دەدەنەوە، لەو کاتانەی کە کۆمەڵە موسوڵمانە داعیەکانی تووشی ئەو هەموو تاقی کردنەوەی بەڵاو موسیبەت و ڕاکە ڕاکەو دەردەسەرییە دێن، هەر یەك لە تاکەکانی ئەو کۆمەڵە شارەزای توانای خۆیان دەبن، حەقیقەتی ئامانجەکانی خۆیان باشتر بۆ ڕوون دەبێتەوە، کۆمەڵەکەو سەرکردایەتییەکەیان ووردتر شارەزای یەك یەکی خشتی بیناکەیان دەبن و دەزانن تواناو تاقەت و تەحەمولی هەر یەکە لە ئەندامەکانیان چەندە، تا چ ڕادەیەك لە ڕووبەڕوو بوونەوەو بەرگریدا خۆ دەگرن، ئائەمەشە، کە خوای پەروەردگاری کارجوان دەیەوێت کۆمەڵە موسوڵمانەکەی لەسەر پەروەردە کات. چونکە خوای گەورە شوێن کەوتووی پێغەمبەرانی بە ڕوداوەکانی ژیانی بزاڤ وکۆمەڵ و بانگەوازەکەیان پەروەردە دەکرد. تا خۆشیان لە واقیعدا جۆرو ئاستی یەکتری بناسن (مَّا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىَ يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ) ٣ آل عمران/ ١٧٩ واتە: نەدەکرا خوای گەورە لە موسوڵمانە پاکەکان گەڕێ هەر لەو بارودۆخەتاندا بمێننەوە، کە هەمووتانی تێدا بوون، نا، هەر دەبوو چەپەڵ و ناهەموارو دەغەڵەکان لە پاك و سەرڕاستەکان جوێ کاتەوە..

پاشان خوای گەورە کۆمەڵە موسوڵمانەکە دەگێڕێتەوە لای قەدەری خوایی خۆی، بەڵام هەندێك لەو حیکمەتانەی لە قەدەرەکەی خوادا شاراوە بوون، ڕوون دەکاتەوە، بەمەش حەقیقەتەکانی باوەڕ لە دڵ و دەروونە بە پیتەکاندا بەهێزتر

دەکات، لە دیدو بۆچوونە روونەکانیشدا، کە بە رووداوەکان بەرفراوانتری کرد، بــوون قایمتر دەکات: (إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُ وَتِلْكَ الأيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَاء وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ الظَّالِمِينَ. وَلِيُمَحِّصَ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ وَيَمْحَقَ الْكَافِرِينَ) ٣ آل عمران/١٤٠- ١٤١ واتــە: تــەنها ئێــوە نــین کــە دڵ و دەروونتان زامدار بوو بێت، ئەو زام و ناسۆرە چۆتە دڵی خــەڵکی تریــشەوە، ئەمــە رۆژگارە، هەر جارەو دەیدەینە دەست کۆمەڵێك، تــا خــوای گــەوردش موســوڵمانە راستەکانی ناو کۆمەڵەکەتان بناسێت و شاهیدو شەهیدیان لێ هەڵ بژێرێت. خــوای گەورە زاڵم و ستەمکارانی خۆش ناوێت. خوای گەورە دەیەوێت بــاوەڕداران پاڵفتــە کات و، لە کافرانیان هەڵاوێرێت و کافرەکانیش مەفح کاتەوە..

کەوا بوو کۆتاش هەر وەکو سەرەتایە، هــەر قــەدەری خوایەوویــست و ئــیرادەی ئەوە کار دەکــات، تــەگبیرو حیکمــەتی ئــەوە، لــە هۆکــارو روداوو شەخــسیات و بزاڤەکاندا دەردەکــەوێت.. ئەمەشــە ئــەو دیــدو بۆچــوونە ئایدیۆلۆژیــە گــشتگیری کاملەی، کە دەبێ لە بیروهۆشی دینداراندا بچەسپێت و، بکرێتــە ئــەو روانگەیــەی لێوەی دەڕوانرێتە مێژوو..

## ٢- موسوڵمان لەوەش زۆرتری پێ دەکرێت:

حەقیقەتێکی گەورەی سەرەکی تــریش هەیــە دەربــارەی سروشــتی دەروونــی و، سروشتی تەبیعەت و سروشتی رەنج و تێکۆشانی مــرۆڤ، کــە تــا چ رادەیــەك ئــەم مرۆڤانە دەتوانن بە بەرنامەی خواوە پابەند بن و، چەندیش دەتوانن بهێننە دی..

نەفسی مرۆڤ کامڵ نییە، بــەڵام توانــای گەشــەو نــەش و نمــای زۆرە. دەتــوانێ بگاتە ئەو ئاســتە بڵنــدەی، کــە کۆتــا پلــەی تــەواوێتی ســەر زەمینــە، ئەمــەش سیفەتێکی گرنگی هیوا بەخشە، چونکە هەموو کاتێــك ئــەو گەشــبینیە دروســت دەکات، کە مرۆڤایەتی هەر کاتێك بۆ ئەم بەرنامەو بەم بەرنامەیە هــەموو رەنجــی خستە کار، دەتوانێ بگاتە لوتکەی ئەو تەواوێتیە، مەگــەر نــابینن، کــە کۆمەڵــە

خەڵکێکی چاك گەیشتە چلە پۆپەی ئەو کاملی و تەواوێتییــە، کۆمەڵەکـەی دەورو بەری پێغەمبەر (ﷺ)! کە پێشڕەوانی ئەم ئوممەتە موسـوڵمانەن: (كُنـتُمْ خَيْـرَ أُمَّـةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ) ٣ آل عمران/ ١١٠ واتە: ئێـوە چـاکترین ئوممـەت بـوون بـۆ خـەڵکی هاتنە کایەوە. ئەمە کۆمەڵگە دیندارەکەی پێغەمبەرە (ﷺ)، کـە بوونـە نموونـەی تەواوێتی نەفسی مرۆڤایەتی. ئەم کۆمەڵە کێن؟ کۆمەڵێك مرۆڤن، کەم وکورتییان تێدایە لاوازییان تێدایە، تەنانەت هی واشیان تێدایە، کە خوای گـەورە دەربارەیـان فەرموویەتی: (إِنَّ الَّذِينَ تَوَلَّوْاْ مِنكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الـشَّيْطَانُ بِـبَعْضِ مَا كَسَبُواْ وَلَقَدْ عَفَا اللّهُ عَنْهُمْ) ٣ آل عمران/١٥٥ واتە: ئەوانـەتان، کـە لـە غـەزای ئوحود هەڵاتن، لە کاتێکدا بوو، کە بـەرەی هـەردوولا پێـك گەیـشتبوون، ئەوانـە شەیتان پێی هەڵخلیسکاندن و بە گوناحی خۆیانەوە بەستنیەوەو، زیـاتر هـانی دان بۆ گوناحی تربەڵام خوای گەورە لێیان خۆش بوو..

ئەمانەش هەر موسوڵمان بوون، ئیماندار بوون، بەڵام سەرەتای ئیسلامەتییانبوو، هێشتا لە دەرسە سەرەتاییەکانی پەروەردەو پێگەیشتندا بوون، بـەڵام لـە وەرگـرتنی ئیسلامەتیدا سەرڕاست بـوون، رازی بـوون بـە سـەرکردایەتییە خواوویـستیەکەیان، بەرنامەکەی خوایان پێ قبوڵ بوو، بۆیە خوای میهرەبـانیش لـە دالـدەی خـۆی دەری نەکردنە دەرەوە، بەڵکو بەزەیی پێیاندا هاتەوەو لێیان خـۆش بـوو، لێیـان گـەڕا تـا جاریَ ئەنجامی رەفتارە هەڵەکەیان ببینن و، بزانن لە هەڵەیەکی ئەوانەوە، چ بەڵایەك رووی لە خۆیان وکۆمەڵ وسەرکردایەتیەکەیان کرد! بەڵام لەگەڵ ئەمەشـدا خـوای بـە بەزەیی، نە لە ریزی ئیمانداران دەری کردن، نە گۆشەگیریـشی کـردن و نـە تەرەشـی کردن! پێی نەفەرموون: لاوازی وکەمتەرخەمیتان بە تەجروبـەی واقیعـی دەرکـەوت، کەوا بوو ئێوە بە کەڵکی هیچ نایەن و سوود بەم دینە ناگەێنن! نا، لە جیـاتی ئـەوە، لاوازیەکەی لیَ قبوڵ کردن، کەم و کورتیەکەیانی خستەوە پـێش چـاوی خۆیـان، بـێ ئەوەی ئەوەندە زۆریان لەسەر قورس کات، کە پێی بڕوخێن! لە جیـاتی ئـەوە لەگـەڵ رەحمـەت وبـەزەیی ودڵنەوایيـدا بـە میحنەتـەکان (هـەر لـەو سـاتە وەختـەدا، کـە

کارەساتەکە گەرمە) داخی دەکردن. ئاوا پەروەردەی دەکردن! هەر وەك چۆن گەورەیەك دەست بەسەر بچوکێکیدا دەهێنێت، خوای گەورە ئاوا بوو بۆیان.. دەیوویست باشتر پەی بە شت ببەن، وورياتر بن، هەست بە دژواری هەڵوێستی هەڵە بکەن، تا پێ بگەن.. خالّی لاوازی خۆیانی بۆ دەکردنە دەرس و پەندو ئامۆژگاری وبە شێوەیەکی ئاسان وسادە، لەگەڵ سۆزو بەزەییدا دەیخستەوە پێش چاوی خۆیان.. وەحی خۆشی بەردەوام بۆ دەناردنەوە، تا متمانەیان بە خۆیان وخاوەنەکەیان نەڕوخێت، تا لە گەڵ گلانەکاندا هەستنەوە، نەك هەر بۆ ئەوەی رەشبین نەبن، بەڵکو بۆ ئەوەی هیواو ئومێدیان زیاتر گەشە بکات! ئاوا هەستیان دەکرد، کە تا زیاتر بۆ خوا بسوڵحێن، خواش زیاتر بایەخیان پێ دەدات وهاریکاریان دەکات. ئیتر ئاوا پێگەیشتن وگەیشتنە مەنزڵ، مەنزڵی نموونەی دەگمەنی میژوویی، ئەوەی کە خوای گەورە خۆی لە وەسف وباسیاندا فەرمووی: (**الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ**) **٣ آل عمران/١٧٣** واتە: ئەوانەی، کە خەڵکی پێی ووتن: وا خەڵکانێکی زۆر کۆبوونەتەوەو گەلە کۆمەکێتان لێ دەکەن، بە خەمەوە بن، بە حەزەر بن، بترسن، بەڵام ئەوان باوەڕیان بەوە پتەو تر دەبوو، بۆیە ووتیان: ئێمە خوای گەورەمان هەیەو ئەویش بەسمانە، خواش باشترین پشتگیرو پشتیوان و پاڵپشتە..

پەروەردەی خوایی، ئەم کۆمەڵە موسوڵمانەی گەیاندە ئاستێکی زۆر بڵند، ئەمان هەر مرۆڤ بوون، هەر بەو سیفەتانەی مرۆڤیشەوە مانەوە، هەڵەو لاوازی، کەم و کورتی هەر هاوڕێیان بوو، بەڵام هەمیشە هۆشیان لە تۆبەو گەڕانەوەی لای خوا بوو.

ئەمە هەر سروشتی مرۆڤەکەیە، کە ئەم بەرنامە خواییە دەپارێزێت و رەفتاری لەگەڵدا دەکات. ئیسلام ئەم سروشت و تەبیعەتەی مرۆڤ ناگۆڕێت، پەکی ناخات، کۆڵی وای ناخاتە سەر شان، کە توانای بەسەریدا نەشکێت، بەڵکو هەر ئاراستەی رەسەنی و پارسەنگی دەکات، تا دەیگەێنێتە ئاستی کاملی و، لە واقیعێکی زیندووی سەرزەمینیشدا ئەمەی بە عەمەلی دەخاتە پێش چاو.. ئەم راستییە

بەهایەکی گەورەی لە گەشبینیدا هەیە، چونکە بەردەوام ئومێدێکی هەمیشەیی دەداتە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، تا زیاتر هەوڵ بدات، تێبکۆشێت، تا بگاتە نزیك ئەو ئاستەی، کە نەوەی بەردەستی پێغەمبەران گەیشتبوونێ.. لە چییان کەمە؟ بۆ نایگەنێ؟ خۆ بەرنامەکەی خوای گەورەیان لەبەر دەستدایە، با لە بارودۆخی ناهەمواریشدا بژین، خۆ دەتوانن هیممەت بکەن وبەرەو ئەو ئاستە هەڵکشێن، با نەك ئەوانیش نەگەنە چڵە پۆپە، بەڵام خۆ لە ئاستی خەڵکی بڵندتر دەبنەوە.. خۆ ئەو کۆمەڵەی یەکەمی ئەم ئوممەتە، کە بە سەرپەرشتی وەحی خوایی ولەسەر دەستی پێغەمبەری نازداردا (ﷺ) پەروەردە بوون، وەنەبێت موعجیزە بوو بن وقابیلی دووپات بوونەوە نەبن، نا، بەرنامەکە هەر ئەوە، سروشتی مرۆڤی هەموو نەوەیەکیش هەر وەکو یەکن، بەڵام بێگومان رادەو بڕی رەنجدانەکە پێویستە، وەکو هی نەوەی یەکەمی ئەم ئوممەتە موسوڵمانە بدرێتەوە.. پلەی ئاستەکانیش بە گوێرەی بڕی توانای سەرف کراو دابەش دەکرێتەوە..

ئەم بەرنامەیە لەگەڵ هەموو کۆمەڵە مرۆڤێکدا لەو ئاستەوە لەگەڵیاندا دەکەوێتە گەڕ، کە تەفاعول وکارو کارتێکردنیان دەرکەوتووە، لەو واقیعەوە لەگەڵیاندا دەکەوێتە ڕێ، کە ئەو کۆمەڵەی تێدا دەژی، لەوێوە هەنگاویان پێ هەڵدەنێت و بەرەو لوتکەو هانیان دەدات. هەر وەکو، کە هەنگاوەکانی یەکەمی (گۆڕانکاری دەروون و دەوروبەر)ی بە کۆمەڵە موسوڵمانەکەی یەکەمجار هەڵگرت، کە لەو جاهیلییەتە ساویلکەیەی عەرەبەکانەوە، لەو شیوو دۆڵ وچەم وچۆڵەی جاهیلییەتی دوور لە هەموو جوانیەکی مەعریفەتەوە، دەستی گرتن ولە ماوەیەکی زۆر کەمدا بەرەو لوتکەی رزگاری وبەختەوەری دنیاو قیامەت بەرزی کردنەوە!! بیست و پێنج ساڵی نەبرد، ئەو کۆمەڵە پاك و هەڵبژاردە خواییە لەسەر لوتکەی بڵندی کامڵی ڕێژەیی مرۆڤایەتی وەستان، چ وەك تاك، چ وەك کۆمەڵ و کۆمەڵگە.

مەرجێکی سەرەتایی هەیە لەم گۆڕانکاریەدا، کە دەبێت لە یەکەم هەنگاوەوە هاتبێتە دی، ئەویش ئەوەیە، کە: دەبێ موسوڵمانان هەر لە سەرەتای باوەڕ

هێنانیانەوە، سەرکردایەتی و ڕێبەرێتی خۆیان بدەنە دەست بەرنامەکەی خوا، دەبێ تەسلیمی بن، پێوەی پابەند بن، بیکەنە ڕێساو پێگەی ژیانیان، دەبێ بیکەنە دروشمی بزاڤی گۆڕانکاری و ئاوازی ئەو ڕێگە دوورو پڕ کەندو کۆسپە..

### ٣- ڕاستی سێیەم: پەیوەندی نێوان دەروون و کۆمەڵکاری و واقیعەکان:

ئەم ڕاستیە بریتییە لە حەقیقەتی ئەو پەیوەندیە پتەوەی وا، کە لە نێوان واقیعی دەروونی موسوڵمان وکۆمەڵە موسوڵمانەکەی لەلایەك و، ئەو شەڕو ململانێیەش لە لایەکی ترەوە، کە ئەو تاك وکۆمەڵە موسوڵمانە بەرامبەر دوژمنانیان لە هەموو مەیدانێکی زۆرانبازی ڕووبەڕوو بوونەوەیاندا دەیکەن.. پەیوەندی نێوان عەقیدەو بیروهۆش، نێوان سەرکەوتن و بەزینی نێوان هەموو دەبەڕێك ڕاچوونێك، ئەمانە هەمووی هۆی سەرەکین لە دیاری کردنی سەرکەوتن و بەزیندا..

بەرنامەی خوای گەورە لە بوارێکی بەرفراوانی دەروونی، مرۆڤایەتی و ژیانی مرۆڤایەتیدا، شوێن کەوتووەکانی ئاراستە دەکات، هەم دڵ و دەروونیان ئاراستە دەکات، هەم کۆمەڵە دیندارەکەیان، هەر دووکیشیان لە واقیعی ململانێکەی ژیان و سەلماندنی بووندا ئاراستە دەکات.. بە یەك ڕوداو، بەڵام بە هۆکارو شێوازو لایەن و هێڵە ئاڵۆزو تێکچڕژاوەکانی ئەو ڕوداوە، کە وەکو جۆری دڵ ودەروون و تەبیعەتی مرۆڤ خۆیانن.. ئاوا دەروونی موسوڵمانان تاك و کۆمەڵیان پەروەردە دەکات..

ئەمە سیفەتێکی گرنگی ئەم بەرنامە خواییەیە، کە تەواوو گشتگیرە. کە هەموو ژیان دەگرێتە خۆ. هەر هەموو لایەنەکان و پێکەوەش، بێ ئەوەی لایەنێکی ژیانی مرۆڤ ئیهمال بکات! دەرون بەو هەموو حەزو ئارەزوو خەم وترس وسڵ و ئینفیعالانەیەوە، کە بەسەریدا دێت لە بزاڤێکی گونجاوی ڕێك وپێکدا، تەفاعولی پێ دەکات، بێ ئەوەی بهێڵێت مەئیوس، یان گۆشەگیر بێت. یان تووشی ئیزدیواجیەتی کەسێتی (انفصام الشخصية) ببێت..

## ٤- سروشتی پرۆگرامی پەروەردەیی ئیسلام:

بەرنامەی ئیسلام کۆمەڵە موسوڵمانەکەی خۆی بە ڕووداوەکان پەروەردە دەکات، بەو کاردانەوەو ئینفیعالانەی، ڕوداوێك لە جیهانی هەست و هۆشی خەڵکیدا دروستیاندەکات، ئینفیعالەکان بۆ شوێنکەوتووەکانی هەڵ دەسەنگێنێت، چونکە هەر یەکەیان لە جۆرە شەخسەیەتێکەوە هاتوون، هەر یەکەیان مۆرك و سیماو سیفاتی جۆرە تەبیعەتێکی پێوەیە، هەر یەکەیان لە رادە تێگەیشتن و جۆرە رەفتارێکەوە هاتوون، بۆیە سەرەتا ئیسلام تەماشای هەموویان دەکات، ئینجا لەبەر چاوی هەموان هەڵوێستە هەڵەکان، یان لاسەنگە کان ناڕەواکان، بالە ناخی دەروونی خاوەنەکانیشیاندا هەر وەکو گومانیش بوو بن دیاری دەکات، هەر کاردانەوەیەك ناپەسەندو شیاو نەبوو بێت، لایەنە سلبیاتەکانی دەردەخات ودەیخاتە لاوە، هەر کاردانەوەیەك سنوور بەزینی تێدا بوو بێت و، پێچەوانەی ئامانج لە ڕوداوەکە بوو بێت، خوای گەورە لەگەڵ نەشکاندنی خاوەنەکەیدا، وەك شتێکی قێزەون وای لە موسوڵمانان دوور دەخاتەوە، کە بێزی لێ بکەنەوە!

خوای گەورە هەڵەکان لەگەڵ ڕەحمەت وبەزەییدا دیاری دەکات و، هەڵوێستە ڕاستەکەش وەك مرواری ئەسڵ بە درەوشاوەیی دەخاتە ڕوو، تا هەموو لایەك بەرەو ئەو حەقیقەتانە ئاڕاستە بکات، کە خۆی بۆ بەرژەوەندی ئەوان لە ڕودانی ڕوداوەکەدا مەبەستی بوون.

جۆری کاردانەوەکان، ئەگەر مافی کەسیان تێدا پێشێل نەکرێت، زۆر گرنگ نین، ئایا ختورەو ئینفیعالی ناخن، یان قسەن، یان کردەوەن، یان زمانی لەشن؟ (وەك شان هەڵتەکان و لچ و لێو هەڵقورچاندن و ڕوو گرژ کردن و.. هتد)! مەگەر نابینیت قورئان باس لە هەڵوێستی شاراوەی ناو پێچ و پەناو سووچ و کون و کەلەبەرەکانی دڵ ودەروونەکان چۆن دەکات؟! چ هی موسوڵمانان[1]، چ هی کافران![2].. بەم شێوازە

---

[1] وەکو ئایەتی (ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا) ٢٤ النور/١٢

[2] وەکو ئایەتی (يَوَدُّوا لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِي الْأَعْرَابِ) ٣٣ الاحزاب/٢٠

دڵ و دەروونەکان پاڵفتە دەکات، دڵیان بە روداوو، هۆشیان بە قورئانەکە ئاراستە دەکات، تا وا پاکیان دەکاتەوە، کە شاراوەو ئاشکرا، لایان وەك شووشەی ڕوون و ساف بێت، ئاوا هەست و دیدو هەڵوێستەکانیان بۆ هەڵدەسەنگێنێت، راست و چەوتییان دەخاتە روو، تا قەناعەتی زاتی خۆیان لا دروست دەبێت، ئینجا ئاراستە خواییەکەیان بۆ دێت، کە دەبێتە تەعلیماتی بڕیارو یاساو رێسای دەستوور.. ئاوا بیروباوەڕە ئیسلامیەکەیان لەسەر بناغەیەکی واقیعی هەست پێ کراوو، لە ئەنجامی ڕوداوێکدا، کە بەسەر خۆیاندا هاتووە بۆ دادەمەزرێنێت، کە ئاراستە دینییەکەیان دەکەوێتە بەر دەست، هەست دەکەن حەقیقەتی روداوەکە ئاوا بووە، کە دەقەکە باسی کردووەو هەڵوێستی رەسەن و پەسەن و پارسەنگیش هەر ئەوەیە، کە دەقەکە فەرمانی پێداوە.. ژیانی کۆمەڵگە موسوڵمانەکە لەسەر بڕیارو بڕگەو یاساو رێسای وا دامەزراوە، کە ئاوا واقیعیانە دارێژراوە. چونکە ئەو یاساو رێسایانە، خۆ هەر بۆ ئەو نەوە ئیسلامەتیە نەبوو، کە لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) بوون، بەڵکو بۆ نەوەکانی دواتری ئەوانیشە، نەوە بە نەوە، تا رۆژی دوایی، تا هەمیشە هەموو ئەوەیان لەبەر چاو بێت، کە پەروەردە بە روداو زۆر گرنگەو، دەبێت داعی و شەرعناسەکان ئەو روداوانەی بەسەر موسوڵمانان دا دێت، بۆ پەروەردە کردن و ئاراستە کردنی قورئانیانەیان بقۆزنەو، با بزانن، کە روداو، کتێبی کراوەی پەروەردەو رێنماییە.

## ٥- واقیعێتی پرۆگرامە خواییەکە:

ئیسلام بۆ ئەوەی لە دنیای واقیعدا بێتە دی و، بە شێوەیەکی عەمەلی لـە نـاو خەڵکیدا پیادە بکرێت، نەهاتووە پرۆگرامەکەی خۆی لە شێوەی تیۆر (نظرية) یەکدا دارشتبێت وخستبێتیە بەر دەست و، پاشان بفەرموێ خەڵکینە ممارەسەی کەن!! نا، ئیسلام هەر لەیەکەم هەنگاوی موسوڵمان بوونی کەسێکەوە بە کردەوە هـەنگاو بە هەنگاو ئیسلامەکەی پێ دەهێنێتە دی..

## ٦- پرۆگرامی خوای گەورە نەگۆڕە:

ئەمەش ڕاستیەکی تری گرنگ وبەسوودە، یارمەتیدەرە بۆ بنیاتنانەوەی سەر لە نوێی ژیانی ئیسلامەتی.. پرۆگرامی خوایی نەگۆڕە، نرخ و بەهاو پێوەرو حساباتی هەڵسەنگاندنیشی هەر نەگۆڕە.. ئەوی مرۆڤی پێ نزیك، یان دوور دەکەوێتەوە لە خوای گەورەو لە بەرنامەکەی، هەر هەڵوێستی خودی مرۆڤەکان خۆیانن، مرۆڤ خۆی بەرپرسە لەوەی هەڵوێستی ڕاست، یان هی چەوت بگرێتە بەر، بۆیە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە زۆر هەڵەیە مرۆڤ خۆی ڕێساو دەستوور بۆ دیدو تێڕوانین وپێناسەی شت وداب ونەریتی ڕەفتارورەوشت دانێت. چونکە دیدوبۆچوون وپێناسەو مەرجی پەسەندی وبڕی هەڵوێستی قبوڵ کراو، لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەگۆڕێن، بەڵام ئەگەر پرۆگرامە خواییەکە بوود پێوەر، دینەکە بوود مەرجەعییەتی چارەسەری ناکۆکی، ئەو کاتە ئەو، حوکم لەسەر ئەو دیدو بۆچوون وهەڵوێستە لێك جوداو دوورانەی ناو مرۆڤایەتی دەدات.. ئەو دیاری دەکات، کە کامیان ڕاستەو کامیان چەوتە، کامیان ڕەوایەو کامیان ستەمە، ئیسلامیش مساوەمە لەسەر هەڵەو ڕاستی هیچ کەسێك ناکات، کەسی پێ باشتر نییە لە کەسێکی تر.. ئیسلام لەبەر خاتری ئەم و ئەو لە پرۆگرام و پێوەری خۆی لا نادات. شوێن کەوتووەکانیشی لەم ڕوانگەوە وا پەروەردە دەکات، کە بەرانەتی کەسێك لە هەڵەو تاوان، نابێ لەسەر حسێبی حەق بێت. مانەوەو ڕاگرتنی بیروباوەڕو یاساو ڕێسا شەرعیەکان بە پاك و سەلامەتی چاکترە، وەك لە شەرمەزاری نەهێنان بەسەر تاوانباراندا، هەر کەسێك و لە هەر ئاست و پلەو پایەیەکدا بن. لە ڕوانگەی ئیسلامەوە: تاوانباران کێن و چین و حوکمیان چییە؟ وا بناسرێن چاکترە وەك لەوەی لەبەر خاتری ئەوان، یان بۆ موراعات کردنی بەرژەوەندی!! ئەحکامی دینەکەو پێناسەی پرۆگرامەکە بگۆڕڕێن! ئەم گۆڕان و گۆڕینە، زۆر دژوار ترو

کوشندە ترە، وەك لەوەی ناوو سومعەی هەندێ گەورە پیاوی بەرپرس و ناوداری موسولْمانان بزڕێت و بشکێت!! پرۆگرامە خواییەکە گەورەترو گرنگترە لە کەسایەتی و پلەو پایەو ناوو سومعەی هەموو کەسێك..

واقیعی مێژووی ئیسلام بریتی نییە لە هەر کارو کردەوەو هەلْوێستێکی موسولْمانان، بریتیش نیە لە بارودۆخی زەمانێك، کە موسولْمانان لە مێژووی خۆیاندا دروستیان کرد بێت، بەلْکو مێژووەکە خۆی، ئەوکارو کردەوەو هەلْوێست و بارودۆخانەیە، کە موسولْمانان بە گوێرەی دینەکەیان دروستیان کردووە.. ئەوەی کە پڕاوپڕ هاوجووتە لەگەلْ بیروباوەڕ ودیدو تێڕوانین وپێناسەو بەهاو پێوەری شەریعەتە نەگۆڕەکەی ئیسلام، هەر شتێك لەگەلْ ڕێساو تەعلیماتی دینەکەدا یەکانگیر بووەوە، ئەوە هی ئیسلامە، هەر شتێکیش لەگەلْ ئەودا یەکانگیر نەبۆوە، ئەوە هەلْەیە، خوارو خێچە، چەوتە، ناڕەوایە. بۆیە ئیسلام پێی قبولْ نەبووەو بڕیاری لەسەر نەداوە، هیچ کردەوەیەکی ناپەسەند (بە نەزەری شەرعی خوا) هی هەر کەسێك بێت، لەسەر ئیسلام مالْ نییەو ناشبێتە مێژووی ئیسلام.. ئەوە وەك پارەی قەلْب سەری خاوەنی دەگرێتەوە، ئەوان نەك ئیسلام، شایانی ئەو وەسفانەن، کە هەلْەن، خوارو خێچن، چەوتن، ناڕەوان.. هتد

مێژووی ئیسلام بریتی نییە لە مێژووی موسولْمانان، بەلْکو بریتییە لە مێژوی چەسپاندنی واقیعی ئیسلامەکە، لە دیدو تێڕوانین و ڕەوشت و ڕەفتارو واقیعی خەلْکیدا، لە جێبەجێ کردن و ڕاپەڕاندنی تەعلیماتی شەریعەتەکەی.. لە بارودۆخی ژیان و سیستمی کۆمەلْگاکەیان.. چونکە ئیسلام تەوەرێکی نەگۆڕەو موسولْمانان بەدەوریدا دەگەڕێن،، چوارچێوەیەکی نەگۆڕەو موسولْمانان لە نێویدا دەبزوێن.. گەر تەوەرەکەیان گۆڕی، یان لە چوارچێوەکە چوونە دەرەوە، ئیدی ئیسلام هەقی بەسەریانەوە چییە؟! بۆچی مالْ بن لەسەر ئیسلامەکە؟! کارو کردارو ڕەفتارو ڕەوشتیان، کە بە پێی تەعلیماتی خودی ئیسلامەکە نییە، بۆچی ببێتە مولْکی ئیسلام؟! بۆچی بووترێت: ئەوە ئیسلامە؟!.. نا، دەبێت بووترێت: ئەوانە

مادام لە پرۆگرامە ئیسلامیەکە چوونەتە دەرەوەو، وازیان لە ئیسلام هێناوە، هەر موسوڵمان نەماون، چ جای رەفتاریان ببێتە دیاردەو جەوهەری ئیسلام!ئەوانە کاتێك بە موسوڵمان حسێب بوون، کە دینەکەی خوایان قبوڵ بوو، پێوەری پابەند بوون وجێبەجێ کردنی ئیسلامیان لا قبوڵ بوو. ژیانیان مۆرکی ئیسلامەتی پێوە بوو.. نەك دواتر، کە لە ئیسلام چوونە دەرەوەو، هەر بە زمان وسەرزارەکی دەیان ووت: موسوڵمانین و تەنها ناوی بێ ناورۆکیان موسوڵمانانە بوو..

# بەندی پێنجەم: دەستووری دین (فقه)[١]

## ئەحکامی بزاڤو بزاڤی ئەحکام:

ئەحکامی شەریعەتەکەی ئیسلام لە بێکاری ودەست بەتاڵیەوە نەهاتووە، ناشبێ لە بێکاری و دەست بەتاڵی و بۆشایشدا بژی. ئەوانەی، کە بێکارو بەتاڵن، لێی حاڵی نابن! چونکە شەریعەتی ئیسلام لە کۆمەڵگەیەکی ئیسلامیدا هاتۆتە دی، کە لەگەڵ هەنگاوەکانی بزاڤی ئەو کۆمەڵگەدا گەشەی دەکرد. ئەو بزاڤەی ڕۆژانە لە واقیعدا ڕووبەڕووی ژیانی ئیسلامیانە دەبووەوە..

دەبێت هەمیشە ئەوەمان لەبەرچاو بێت، کە ئەحکامە شەرعیەکان نەبوون، کە کۆمەڵگە موسوڵمانەکەیان دروست کردووە، بەڵکو کۆمەڵگە موسوڵمانەکە بە بزاڤە واقیعیەکەی خۆی ئەوی دروست کردو هێنایە دی.. چونکە کۆمەڵگەکە ڕۆژانە ڕووەوڕووی پێداویستیە واقیعیەکان دەبووەوە، دەبوو حوکمی پڕاوپڕیان بۆ دەرکات.. ئەو حوکمە ڕۆژانە بوو.. پاشان بووە ئەو ئەحکامە شەرعیانەی دوایی ناوی فیقهی لێ نرا.. ئەم حەقیقەتە مێژوویـیە واقیعیانە بەڵگەی زۆر بەهێزن. زۆر کاریگەرو گرنگن، ڕۆڵیشیان لە شارەزا بوون وتێگەیشتنەوەی سەر لە نوێی سروشتی ئەحکامە شەرعیەکان و پەی بردن ودەرك کردنەوەی سروشتە بزاڤیەکەی ئەحکامەشەرعیەکان زۆر گەورەو سەرەکی یە.. ئەوکەسانەی ئەمڕۆ ئەو ئەحکامە شەرعیانە، کە هەمووی لە دوو توێی کتێبدا نووسراونەتەوەو ئامادەو تۆمارکراون، دەخوێنن، بێ ئەوەی ئەو حەقیقەتانە لەبەر چاو بگرن و لەو بارودۆخانە حاڵی بن،

---

[١] لە کوردیدا بە ئەحکامە شەرعییەکانی فیقهی ئیسلام دەڵێن: (شەرع) و لەیاساو ڕێسای حکومەتی جوێ دەکەنەوە. بۆیە دەڵێن: بە پێی یاسا ئاوایەو بە پێی شەرعیش ئاوایە.. بەڵام من لێرەدا هەر فقهەکەم بە (ئەحکامی شەرعی) ناو بردۆتەوە، چونکە زۆرجار بە هەموو ئیسلام دەوترێت شەرع..

کە ئەو دەقانەیان تێدا هاتۆتە دی. یان ئـەو کـەش وهـەواو حاڵەتانـە ئیـستیعاب ناکەنەوە، کە دەقە شـەرعیەکان بەدەنگیانـەوە دەچـوون وچارەسـەریان بـۆ دادەنـا وئاراستەیان پێی دەکردن. یان لەو زەمان وخەڵك وحاڵەتانـە ناکۆڵنـەوە، کـە ئـەو دەقانەیان تێدا هاتە دی و داوەریان پێ کرا. ئەوانەی وادەکەن، وا دەزانن ئەحکامە فیقهیەکان هەروا سادەو ئاسان دەرکراون، بۆیە پێشیان وایە دەشکرێت لـە دەسـت بەتاڵی وبێ ئیشیدا بچەسپێت! ئەوانەی وا دەکەن، نە مەلان و، نە شەرعناسـن و، نە لە ئەحکامە شەرعیەکانیش گەیشتوون! بگرە هەر لە دینەکەش حاڵی نەبوون.. فیقهێك بە بزاڤێکی واقیعی هاتبێتە بوونەوە، چۆن بێ بزاڤێکی واقیعـی کاریگـەر دێتەوە کار؟! مادام فیقهەکە لە دوای بزاڤەکـەوە هـاتووە، ئـیتر چـۆن دەکـرێ بـە فیقهەکە بزاڤ دروست بکرێت؟!

ئەحکامەکانی بزاڤئەو واقیعە چاك لەبەر چـاو دەگرێـت، کـە دەقـەکانی تێـدا دابەزیونەتە خوارەوەو ئەحکامە شەرعیەکانی لەسەر دارێژراوە. چونکە ئەو واقیعە لەگەڵ دەقە شەرعیەکاندا ئاوێتەیەکیان پێك هێنـاوە، کـە توخمـەکانی لێـك جیـا ناکرێنەوە، هەر کـاتێکیش لێـك ترازێنـران، سروشـت وسـیفەتەکانی ئاوێتەکـەش نامێنن. ئەو توخمی سروشت وکەش وهـەواو هەڵوێـست وبارودۆخانـەی، بووبوونـە کەرەستەی پێکهاتنی حوکمێکی فیقهی، ناشێ ونـاکرێ لێـك هـەڵاوێردرێن و، لـە حوکمە فیقهیەکە جودا بکرێنەوە. ئەگینا حوکمە شـەرعیەکە، تـەنها دەکـەوێت و زەحمەتیشە بـە تـەنها سـوودبەخش بمێنێتـەوە.. ئـەحکامی بـزاڤ زۆرجیـاوازە لـە ئەحکامی سەر کاغەز.. تەجروبەکان سەلماندویانە، کە ئەو کەسـانەی بـەم دینـەوە لەگەڵ بزاڤەکەیدا تەفاعول ناکەن و، نابنە لازم و مەلزومی یەکتر، زۆر زەحمەتە لـە خودی دینەکە تێ بگـەن وشـارەزای ئەحکامـە شـەرعیەکانی بـبن، گەرچـی هـەر خەریکی خوێندنی فیقهەکەش بن، فیقهەکە لە دوو توێی کتێبدایەو خوێندنی واش ساردو سڕو مردووە..

ئەو کەسانە هەست بەم حەقیقەتە دەکەن ودەیگەنیٚ، کە بەم دینەوە لـە بزاڤـی گۆڕانکاریدان، لەو کاتانەشدا بۆیان دەبێتە بەڵگەنەویـست، کـە شـەرعەکە بۆتـە بەرنامەی دینداریی و، واقیعێکی پیٚ دروست بووە، کە رۆحی تێـدا دەژی وگیـانی دینداری تێیدا گەشە دەکات، مەرجیش نیە ئەمـە هـەر لـە سـایەی دەوڵەتەکـەی ئیسلامدا بێت، نا، دەشێت لە گەرمەی ئەو جیهاد کردنەشدا بێت، کە بـۆ هێنانـە دی وراپەراندنی ئەو ئەحکامانە لە واقیعی ژیـانی خەڵکیـدا بـەرپا کـراوە.. ئـەو کەسانە دەیگەنیٚ، کە دینی ئوممەتەکەیان لە واقیعێکـی زینـدوودا کردۆتـە بزاڤـی گۆڕانکـاریی و، رۆژانــە لــە رەنجـدان و لــە خــەباتی هێنانــە دی دان و ناســرەون.. ئەستەمە ئەو کەسانە هەستی گەشەی رۆح و لـەزەتی دەرون بـچێژن، کـە لـە بـیٚ ئیشیدا شەوو رۆژیان بەسەر کەلام وکتێبەوە گرێـداوەو، تەمـەنیان وەکـو پـشتیان بەسەر کتێبەوە کوورِ بووە! ئـەوی دەیـەوێت لـە دیـن تـیٚ بگـات وشـارەزایی لـە ئەحکامەکانی شەرعدا پەیدا بکات، دەبیٚ لە بزاڤێکی واقیعیدا گەشـەونەش ونمـا بکات، کە بەم دینە دروست بووەو گۆش کراوە.. زۆر ئەستەمە کەسێك ئـەحکامی شەرعی لە مەلایەکی دانیشتووی بێکارو دوور لە بزاڤی دینـەوە وەربگرێـت، یـان لای شەرع زان (فقە)یێك وەربگرێت، کە گۆشەگیری کونجی مزگەتێکەو، دوورە پەرێز خۆی گرتۆتەوە، نایەوێت تێکەڵ بە بزاڤی دینداران بێت و دوورەپەرێز لە واقیعەکە، مەشغوولە ودینەکە حونجە دەکات!!

ئەحکامەکانی شەرع، هەڵقولاّوی بزاڤی موسولّمانانن بـە ئیـسلام، دیـارە کـە سەرەتا دینەکە هاتە دی وچەسـپی، پاشـان ئەحکامـە فیقهیـەکان پەیـدا بـوون.. ئاوا.. نەك بەپێچەوانەوە. کاتێك دینداریەکە چەسپی.. کە تاکەکان خۆیان تەسلیم بـەدینی خـوا کردبـوو، بـە هـەموو حـوکمێکی خـوایی رازی بووبـوون. پاشـان کۆمەڵگەیەکیان لە خۆیـان پێـك هێنـا، کـە بـە دینەکـە رازی بـوون وتەسـلیمی ئەحکامە شەرعیەکانی بوون.. تاك وکۆمەڵگەکە هەموو داب ونـەریت ودەسـتورو یاساو رێسایەکی کۆمەڵگەو، سیستمی جاهیلییەتیان تورِ هەڵـدابوو، رازی نـەبوون

مرۆڤی وەكو خۆیان شەریعەتیان بۆ داڕێژن.. دوای ئەوەی تاك وكۆمەڵگەكە بە قەناعەتەوە، ئەوەیان ڕەفز كردەوە، كە جاهیلییەت داب ونەریت ویاساو ڕێسا بۆ ژیانی تاك وكۆمەڵگە دابنێت.. پاشان كە تاك وكۆمەڵگەكە كەوتنەوە ژیانی ڕۆژانەی نوێی خۆیان، كە بە گوێرەی ڕێساو ئەحكامی شەریعەتەكەی خوای گەورە ڕەفتاریان كرد، كە ڕۆژانە لە ژیان و سەوداو مامەڵەو هەڵس وكەوتیاندا پێویستیان بە ئاڕاستەی دین بوو، كە لە ڕووداوێكدا رادەمان، چاوەڕوانی هەڵوێستی دینەكەو حوكمی شەرعی دەبوون، كە دەیانویست كارێك ئەنجام بدەن، بەڵام نەیاندەزانی هەڵوێست وبڕیاری شەرع چۆنە بەرامبەری.. كە ژیانی نوێیان لق و پۆپی تازەی لێ جویێ دەبووەوە.. لەم هەموو كاتانەدا ئەحكامی شەرعی دروست دەبوو.. كەوا بوو ئەحكامە شەرعیەكان وەڵامی واقیعی پێداویستیەكان بوون.. ئاوا فیقهی ئیسلامی هاتۆتە ئاراوە.. جم وجوڵ وچالاكی وبزاڤ كردن بەم دینە بوو، كە ئەحكامی شەرعی هێنایە كایەوە. هەر ئەو بزاڤەی بەم دینە دەكرا هەر ئەوەبوو، كە گەشەونەش ونمای بە فیقهەكە دەكرد. لق وپۆپی لێ وەرگرتن (استنباط) ی لێ جویێ دەكردەوە.. هەرگیزاو هەرگیز لەو سەردەمە زێڕینە نموونەییەی ئیسلامەتیدا، ئەحكامی شەرعی لەكتێبی ساردو سڕەوە نەدەهات.. بەڵكو لە گەرمەی ژیانی واقیعیدا لە دایك دەبوو.. لە گۆنگەڵی كێشەو دەبەڕێك ڕاچوونی ژیانی تاك وكۆمەڵگەكەشدا، نەش ونمای دەكردو بەرەو پێش دەچوو.. بۆیە شەرعناسەكانی ئەو زەمانە دیندارتروتێگەیشتووتر بوون لە دینەكە.. شارەزا بوونەكەیان لەوەوە بوو، كە بە دینەكە دەبزوتن. دینەكەیان دەخستە گەڕ، لە لایەكەوە خۆیان پێوەی پابەند دەبوون و، لەلایەكی تریشەوە كۆمەڵگەكەیان پێ دەگۆڕی.. جا كە دینەكەیان لە واقیعی زیندوودا دەیخستنە گەڕ، لە واقیعی ژیانی كۆمەڵگە نوێكەی موسوڵمانانداد دەبزوتن. خۆیان ودینەكەیان بەیەكتری و پێكەوە، واقیعەكەیان دەگۆڕی. لەم گۆڕانكارییە بێ سەرەوتەی ئەو دیندارانە، كە بە دینەكەلە واقیعی ژیانیاندا ئەنجامیان دەدا، ئەحكامە شەرعیەكان لە دایك

دەبوون. ئاوا ئەحکامی شـەرعی (فیقهـی ئیـسلامی) دەهاتـە دی، نـەك زانایـەك دانیشیّ وشەرع بنوسیّتەوە!!

## ژیانی ئەمڕۆ و ئەحکامی شەرعی:

کوا ئەو کۆمەڵگە موسوڵمانەی خۆی تەسلیمی خوای گەورە کـردووەو، بەدینەکـەی رازییـە؟! کوا ئەو کۆمەڵگەیەی بە کردەوە هەموو شێوەکانی کۆیلەیی رەفز کردۆتـەوەو، بە کردەوە سەلماندوێتی، کە غەیری دینی خوای ناوێت و، یاساو رێساو ئەحکامی هـیچ دەستورێکی غەیری ئەحکامی شەریعەتەکەی خوای گەورەی ناوێت؟!

کەس ناتوانێت لاف وگەزافی ئـەوە لێـدات کـە کۆمەڵگەیـەکی موسـوڵمانی وا ئێستا هەیە، کەوابوو هەر لە سەرەتاوە ئەو موسـوڵمانەی، کـە ئیـسلام دەناسـێت وشارەزای بەرنامەو پرۆگرامەکەیەتی، دەزانێـت مێـژووی ئیـسلام چۆن درووسـت بووە، هەوڵی ئەوە نادات بزاڤ بە ئـەحکامی شـەرعی دروسـت بکـات و، نیـشانی کۆمەڵگەیەکی بدات، کە تەسلیم بەدینی خوا نەبووەو، هەر لە سەرەتاشەوە باوەڕی بەوە نەهێناوە، کە دەبیّ یاسـاو رێـساو دەسـتوری ژیـانی کۆمەڵگەکـەی، تـەنها ئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلام بێت.. چونکە موسوڵمانی سەر راست، هـەر لـە سەرەتاوە هەوڵی ئەوە دەدات، کە دینداری لە خەڵکیدا بـچەسپێت. دینـداری بـەو سیفەتەی، کە تەسلیم بوونە بەخوای تاك وتەنهاو بڕیاردانە بەوەی، کە غەیری خـوا هیچ کەسێك حاکم نیەو دەسەڵاتی یاساو رێسا دانانی نیـەو، هـیچ یاسـاو رێـساو دەستورێك، گەر لە شەریعەتەکەی خواوە وەرنەگیرابێت، قبووڵ نابێـت و لـە کـەس وەرناگیرێت.. خۆ خەریك کردنی خەڵکانێك بەنەش ونمـاو رێکخـستن وپێشخـستنی فیقهی ئیسلامی وئەحکامی شەرع، لەژێر سـایەی کۆمەڵگەیەکـدا، کـە رەفتـارو هەڵس وکەوتی بە گوێرەی ئەو ئەحکامە شەرعیانە نیە و، ژیانی لەسەر رێساکانی ئەو دانەمەزراوە، گاڵتەو گەمە کردنەو لەگەڵ جیددیەتی ئـەم دینـەدا ناگونجێـت.. ئەو کۆمەڵگە لە کویّ وئەو ئەحکامە شەرعیە لە کویّ؟! ئەمە حـاڵی نەبوونـە لـە سروشتی ئەم دینە.. ئەمە گێلێتییە..

خەڵكێك وابزانێت سست وساردو دەست بەتاڵدانیشێ و، ڕەفتار لەگەڵ كـەلام و كتێبدا بكات و، وا بزانێت بەو شێوازە لە دینەكە تـێ دەگـات و ئـەو ئەحكامانـە دواتر لە كۆمەڵگەكەدا، وەك دەسەڵات پیادە دەكات؟!! ئەمە بیركردنـەوەی پیـاوی ئاقڵە، یان خەون و خەیاڵاتە؟!

ئەحكامی شەرعی كاتێك لەم دینـەوە هەڵـدەهێنجرێت، كـە بزاڤێكـی دیـنی لـە جیهـانێكی واقیعیـدا، وەك فوارەهەڵـدەقوڵێت و، وەك ئـاو بـە كـون وكەلەبـەری كۆمەڵگەكەدا تەشەنە بكات و، سەدان بەردو تـاوێرو لێژگـەو هـەورازو نـشێوی بێتـە ڕێ.. ئەمەش تەنها بەو ڕێو ڕێبازو كۆمەڵكارییە دەكرێت، كە لە سەرەتای هاتنی ئـەم دینەدا هاتە كایەوە، كە تەسلیم بوونە بە دینی خواو، دینداری بوونە پێـی. كۆمەڵگـە موسوڵمانەكەش ئەحكامە شەرعیەكانی دارِشـت. بۆیـە دەبـێ هەمیـشە ئـەم نۆیـەو تەرتیبە لەبەرچاو بگیرێت وبگیرێتـەوە بـەر.. سـەردتا حەتـمەن دەبـێ كۆمەڵگەیـەكی موسـوڵمانی وا بەدینـداری وتەسـلیم بـوون بـە خوایگـەورە پێـك بهێنرێـت، كـە بـە شـەریعەتەكەی خـواوە پابەنـد بێـت و، سـور بێـت لەسـەر وەرگـرتن وراپەڕانـدن وچەسپاندنی.. ئینجا دوای ئەوە ـ نەك پێش ئەوە ـ فقهێكی ئیسلامی واقیعـی دێتـە كایەوە، كە بەرفراوان وگشتگیرو پڕاوپڕی پێداویستیەكانی ئەو كۆمەڵگەیە دەبێت، كـە هێناویێتیە دی.. نەك كۆمەڵە ئەحكامێكی شـەرعی، پێـشتر نوسـراوەو ئامـادە دانـرا بێت و، ئینجا كۆمەڵگەی موسوڵمانی لەسەر بنیات بنرێت!!

هەموو حوكمێكی فیقهی، بریتیە لە چەسپاندن وراپەڕاندنی هـەموو لایەنـەكانی شەرع، با ئەو حوكمەش بە ڕادەیەكی دیاری كراوو، بـۆ حاڵـەتێكی دیـاری كـراویش بێت، چونكە ئەو ڕوداوەی حوكمە فیقهیەكەی بەسـەردا دەچەسـپێت، هـەر بەشـێكە لەو بزاڤەی، دیندارەكان كە بە دینەكە لە واقیعەكەیاندا كردوویانـە.. بۆیـە حوكمـە شەرعیەكە هەڵوێستێكی دینەكەیـە و، پڕاوپڕیقـەبارەو شـێوەو كـەڵێن ویـارودۆخ و چۆنیەتی وچەندێتی پێداویـستیەكانە.. وەكـو پۆشـاكێكەو هـەموو پارچـەیەكی بـە گوێرەی قەدو باڵاو قەبارەی ڕوداوەكان دووراوە.. ئەمما ئەو ئەحكامـە شـەرعیانەی،

لە دوو توێی کتێبدا نوسراونەتەوەو، ئێستا حازرو ئامادەن، ئەوانە ئەحکامی رووداوی ترن.. ئەوانە لە زەمانێکدا دارێژراون، کە ژیانی ئیسلامی بەگوێرەی حوکم وسیستم ودیدی ئیسلام بوو.. پێش ئەو زەمانە ئەم حوکمە شەرعیانە دانەڕێژرا بوون و، چاوەرێی رووداوەکانیان بکەن بقەومێ، تا ئەمان راپەڕێنرێن! ئەو زەمانە حوکمە شەرعیەکان وەکو ژیانەکە خۆی زیت و زیندوو چوست وچالاك بوون. بۆیە ئەمڕۆش دەبێ ئێمە ئەحکامی شەرعی تر وەکو، کە هەڵوێستی دینەکە دەیخوازێت بۆ حاڵەتە نوێیەکانی ژیانمان دارێژین.. بەڵام بە تەئکید پێش ئەوە، دەبێ ئەو کۆمەڵگەیە پێك بهێنرێت، کە دیندارەو دینداریەکەشی بە ئیسلام پێکەوە ناوە.

ئەو کۆمەڵگە ی، کە قەناعەتی بەوە کردووە، کە جگە لە ئەحکامی شەرعی ئەم دینە، هیچ نەکاتە یاساو رێسای ژیانی. ئەوسا رەنج وجیهادیی موسوڵمانان وەك دینەکە، جیددی وبەبەرهەم دەبێت و، تێگەیشتنیش لە دینەکە قوڵترو راستتر دەبێت. جگە لەم شێوەیە، گاڵتەجاڕو گەمەی منداڵانەو، ئیسلام نایەوێت.. چونکە هەموو شێوەیەکی تری دارشتنی ئەحکامی شەرعی، ڕاکردنە لە جیهادەکە وخۆ هەڵخەڵەتاندن وفریودانە، ئەوەی کە ئێستاش بە ناوی (نوێ کردنەوەی ئەحکامی شەرعی) یان (ڕێکخستن وپێشخستنی فیقهی ئیسلامی) رەواجی پێ دەدرێت، هەر لەم روانگەوە تەسکەوەیە! با ئەوانە لەجێی ئەوەی دان بە لاوازی و بەزینی خۆیان بێنن لە شەڕو مل ملانێکە هەڵدێن، با لە جیاتی ئەو هەڵاتن وفەلسەفاندنی ترس وبەزینەی خۆیان، داوای لێ بوردن لە خوای گەورە بکەن..

ئەرکی سەرەکی ئێستای موسوڵمانان؛ بەرپا کردن و بەردەوام کردنی جیهادە لە پێناوی خوادا.. جیهاد بۆ چەسپاندنی خوایەتی خوای گەورە لەسەر زەمین. ئەمەش دوای ڕماندن وتێکشکاندن وبەزاندنی ئەو تاغوتانە دێتە دی، کە دەسەڵاتی خوایەتیان بۆ خۆیان زەوت کردووە..

## ئەحكامی شەرعی و مەلای بەتاڵ:

ئەحكامی شەرعی لە بێ ئیشی ودەست بەتاڵییەوە دروست نابێت. لە دەست بەتاڵی وبێ ئیشیشدا ناژی.. ئەحكامی شەرعی لە مێشكی بێ خەم و، ئیرادەی بێ هیممەت وسەر كاغەزی بێ گیاندا ناڕوێت وگەشە ناكات.. بەڵكو لە واقیعی ژیاندا دەڕوێت ولەویشدا گەشەو نەش ونما دەكات.. واقیعی هەموو ژیانێكیش نا.. نەخێر.. واقیعی ئەو ژیانەی كۆمەڵگەیەكی موسوڵمان دەیباتە سەر.. بۆیە دەبێ لە سەرەتاوە هەوڵ بۆ پێكهێنانی ئەو كۆمەڵگە موسوڵمانە بدرێت، كە كۆمەڵگەیەكی سروشتی ولەش ئاسایە.. هەموو ئەندامەكانی پێكەوە سازاوانە دەبزوێن.. تەنها ئەو كۆمەڵگەیەیە، كە دەبێتە كێڵگەی سروشتی وئاسایی فیقهی ئیسلامی و، تەنها لەوێدا ئەحكامە شەرعیەكان لە دایك دەبن و، گەشە ونەش ونما دەكەن و وە بەرهەم دێن.. ئەو ئەحكامە شەرعیانە تەنها لەو كۆمەڵگەیەشدا دەچەسپێن..

بیر ئاڵۆزی وموعاناتی ئەو زانا ومەلایانە ئەوەیە، كە وا دەزانن ئەم واقیعە جاهیلییەی، كە تێیدا دەژین، ئەسڵەو ڕەسەنەو سروشتیەو، ئەمان دەبێ دینەكەی لەكەڵدا بسازێنن و، ئەحكامە شەرعیەكانی لەگەڵدا بگونجێنن! بە بەهانەی ئەوە گوایە دینەكە بۆ واقیعی ژیان هاتووە، بەڵام ناڵێن كام واقیعە؟! واقیعی كۆمەڵگەی جاهیلی، یان واقیعی كۆمەڵگەی موسوڵمان؟!

دەبێ ئەوە بەڵگەنەویست بێت، كە دینی خوای گەورە ئەسڵەو ڕەسەنەو، لەلایەن خوای گەورەوە هاتووە، كەوا بۆ هەر دەبێت كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی خۆی لەگەڵدا بسازێنێت، دەبێ كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی واقیعەكەی خۆی بەگوێرەی دینەكەی خوا بگۆڕێت.. شێوازی ئەم گۆڕینەش بە دیدو بۆچوون ومەیل وئارەزووی كەسانێك نیە، چۆنیان بوێت وا بكەن!! نەخێر.. تەنانەت شێوازی ئەو گۆڕانكاریەیش، دەبێت تەنها بەیەك شێوە بێت! بە ڕەنج و جیهادی بزاڤێكی ئیسلامی، كە ڕووەوڕووی جاهیلیەت دەبێتەوەو، بۆ چەسپاندنی هێنانە دی خوایەتی خوای گەورە لەسەر زەویدا، بۆ سەلماندنی پەروەردگاریەتی ئەو.. بۆ

ڕزگارکردنی خەڵکی لەژێر نیری تاغوتان وقوتارکردنیان لە تاغووت پەرستی.. بۆ چەسپاندنی ئەحکامەکانی شەرعی خوا لە ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵگە موسوڵمانەکەیاندا.. ئەم بزاڤەش حەتمەن لەو ڕێیەدا، تووشی فیتنەو ئەشکەنجەو ژان و ناسۆر دیت. جا ئەوەی لاوازەو بێ هیمەتە دەکەوێت. ئەوەی لاوازترە هەر لە دینەکە پاشگەز دەبێتەوە.. ئەوەی سەر ڕاستانەش بەیعەتی بە خوای خاوەنی داوە، بەردەوام دەبێت وخۆ دەگرێت.. تا دەگلێت وشەهید دەبێت، یان ئارامگرانە بە ئارامیەوە لەسەر ڕێبازی خۆی دەڕوات و بزاڤەکەی بە هێزتر دەکات. تا بڕیاری خوای گەورە دێت وناوکۆیی ناکۆکی حەق وباتڵ دەکات وحەق سەردەخات، جا ئەو کاتە سیستەمە ئیسلامیەکە دێتە کایەوەو حوکم دەکات، ئینجا ئەو کەسانەی بە ئیسلامەکە پەروەردە بوون و، بە خۆشەویستی خوا گۆش کراون و، بە دینەکەیەوە هاتوونەتە پێش ولەسەر ڕێبازی ئەو مابوونەوەو، بە تەعلیماتی خوای گەورەوە پابەند بووبوون، ئەوانە دەبنە کارگێڕو ڕاپەڕێنەرانی ئەو سیستەمە ئیسلامیە. ئینجا پێداویستی ڕۆژانەی ئەوان وکۆمەڵگە موسوڵمانەکەیان، داوای هەڵوێستی شەرعییان لێ دەکات.. داوای بڕیاری دینەکەیان لێ دەکات. ئینجا ئەحکامە شەرعیەکان سەرلەنوێ لەبەر ڕۆشنایی قورئان وسوننەتدا دادەڕێژرێنەوە، بە شێوەیەکی وا، کە لەگەڵ پێداویستی کۆمەڵگە نوێکەیاندا بگونجێت.. دوور لە کۆمەڵگەی جاهیلی وبارودۆخ وشێوازو یاساو ڕێساو داڕشتنی جاهیلی..

ئەحکامی شەرعی لەبەر ڕۆشنایی ئەو واقیعە نوێیەوە، کە کۆمەڵگە موسوڵمانەکەی تێدا دەژی، لە دینەکەوە وەردەگیرێت.. لەو واقیعەوە، نەك لە دەست بەتاڵی وبێ ئیشیەوە.. لەو واقیعەوە، کە داواکاری تایبەتی هەیە.. پێداویستی خۆی هەیە.. داوای چارەسەری کێشەکانی دەکات.. هەنگاوی یەکەمی وون بوون و ڕێ بزرکرن ئەوەیە، کە وەکو ووتمان: وا بزانرێت ئەم کۆمەڵگایانەی ئێستا موسوڵمانانی تێدا دەژین، بەو هەموو پێکهاتە تێکەڵەیەوە، بەو هەموو دیدو بۆچوون وهەست وهۆش وهەڵوێستە دژەیەوە، بەو هەموو خوونەریتە نامۆو

ناپەسـەندەیەوە، کۆمـەڵگای موسـوڵمانن! ودەشـێ ئەحکامـە شـەرعی یـەکانی ئیسلامیان، کە ئێستا لە دووتوێی کتێبی کۆندان بدەینێ وتێیدا بیچەسپێنین!!

دیسان نیشانەی کۆڵەواریی وکوێرەوەری وزەین کوێرییە، وا هەست بکرێت، کـە واقیعـی ئـەم کۆمەڵگـە جاهیلیانـە وپێکهاتـەی ئێـستایان، ئەسـڵەو رەسـەنەو سروشتیەو، پێویستە دینەکەی خوای گەورە لە گەڵیاندا هەڵکات وریکـات وخـۆی بـسازێنێت! خـۆی وابگۆرێـت، تـا بگونجێـت.. تـا فریـای پێداویـستیەکانی ئـەو کۆمەڵگە جاهیلییانە بکەوێت.. تا بە هانای کێشەکانیانەوە بچێت! لـە کاتێکـدا، کـە پێداویـستیەکانی ئـەو کومەڵگـە جاهیلییانـە هـەر لـەوەوە هـاتوون، کـە کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی نین! خۆیان پێچەوانەی ئیسلام دەبزوێن! نا.. نابێت گـوێ لەم گەرەلاوژێ وگاڵتەجارپە بگرین.. وا دەزانم کاتی ئەوە هاتووە، کەئیسلام لە دڵ ودەروونی موسڵمانانیدا، زۆر بـەرز وبـەنرخ راگیرێـت.. نـەهێڵین ئیـسلام بکرێتـە خزمەتکاری ئەم بارودۆخە جاهیلیانە. نەهێڵین بکرێتـە رەنجبـەری ئـەم کۆمەڵگـە جاهیلییانە.. نەهێڵن بکرێتە زامن ومـسۆگەری چارەسـەری ئـەو پێداویـستیانەی جاهیلییەت.. دەبێ موسڵمانان و خەڵکی گـشتی و، بـە تایبـەتی بـەو کەسـانەی فتوایان لێ داوا دەکەن بڵێن: جارێ ئێوە خۆتان بـەرەو ئیـسلامەکە وەرن.. جـارێ خۆتان ملکەچی حوکمە شەرعیەکان بن.. یان ئاشکراتر بلێین، جارێ ئێـوە خۆتـان وەرنەوە ناو دینی خواوەو وەری گرن.. جارێ خۆتـان موسـڵمان بـن وبریـار بـدەن، تەنها خوای گەورە بپەرستن.. جارێ خۆتان شـایەتمانە بـە حەقەکـەی لا الـە الا الله بهێنن بەو واتاو ماناو شێوانەی، کە باوەڕو ئیسلامیان لە سەر دادەمـەزرێت، کـە بریتیە لە قەناعەت کردن و بڕیاردان بەوەی، کە تـەنها خـوای پـەروەردگار خـوای دەسەلاتدارە لەسەر زەمین و لە ئاسمانەکانیش.. بڕیاردان بەوەی، کـە تـەنها خـوای گەورە حاکمەو، تەنها ئەو مافی بەرنامە دانانی بۆ ژیـانی مرۆڤایـەتی هەیـە، ئـەم بڕیارەشتان بەوە پیادە دەبێت، کە نـەهێڵن هەنـدێ کـەس ببنـە خـوای خـەڵکی. نەهێڵن هەندێ کەس لە جێی خوا بپەرستێن.. نەهێڵن هەنـدێ کـەس خۆیـان لـە

جێی خوای گەورە دانێن و، بە کەیفی خۆیان یاسا و ڕێسا، پێچەوانەی دینی خوا دارێژن.. جارێ هەر لەسەرەتاتانەوە نەشهێڵن هەندێ کەس ناشەرعیانە ببنە حاکم ودەسەڵاتداریش.. جا ئەو کاتەی خەڵکی، یا هەندێ کەسی بە هیممەت وەدەنگ ئەم بانگەوازەوە دێن، مانای وایە یەکەم هەنگاویان بەرەو پێکهێنانی کۆمەڵگە موسوڵمانەکە ناوە.. مانای وایە: ئەو واقیعە زیندووەی ئەحکامی شەرعی ئیسلامی تێدا دەڕوێت وگەشەو نەش ونمای تێدا دەکات، دێتە کایەوە.. لێرەوە فیقهێکی زیندوو لە دایك دەبێت، چونکە بەگوێرەی پێداویستیەکانی رۆژانەی کۆمەڵگە موسڵمانەکەی، کە تەسلیم بە دینی خوا بووە ئەحکام دەردەچێت..

پێش پێکهاتنی ئەو کۆمەڵگە موسڵمانە، هەموو کارکردنێك لە بواری ڕێکخستنەوەی فیقهو ئەحکامی شەرعی ودارشتنەوەی بەو شێوەیەی، کە وەڵامی پێداویستیەکانی کۆمەڵگەی جا هیلیپێ بدرێتەوە، خۆهەڵخەڵەتاندن وخەڵکی فریودانە.. هەوا کێڵانە.. تۆو وەشاندنە بە هێڵی دەریادا.. چۆن تۆوی دانەوێڵە لە هەوادا ناڕوێت، فیقهی ئیسلامی و ئەحکامی شەرعیش لە بێ ئیشی ودەست بەتاڵیدا چەکەرە ناکات.. کارکردنی (فیکری) ی لە کێڵگەی (فیقهی) دا، شتێکی خۆش وکارێکی ئاسان وسەلامەتە، کاری حەساوەی بەر سێبەرە! چونکە هیچ دژواریەکی نایەتە ڕێ! بەڵام بە تەئکید ئەوە کارکردن نیە بۆ ئیسلام.. بە تەئکید ئەوە خۆ ماندوو کردنە، نە سروشتی بانگەوازیئەم دینەیە، نە بەرنامەشیەتی.. ئەو کەسانەی ژیانی سەلامەتی وهێمنیان دەوێ، لە جێی ئەوەی وا خۆیان بە ئەحکامە شەرعیەکانەوە خەریك کردووە، با بڕۆن خوو بدەنە هونەرو ئەدەب.. یا باخۆیان بە بازرگانیەوە خەریك بکەن.. من وا دەزانم - والله اعلم - ئەوی ئەوانە دەیکەن، هەر کات بەفیڕۆ دان وتەمەن زایە کردنە.. دینی خوا ئەوە قبول ناکات ببێتە ئەسپ وعەرەبانەی کۆمەڵگەی جاهیلی ڕاکێشێت.. یان ببێتە خزمەتکاری ئەو کۆمەڵگەیەی، کە لە دینی خوا یاخی بووە.. ئەو کۆمەڵگایەی، کە نەك گوێ لە دینی خوا ناگرێ، بەڵکو نکۆڵیشی لێ دەکات.. جارجارەش لێرەو لەوێوەش

گاڵتەیان بە دینی خواو ئەحکامەکانیشی دێت.. پێیان وایە ئەو شەریعەتە، هی ئەوە نیە هەڵوێستی ڕاست وچارەسەری چاك بۆ کێشەو پێداویستیەکانی کۆمەڵگەکەیان بدۆزرێتەوە، ئەو گێلانەی، کە پێیان وایە شەریعەتی ئیسلام یاسای زەمانی کۆن بوودو، ئێستا شیاوی ئەم سەردەمە نەماوە!ئەحکامی شەریعەتی ئیسلام هی ئەو جۆرە کۆمەڵگە جاهیلییانە نیە، کە لە خوا یاخین و مل کەچی دەسەڵات و دینی خوانین..

## پینەی (دینی) ی!!

ووتمان کە ئەحکامی شەریعەتی ئیسلام، لە دەست بەتاڵی وبێ ئیشیەوە پەیدا نەبووە، تا لە بە تاڵی وبێ ئیشیدا گەشەو نەش ونما بکات. پێکهێنانی کۆمەڵگەی موسڵمان و قۆناغەکانیپێکهێنانی، لە هەموو کات وشوێنێکدا هەر یەکە. گواستنەوەی کۆمەڵگەیەك لە جاهیلییەتەوە بۆ ئیسلام، لە هیچ کات وشوێنێکدا کارێکی ئاسان نەبووەو بە ئەحکامی شەرعی دەستی پێ نەکردووە. بۆیە قەت نابێ و نیە، پێکهێنانەوەی کۆمەڵگەیەکی موسڵمان، کە بە ئەحکامیشەرعی دەست پێ بکاتەوە. چونکە ئەحکامە شەرعیەکان پێویستیان بە کۆمەڵگەیەکی واقیعی موسڵمان هەیە، تا تێیدا گەشەونەش ونما بکەن.. دەنا دارشتنی ئەحکام بێ ئەو کۆمەڵگەیە، دەست بەتاڵی و خۆخەریك کردنیبەرسێبەرە!

مومکین نییە کۆمەڵێك ئەحکامی شەرعی نوسراوی (ئامادەکراو)، کە لە کاتی دەسبەتاڵی و دوور لە گەشە و نەش و نمای کۆمەڵگەی موسوڵمان هاتبێت و نوسرابێتەوە، کەببێتە زەمینەی فیکریی کارێکی ئیسلامی وا، خەڵکی لە جاهیلییەتەوە بەرە و ئیسلام بگوێزێتەوە.. چونکە ئەوەی ئەو خەڵکە جاهیلییە بۆ موسڵمان بوونیان پێویستیانە، ئەحکامی شەرعی نییە.. خۆ ئەوان، کە موسڵمان نەبوون، لە بەر ئەوە نیە ئەحکامی شەرعەکە کەم وکورت بووبێت و، نەیتوانی بێت وەڵامی پێداویستیەکانی ژیانی رۆژانەیان بداتەوە.. یان لە بەر ئەوە بێت، کە

ئەحکامەکانی شەرع قورسن ودەبێ ئاسانتر بکرێن! ئەمانە ئەو گومانــە درۆزنــەن، کەخۆ فریودان و خۆ گێل کردنن..

ئەوەی کە بۆتە بەر بەستی ڕێی موسڵمان بوونەوەی ئەو کۆمەڵگە جاهیلییانــە، ئەوی ناهێڵێت ئەو خەڵکە موسڵمان بن و لە ئیسلامەکە تێ بگەنــەوە، ئــەوە ئــەو تاغووتە ڕقنانەن، کە ناهێڵن دەسەڵاتی حوکم بۆ خوای گەورە بگێڕرێتەوە. ئەوانن، کە ناهێڵن پەرستن و پەروەردگارێتی ودەسەڵات ومافی یاسا و ڕێسادانان بــۆ خــوای پاك وتاك بگێڕرێتەوە.. ئــەو تاغووتانــە بــەم بەرهەڵــستکاریەیان بــە تــەواوی لــە ئیــسلام داماڵڕاون و، لە بازنەی دینەکە چوونەتە دەرەوە.. چــونکە حــوکمی خــوای گەورەیان خستۆتە لاوە، کە زەروراتی دینــەو ئیــسلام (بــێ حــوکم کــردن) وجــودی نابێت.. دیسان زۆر جار جەماوەری خەڵك، هەر لــە خۆیــان دەبنــە کەنــدو کۆســپ وبەربەستی سەر ڕێــی موســڵمان بوونــەوەیان، یــان تێگەیــشتنەوەیان لــە ئیــسلام وگەڕانەوەیان بۆی، بەوەی، کە فریویــان خــواردووەو هــەڵ خەڵــەتێنراون و بوونەتــە پەرستیارو کۆیلەی تاغووتەکان! بەو مانایەی، کە ملکەچــی وگوێڕایــەڵی بــۆ ئــەو تاغووتانە دەردەبڕن وبڕیارەکانیان رادەپەڕێنن.. بەمەش دەیانکەنە خواو لــە جێــی پەروەردگاری مەزن دایان دەنێن.. بەم جۆرە ملکەچی وگوێڕایەڵی کــردن وفــەرمان راپەراندنەیان (کە خوای گەورە بــە پەرســتنی دانــان)، لــە خوابەیەکناســین دەچــنە دەرەوەو، لە ناو جەرگــەی شــیرکدا خولــدەخۆن.. ئەمــە یەکێکــە لــە مانــا هــەرە بەرزەکانی شیرك لە دیدو پێناسەیئیسلامدا.. جاهیلییەت بــەو شــێوەیە سیــستمی خۆی لە سەر زەمیندا دەچەسپێنێت: سەرەتا ئیعتماد دەکاتە سەر بیروهۆش ودیــدو بۆچوون و، پاشان ئیعیتماد دەکاتە سەر روکنە ماددیەکان..

کەوا بوو دارشتنی ئەحکامی فیقهی ئەو ووزەو توانایــەی لــە بــارادا نیــە، کــە رووبەڕووی جاهیلییەتەکە ببێتەوە، دەبێ ئەوە زۆر ڕوون بێت، کە ئــەوی دەتوانێــت ڕووبەڕووی جاهیلییەت ببێتەوەو بەرەنگاری بکات، کۆمەڵکارە ئومەتیەکەیە، کە:

**یەکەم:** بە بانگەوازە خواییەکەیە، خەڵکی بۆ ئیسلامەتی وسەرلەنوێ موسڵمان بوون، بانگ دەکاتەوە..

**دووەم:** بە بزاڤە کۆمەڵکارییەکەی لەگەڵ جاهیلییەتدا دەستەو یەخە دەبێتەوەو، بەم دینەوە خەریکی ململانێیەتی..

شتێکی سروشتی وئاسایی وچاوەڕوان کراویشە، کە مل ملانێکە پڕە لە ناسۆرو ژان وکسپەو، قۆناغەکانیشی سەدان کەندوکۆسپی لە سەر ڕێیە.. هەر وەکو، کە لە هەموو کات و شوێنێکدا دێتە ڕێی بانگەوازو بزاڤە ئیسلامیەکەو، ئەو موسوڵمانەی ڕووبەڕووی جاهیلییەت دەبنەوە.. ئەوجا خوای گەورەش لە دوای تێپەڕ بوونی ماوەیەکی کەم، یان زۆر لە مل ملانێ ودەبەرێك ڕاچوونی حەق و باتڵ، داوەری خۆی دەکات و، باری موسوڵمانان ڕاست دەکاتەوەو حەقیان پێ سەردەخات. پاش ئەم مل ملانێ وسەرکەوتن ودامەزراندنەی کۆمەڵگەی موسوڵمان، ئینجا ئەحکامی شەرعی دێت وڕۆڵی گرنگی خۆی لە ڕێکخستنی ژیاندا دەبینێت. چونکە ئەو کاتە لەدایك بوونەکەی وگەشەو نەش ونماکەی سروشتیەو، دیدو بۆچوون و هەڵوێستەکانیشی، کە دەبنە بڕیارو یاسای واقیعی و زیندوو، ئاسان دەبن.. ئەو کاتە هەرحوکمێکی شەرعی، کە دینەکەو دەسەڵاتدارە دیندارەکە دەیدات، پڕاوپڕی پێداویستیە واقیعیەکانی کۆمەڵگە موسوڵمانەکە دەبێت وخەیاڵی نابیت! ئەمانە هەمووی ئێستا، داهاتووی نادیارو غەیبن و، نازانین قەبارەو چۆنیەتی چەندێتیان چۆنە، ناشتوانین لە خۆمانەوە ڕوداوێك تەسەور کەین وجۆرە ئەحکامێك هەر لەخۆمانەوە بۆی دابڕێژین.. بەڕاستی ئەو کەسەی لە دینداریدا جیددیە؛خەریکی کاری جیددیش دەبێت، کە بانگەوازو بزاڤەکەیە.. خۆی خەریك ناکات بەشتێکەوە، کە نابێتە مایەی پێکهێنانەوەی کۆمەڵگەی موسوڵمان و، گێڕانەوەی حوکمە ئیسلامیەکە..

ئەمە بە هیچ شێوەیەك ئەوە ناگەیەنێت، کە ئەو ئەحکامە شەرعیانەی لە قورئان وحەدیسدا هاتوون ڕۆڵیان نەماوە! نەخێر.. ئەمەیان شتێك نیە موسوڵمان

بیلێت، بەڵکو مەبەست لەوەیە، کە ئەو کۆمەڵگەیەی ئەم ئەحکامە شەرعیانەی بۆ دارێژراوە، کە ئەحکامەکانی بەسەردا دەچەسپێنرێت.. ئەو کۆمەڵگەیەی، کە بەم ئەحکامانە نەبێت ناژی، ئێستا بوونی نیە. بۆیە بوونی ئەو ئەحکامە شەرعیانەش، هیچ جۆرە کاریگەریەکی فیعلی نابێت، مادام کۆمەڵگە موسوڵمانەکەی نەماوە.. پێکهێنانەوەی ئەو کۆمەڵگە موسوڵمانەش بەرپرسیارێتیەکی دینەو لەسەرشانی هەموو موسوڵمانێك فەرزە، کە لە کۆمەڵگەیەکی جاهیلیدا دەژی.. لەسەر یەك یەکی ئەو موسوڵمانانە فەرزە، کە لە پێناوی دامەزراندنەوەی حوکمی ئیسلامی بەرەنگاری جاهیلیەت بکەن و، ڕووە و ڕووی بوەستنەوە. بەو هەڵوێستەش حەتمەن ئەم موسوڵمانە چالاکانەی بزاڤی ئیسلام، دووچاری ئەو هەموو دژواری وکەندو کۆسپ وژان وناسۆرانە دێن، کە تاغووتەکان وجەماوەرە سەر لێ شێواوو نەزان وگومڕاکە دەیهێننە سەر ڕێیان. ئەو جەماوەرە گێلەی فریوی تاغووتانی خواردووەو بەحوکمیان ڕازی بووەو لە شیرکدا مۆڵیووە، بە قسەی تاغووتەکان دەکات و ووزەی خۆی بۆ بەرەی ئەوان دەخاتە گەڕ، ئەمەش خەمێکی تر لای موسوڵمانەکان دروست دەکات..

دەرك کردنی شێوازو چۆنیەتی پێکهێنانی کۆمەڵگەی ئیسلامی (بەو شێوازو ڕێگا نەگۆڕەی، کە ئیسلام خۆی وویستویێتی)، هەنگاوی یەکەمی دەست پێ کردنە.. هەنگاوی یەکەمی هێنانەوەی دینە بۆ بوونێکی عەمەلی کاریگەر.. ئەمەش ڕێسای کارەو لە هەموو کات و شوێنێکدا هەیە.. لە هەر جێیەك جاهیلییەت هەبێ و، ڕەنج وجیهادی ئیسلامیش هاتبێتە مەیدانی بەربەرەکانی وشەڕەپاڵی گۆڕانکاری، هەردەبێ بەم ڕێسایە کار بکرێتەوە.. چونکە ئەو بوونە ئیسلامیە لەو کات و شوێنەدا نامێنێت، کە یاساورێسای جاهیلییەت جێی شەریعەتەکەی خوای گرتۆتەوە، بەتایبەتی لەم ماوەی ئەم دوو سەدەی دواییدا.. سەر زەمین بەتەواوی لە حەقیقەتی بوونی ئیسلامی سڕراوەتەوە، گەرچی منارەو مزگەوت ودروشمی پەرستن هەر ماون.. کە ڕەنگە ئەویش بۆ ئەوە هێڵرابنەوە، تا

غیرەتی ئەو موسولْمانانەش سڕ کەن پێی، کە هێشتا عیزەت و غیرەتتێکیان تێدا ماوە، تا هەست و هۆشیان مەست کەن و ئەو سۆزی دینداریەی لە دڵ ودەرونیاندا، هێشتا بریسکەی دێت بەو (بوون)ە فریوو بخوات و واحاڵی بن، کەهێشتا ئیسلام سەلامەتەو موسلْمانان لە خێرو خۆشیدان.. لە کاتێکدا ئیسلام دەسڕرێتەوەو موسولْمانان ریشەکێش دەکرێن!!

کۆمەڵگەی موسولْمان پێش فەرز بوونی پەرستنەکان دروست بوو.. پێش دروست کردنی مزگەوت لەو رۆژەوە دروست بووە، کە بە خەڵکی ووترا (اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ) ١١ هود/٥٠ خوا بپەرستن: ئەوانیش پەرستیان.. ئەو زەمانەی وای پێ دەفەرمون، هێشتا نوێژ و ڕۆژووحەج فەرز نەبوو بوون! بەڵام مەبەست لە پەرستنەکە، خۆتەسلیم کردن بە خوای پەروەردگارو وەرگرتنی دینەکەی بوو.. ئەو زەمانە هێشتا ئەحکامی شەرعی فەرز نەکرابوو. کاتێك موسولْمانان دینەکەیان وەرگرت وهێنایانە سەر حوکم وبوون بە خاوەن دەسەڵات.. بوون بە دەولەت و ئومەت.. ئیتر پێویستیان بە دیدو هەڵوێستی دینەکە هەبوو، تا بزانن دەربارەی روداوەکان و پێداویستیەکانی کۆمەڵگەکەیان رای چی یە وچۆنە؟ ئەوجا هەندێك ئەحکامی شەرعی بە دەقی قورئان وحەدیس دادەڕێژران و، هەندێکی تریش لەوانە هەڵدەهێنجران.. ئەمەش تەنها شێوازو ڕێگایە وهی تری نیە..

هیچ ڕێگایەك لەوە ئاسانتر نیە، کە هەر لە گەڵ یەکەم دەنگی بانگەوازی ئیسلام، جەماوەر روو بکاتە ئیسلام وبە دەنگیەوە راکات، ئینجا گوێ بۆ ئەحکامی شەرعی شل کات! بەڵام ئەمە هەر (خۆزگەو هیوا) یە، چونکە هەرگیزاو هەرگیز، هیچ جەماوەرێك ئاوا ئاسان و زوو رازی نابێت، دەست لە جاهیلییەت و تاغووت پەرستی هەڵ گرێت و، ڕوو بکاتە پەرستنی خوای تاك و تەنها! بەڵکو حەتمەن هەر دەبێ بەو شێوە هێدی ولەسەرخۆو بەو ڕێگا دوورەدا بێت، کە هەموو جارێك ولە هەموو شوێنێکدا بانگەوازی ئیسلامی پێ بڵاو دەبێتەوە، کە: بە کەسێك دەست پێ دەکات و پاشان کۆمەڵە پێشڕەوێك دروست دەبێت، ئەوجا

پێشڕەوان ڕووبەڕووی جاهیلییەت دەبنەوەو بەرەنگاری دەکەن. جا زۆرتر دەبن وسواریشیان لێ دەگلێت. تووشی ناسۆرو ژان و دەردەسەری دەبن.. بەڵام هەر بەردەوام دەبن و بە ئارامی دەروونیانەوە ئارامگرانە هەر دەمێننەوە، تا خوای گەورە ناوکۆیی نێوانیان دەکات و، جاهیلییەتیان بۆ تێك دەشکێنێت وحەقیان پێ سەردەخات ودەسەڵاتیان دەداتە دەست.. ئینجا جەماوەریش پۆل پۆل دێنە ناو دینەکەوەو بەرنامەکەی دەگرنە بەرو، سیستەمەکەی پیادە دەکەن وئەحکامی شەریعەتەکەی رادەپەڕێنن.. ئاوا بە هەموو لایەنێکی دینەکە رازی دەبن، چونکە دڵنیا دەبن لەوەی، کە هەر کەس غەیری ئیسلام وەرگرێت وبیکاتە ڕێبازو بەرنامەو پرۆگرامی ژیان، لێی وەرناگیرێت و سەرەنجامیش زەرەرمەندی دەبێت. وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: (وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الاخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ) ٣ ال عمران/ ٨٥.

# بەندی شەشەم: خۆرکەی دین[1]

## کۆسپی مەلای ڕەسمی:

زۆرجار ئەوەی، کە دەبێتە خۆرکەو ئەم دینە لە ناوەوە هەڵدەکۆڵێت، ئەو کۆمەڵە شۆێنکەوتوانەی دینەکە خۆیین، کە پێیان دەوترێت: پیاوی دین: (مەلا، شێخ، موفتی، داعی)چونکە خەڵکی وا لە پیاوانی دین چاوەڕێ دەکەن، خۆرە کوژبن. نەك خۆیان ببنە خۆرە. گەر ئەوان خۆرە بوون، دەبێ ئەم دینە چۆن و چەند لە ناوەوە هەڵکۆڵن.. چونکە هەر لەسەرەتاوە ئاسان دەبنە زوڕنا ژەنێکی کاریگەر بەدەست دەسەڵاتدارانەوە، بۆ شێواندن وکەم کردنەوەی کاریگەری حەقیقەتەکانی دین.. ئیتر بەو سیفەتەش، کە مەلاو شێخ وموفتی وداعین، زۆرتر زیانبەخش دەبن. قورئانی پیرۆز بەم سیفەتەو بەو ڕۆڵە سلبیەوەیە، کە باسی دەستەیەك لە ئەهلیکیتاب دەکات: (وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُونَ أَلْسِنَتَهُم بِالْكِتَابِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ الْكِتَابِ وَمَا هُوَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ) ٣ ال عمران ٧٨ واتە: بەڕاستی ئەوانە دەستەیەکیان تێدایە، کە زمانیان وا دەگێڕن (واتە درۆ هەڵدەبەستن)، کە لەگەڵ هەواو هەوەسی خۆیاندا بگونجێت لەوانەی، کە نووسیویانەتەوەو، گوایە ئەمەش هەر تەوراتەو لەلایەن خواوە بۆ یان هاتووە. ڕاستیش ناکەن. ئەوە نە لە تەوراتدایەو، نە لەلایەن خواشەوە بۆیان هاتووە. ئەوانە خۆشیان زۆرباش دەزانن، کە درۆ بە دەم خوای گەورەوە هەڵدەبەستن..

ئەوانە دەقی کتێبە پیرۆزەکانی خۆیان، کە تەفسیر دەکرد، ملی دەقەکانیان وا دەسوڕاند، کە لەگەڵ ئەو ئاڕاستەدا بێنەوە، کە دەیان ویست دەقەکانی بۆ لێکدەنەوە، دەیانوویست دەقەکان وا تەفسیرکەن، کە پاڵپشتی ئەو بڕیارانە بێت،

---

[1] خۆرکە: جۆرە کرمێکی زۆر گچکەیە قەدی درەخت لە ناوەوە هەڵدەکۆڵێت تا کلۆری دەکات و دەیخات.

کە دەسەڵاتداران دەیانوویست دەرچێت! ئەوجا بۆ فریودان دەیان ووت: مانـای ئـەو دەقانە ئاوایە، کە ئێمە تەفسیرمان کردووەو خوای گەورە مەبەستی هەر ئـاوابووە، کە ئێمە لە دەقەکـەی حـاڵی بـووین. لـە کاتێکـدا کـە ئـەو بڕیارانـە بەتـەواوی پێچەوانەی ماناو مەبەستی ئەو دەقانەن. بۆیە ئەمەشیان بۆ دەچێتە سـەر چـونکە زۆرینەی زۆری جەماوەری گوێگر، ناتوانن مانا حەقیقی دەقە دینیەکان و تەفسیری ڕاستیان هەڵاوێرن و، لەو تەفسیرە سەختەو موزەووەرو لێکدانەوە فێڵاویانـەی، کـە بوونەتە پاڵپشتی بڕیاری نارەوای دەسەڵاتداران جیایان بکەنەوە.. لـەم سـەردەمەی خۆماندا نموونەی پیاوی دینی وامان زۆر دیوە.. ئەوانەی بەناڕەوا بوونەتە کـادیری ئەم دینە. ئەوانەی ئەم دینەیان کردۆتە مایەی کارو کاسبی بۆ هەواوهەوەسی ئـەم وئەو، چۆنیان بوێت وا ملی دەسوڕێنن! چۆنیان بوێت وای لێك دەدەنەوە، لـە هـەر کـات و شـوێنێك بینیـان بەرژەوەنـدی خۆیـان دێتـەدی، ئـەو دەقانـە بـەگوێرەی پێداویـستی ئـەو کـات وشـوێنانە لێـك دەدەنـەوە. لـەکوێ بریـق و بـاقی دونیـا دەرکەوت، ئەمان خۆیان وتەفسیرەکەیان لەوێ لە خزمەتتدان! هەڵپەیانە.. بـەدوای هەواو هەوەسـدا وێڵـن.. بـارودۆخ و بەرژەوەنـدی چـۆنی خواسـت، ئـەوا ئـەمان، تەفسیری پڕاوپڕی دەقی دینی دەخەنە خزمەت! مەبەستی دەقـەکان لەبـەر خـاتری بڕیـارو هەڵوێـستی داواکـراو دەگـۆڕن! لـە کاتێکـدا، کـە خۆشـیان دەزانـن لێکدانەوەکەیانپێچەوانەی دینەکەن.. بەڵام ئەوەیان لاپەسـەندترە لـەجیاتی شـوێن کەوتنی حەق، چونکە ئەویان لەگەڵ هەواوهەوەسی خۆیان وئەربابانیاندا دەسـازێت! کام ئیحتیمالەی زۆر دوورەلە مەبەست ومانای دەقـەکان، ئـەو دەکەنـە سـەرەکی! مادام لەگەڵ هەواو هەوەسدا دەسازێت.. کام ئیحتیمالـەش سـەرەکیەو مەبەسـتی سەرەکیدەقەکەیە دەیخەنە لاوە! مادام لەگـەڵ هـەواو هەوەسـدا ناسـازێت. ئینجـا تەفسیرەکەی خۆیان دەکەنە مەبەستە خواییەکە!! (وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ اللّهِ وَمَا هُـوَ مِنْ عِندِ اللّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ) ٣ آل عمـران/٧٨ ئـەم خۆرکەیـە هەر لەناو ئەهلی کیتابـدا نیـە. بـەڵکو لـەناو هـەموو ئوممـەت وگەلێکـدا هەیـە

لەوانەی، کە دینی خوایان لا هەرزانە، لەهەر کۆمەڵێکدا دینداری بووە عادەت ودینەکە بووە کەلەپوورو ڕێزی سووك بوو، ئیتر بازاڕی مەلای دین بەتاڵ وداعی دنیاوویست و فرۆشیارانی دەق گەرم دەبێت. مەلاو موفتی هەلپەرست وداعی دەم هەراش وفێڵزان جمەیان دێ! ڕەواج بە کاسبیەکەیان دەدەن، ئیتر درۆ بەدەم دینی خواوە هێندە دژواری ومەترسی نابێت. لێکدانەوەی دەق بە گوێرەی هەواو هەوەس بۆمەرایی و تەمەلوق وخۆهەڵپەساردن بە سێبەری تاغووتاندا، دەبێتە ئەرك وکارو پیشە! دەبێتە حیکمەت و ژیری و پیاوماقوڵی!! ئەمە نموونەی مەلای دین فرۆشە.. نموونەی (پیاوی دین) ی دۆڕاوە. موفتی گومڕاو، شێخی فریوو، داعی بەزیوو. نموونەی بیری گەندەڵ وشەخسیەتی هەلپەرست وتەقوای ڕزیوو.. ئەوانەی بە دینەکەی خوا دەخۆن وبەو دەژین، بەڵام لە خزمەتی بەرنامەی دژیدان!! ئایەتەکان دەکەنە ماددەی خۆبردنە پێش لە تاغووت بۆ زێدە گومڕای گەلان! بۆ وێڵبازی و فێڵبازی..

ئەم لادەرانە حەزیان لە ڕێچکەو کۆڵان و کوچەی تەنگ وبن بەستە! بۆیە واز لە ڕاستە شەقام دێنن.. حەزیان لە خوارو خێچیە.. بۆیە لە ڕاستگۆیی وسەڕاستی هەڵدێن، چونکە سەر ڕاستی یەك جۆرە. ئەویش پابەند بوونە بە ڕێبازی خواوە. پابەند بوونە بە بەرنامەو شەرعی خواوە.. ئیدی هەرچی هەیە لارو وێرە.. لە ڕێبازی خوا بترازێت گومڕاییە.. چوون بەرەو کوفرو ڕازی بوونە پێی.. چونکە نابێ کەسێك باوەڕی بە ڕۆژی دوایی هەبێت، لەم لاشەوە ڕێبازی ڕاستی خوا وازی لێ بهێنێت و، بکەوێتە سەر ڕێچکەی پڕ هەڵدێرو کوچەی تەنگە بەرو دارماوو بن بەست! لەم لاوە دین وەرگرێت و، لەو لاوە بەر هەڵستی ئیقامەو پیادەکردنی دینەکە بکات.. لەم لاوە لاف و گەزافی دینداری لێ بدات و، لەو لاشەوە لە بەرنامەی شەرعی خوا لابدات: (الَّذِينَ يَصدُّونَ عَن سَبِيلِ اللّـهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِالآخِرَةِ كَافِرُونَ) ٧ الاعراف/ ٤٥ واتە ئەوانەی بەرهەڵستی دینی خوادەکەن ودەیانەوێت ڕێبازەکەی لاروگێڕ کەن و، باوەڕیان بەڕۆژی دوای نییەو پێی کافرن..

ئا ئەمەیە دیمەنی واقیعی و سروشتی ئەو دەروون نزمانەی، کە بۆ هەواو هـەوەس، شەریعەتەکەی خوا دەگۆڕن. ئەمە دیمەنێکی روون و ڕاستی دەروونی وێڵ و پڕفێڵـی ئەو تاقمە دین بەتاڵەیە، کە پێیان دەوترێت: (پیاوانی دین)، ئەوانەی دینەکەیان بۆ دنیاویـستی گۆڕیـووە.. بزانـە چ وەسـفێکی ووردی پێچاوپێـچی ئـەو دەروونـە بەزیوانەی کردووە.

کاتێك ئەم دینە، لە عەقیدەیەکی پاڵپێوەنـەری زینـدووی ژیـان و، داینـەمۆی بزاڤی گۆڕانکاریی دەکرێتە پیشە ومایەی کاسبی؛ مـەلاو شـێخ ومـوفتی وداعیـە دین فرۆشەکان دەبنە خۆرکەی دینەکە! هەر خۆیان ئەوی بە زمان دەیڵێن کاری پێ ناکەن.. ئەوی لە دڵ و دەرونیاندایـە غـەیری ئەوەیـە، کـە سـەرزارەکی دەیڵـێن.. فەرمان بە چاکە دەکەن، بەڵام خۆیان نایکەن. بە خـەڵکی دەڵـێن چـاکەخواز بـن، بەڵام خۆیان رێی چاکە خوازی وێڵ دەکەن ودەکەونە سـەر رێـچکەی دنیاپەرسـتان! ئەحکامـەکانی دین لە جێی خۆیان ناهێڵن و، دەقەکانیان بەجۆرێك تەفسیر دەکەن، کـە خزمـەتی هـەواو هـەوەس و مەبەسـتی خۆیـان بکـات.. تەفـسیرو فتـوای وا دێننەوە، کە لە رواڵەتدا لە دەق وەرگیراون، بەڵام لـە راسـتیدا لەگـەڵ حەقیقـەتی دیندا یەك ناگرنەوەلێك جودان.. دژ بـە یـەکن. دینەکـە لەبـەر خـاتری پـارەدارو دەسەڵاتداران دەگۆڕن. سروشتی ئـەم دینـەش وایـە، هـەر کاتێـك داعیـەك، یـان کادیرێکی ئەم دینە خەڵکی بۆ لای چاکە خوازیی بانگ کـردو، خـۆی پێـچەوانەی ئەوەی ئەنجامدا، حەتمەن گومان لە دڵی خەڵکیدا دروست دەکـات. بـاوەڕی دەروون لاوازەکان دەلەقێنێت. ئیتر گومان هەر بەرامبەر کـابرای مـەلا وشـێخ ومـوفتی و داعیە دنیاویستەکە دروست نابێت، بەڵکو دەگوێزرێتەوە بۆ خودی بانگەوازەکـە. خەڵکی گومان لە راستی ورەوایی دینەکـە دەکـەن.. دەبیـنن دروشـمەکان سـیمای بانگەوازێکی جوان وبەرنامەیەکی پاك وجێ ئومێدێکی باشنە، بەڵام لـەولاوە، کـە دەبینن کادیرە پێشکەوتووەکان، لە مەلا و شێخ و داعیەکانی، بـە رەفتـاری بـەدو کردەوەی ناپەسەند، تینی عەزم و ئیرادەو وویـستیان سـارد دەبێتـەوەو بـەرەو بـێ

ئومێدی دەچن! نوری ئیسلامەتیەکەیان لەبەر چاو کزوکورت دەبێت. ئیتر ووردە ووردە، کە متمانەیان بە (پیاوانی دین) نەما، بە دینەکەشیان نامێنێت

هەر ووشەیەك لە دڵێکی پڕ باوەڕو لە قەناعەتێکی تەواودوە نەیەت، هەر چەندردوانبێژی تام وفامی تێدا بێت، هەر بە مردوویی دەردەپەڕێت و، بێ کاریگەریش دێت ودەڕوات. هیچ قسەیەکیش نابێتە نیشانەی قەناعەت وباوەڕو یەقین، تا خاوەنەکەیژیانی خۆی بە پێی ئەو دانەڕشتبێت و، خۆی پێشتر پێوە پابەند نەکرد بێت و، قسەکەی بەتەواوی لە خۆیدا نەدرەوشاندبێتەوە. هەرکاتێك وهەر کەسێك گوفتاری راست و رەفتاری دروستی وەکو یەك بوون، هەر کەس قسەو کردەوەی بۆ خۆی وخەڵکی وەکو یەك بوون، دەبێتە جێی متمانەی خەڵکی وباوەڕی پێدەکرێت، با زۆر ناتق و رەوانبێژو قسەزانیش نەبێت. با قسەکەشیرەوانبێژانەش نەبێت. چونکە هێزو رێزو کارتێکردنی قسەی وا لەواقیعەکەیەوە دێت، نەك لە بریق وباق وکێش و سەروایەوە، ئەو جۆرە قسەو ئەم جۆرە کەسانە ژیان دەگۆڕن، کە دیدی نوێ دەچەسپێنن. کردنی قسەو کردەوەش بەیەك، وەنەبێت کارێکی هەروا ئاسان بێت.. نا.. ئەوە رەنج و هەوڵدانی زۆری دەوێت. ئەوە راهێنان و مەشقی دەوێت، چونکە چەسپاندنی عەقیدەو باوەڕەکەیە، بەکردەوەو رەوشت ورەفتار.. پراکتیزە کردنی دیدو بۆچوونە فیکرییەکەیە، چەسپاندنی بیروباوەڕەکەیە، بۆیە خۆ کۆنترۆڵ کردنی دەوێت، تەقواو لە خوا ترسانی دەوێت، بەهێزکردنی پەیوەستی وپشتیوانی خوای گەورەی دەوێت، پاڕانەوەو نزاو داوایهاوکاری وپابەندی لە خوای گەورە دەوێت.. چونکە زۆر جار پێداویستی و کێشە واقیعیەکانی ژیان وناچاریی وادەکەن موسوڵمان لە داواکاریەکانی عەقیدەکە دور بخەنەوە! جاری وا هەیە هێزی راکێشان ودنیاوویستی، موسوڵمانان بەرەو لایەکی ترو ئاڕاستەیەکی تر کێش دەکەن، کە پێچەوانەی ئەو ئاڕاستەیە، کە خۆی و بانگەوازەکەی خەڵکەکەی بۆ بانگ دەکەن.. مرۆڤیش لاوازە. بۆیە دەبێت توندترو چاکترو قایمتر، خۆی بەهێزی نەمری خوای

خۆیەوە پەیوەست کات. دەبێت هێزی خۆشەویستی خوای گەورە کاریگەرو بە هێزتر بێت، لەهەموو ئەو هێزە شەڕخوازانەی گەمارۆی دەدەن و، تەوژمی دەخەنە سەر.. نابێت ئەم وا بزانێت خۆی بە خۆیەوە بەهێز بووە.. جاری وا هەیە هێزی شەڕخوازی ئەم کێشمەکێش وزۆرانبازییەی ژیان دەباتەوە.. جاری واش هەیە ئەم، لە لاوازی خۆیەوە دەگلێت.. هەرکەس وابزانێت تەنها بە هێزی خودی خۆی دەتوانێت بەرنگاری جاهیلیەت ببێتەوە، زوو تێك دەشکێت وزۆر زوو شکست دەخوات! چونکە ماندوو دەبێت. تا وای لێ دێتدەکەوێت. پاشان دێتە سەر چۆك وتەسلیم دەبێت. ئینجا هەرچی هەیبوو لەدەستی دەدات: مێژووی رابوردووی خۆی ومێژووی ئێستای وداهاتووی دەدۆڕێنێت! بەڵام کاکەی موسوڵمانی بەتەقواو دیندار، مادام پشتی بەهێزە نەمرە ئەزەلی یەکەی خوای گەورە بەستووە هەر بەهێزە.. لە هەموو هێزێکی بەرامبەر بەهێزترە.. چونکە بەسەر هەواو هەوەسی خۆیدا زاڵ بووە.. بەسەر لاوازی و بێ وورەیی خۆیدا زاڵ بووە.. بەسەر دەرونی خۆیدا زاڵ بوودو نەیهێشتووە بۆ چارەسەر، پێداویستی ژیان وژینی بەر سێبەر تەنازول بکات.. بۆیە ئێستاش وا بەهێزەو بەسەر ئەو هەموو هێزانەشدا زاڵ دەبێت، کە ڕوودوڕووی وەستاونەتەوەو بەرهەڵستی دەکەن

## کلکەمەلا و شێخی تاژی و هەرزە داعی:

چەند مەلا وشێخ ومووفتی وداعیمان دی، ڕاستی دینیان دەزانی وچاکیش شارەزایان بوون، کەچی لایاندا.. بەوەش نەوەستانەوە بەرنامەی تریشیان هێنایە جێی! چەند زانای لەبلەبان و مەلای دوانزە عیلم و زرکەتاڵ و شێخی ناڵ و شاڵ و بەرماڵمان دی، چەند داعی قسەسازان وچالاکمان دی، هەموو زانیاری دینەکەیان خستە خزمەتی تاغووت وملهوڕانیان.. چەند موفتی دەرون بەزیومان دی، فەتوای بۆ قایم کردنی دەسەلاتداری جاهیلی دەداو (حیلە شەرعی) دەکردە بەڵگەی دینی لایەنگرتن و بەشەرعی ناساندنیان.. تا زیاتر بمێننەوەو ڕەگ داکوتن.. چەندمان

لەوانە دی سووربوون لەسەر ئەوەی، دینەکە ڕاکێشنە خزمەتی ئەو لەخواياخی بوو، لە دین دەرچوانەی، کە فرپیان بەسەر ئیسلامەوە نەما بوو، کەچی ئەمان هەر لاف و گەزافی ئیمان وئیسلامەتیان بۆ لێدەدان، مەگەر خوای گەورە لەباسی توتکە داعی ودێڵە مەلا و تانجیە موفتی و گەماڵە شێخدا نا فەرمویٚ: (وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِيَ آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الْغَاوِينَ. وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَلَـكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلَى الارْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ذَّلِكَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا فَاقْصُصِ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ. سَاء مَثَلاً الْقَوْمُ الَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا وَأَنفُسَهُمْ كَانُواْ يَظْلِمُونَ) ٧ الاعراف/ ١٧٥ – ١٧٧ واتە: هەواڵی ئەو کابرایەیان پیٚ ڕابگەیەنە، کە چەندین نیشانەو بەڵگەی خۆمانمان دایێ، کەچی هەر خۆی لەبەر خۆی داماڵی و، شوێن شەیتان کەوت وخۆی بە فەتارەتداو، چووە ڕیزی گومڕاو فەوتاوەکانەوە. گەر حەزمان بکردایە پلەوپایەیان بەو نیشانەو بەڵگانە بەرز دەکردەوە، بەڵام ئەو خۆی باوەشی بە دنیادا کردو وایزانی، کەلە سەرزەوی بەنەمری دەمێنێتەوە. بۆیە ئیتر شوێنی هەواو هەوەسی خۆی کەوت وبەرەڵابوو.. نموونەی ئەو، وەکو سەگ وایە، کە چ ڕاوی نێیت وچغەی لیٚ بکەیت، چ لێی گەڕێیت، ئەو هەر دەمەلاسکێیەتی وزمانی دەرکێشاوە وهانکە هانکێتی! ئەوە نموونەی ئەو کەسانەیە، کە نیشانەو بەڵگەکانمانیان بەدرۆ خستەوە. ئەم چیرۆکەیان بۆ بگێڕەوە، تا بەهۆش خۆ بێنەوەو ئەقڵیان پیٚ بشکێت. نموونەی ئەو کەسانەی نیشانەو بەڵگەکانمانیان بە درۆ خستەوە، بە ڕاستی نموونەی خراپ و بەدە. ئەوانە خۆیان زوڵمیان لە خۆیان کرد.. [1] چ هەواڵێکە بیگەیەنێت؟! ئەمە

---

[1] زۆربەی زۆری ئەهلی تەفسیر ڕایان لەسەر ئەوەیە، کە ئەم کابرایە وەکو سەگی لیٚ هاتووە، کە زانایەکی بەنو ئیسرائیلیەکان بوو، ناوی بەلعەمی کوڕی باعوڕا بوو، شوێن کەوتووی سیدنا موسا بوو. ئەم نارد بووی بۆ شارێك، تا بانگەوازەکەی بڵاو بکاتەوە. بەڵام ئەو کە چووە شارەکە، فەرمانڕەوای شار لە خۆی نزیك کردەوەو تەماعی دنیایی لە سامان و پلەو پایە خستە پێش چاوی، و ئەویش بانگەوازەکەی سیدنا موسای خستە خزمەتی ئەو حاکمەی، کە دژی سیدنا موسا بوو.. بەمەش ئەو ئینحیرافە گەورەیەی کردوو، بوو بە سەگی هار.. بڕوانە: ابن کثیر: تفسیر القران العظیم / ب ٢/ ج١/ ١٩٨٣

هـەواڵی ئـەو کەسـانەیە، کـە نیـشانەو بەڵگـەکانی خـوای پـەروەردگار بـە درۆ دەخەنەوە. دوای ئەوەی بۆیان هاتووەو شارەزای بوون و لێی حاڵی بوون.. ئای ئـەم جۆرە هەواڵە، لەچەند شوێن وکاتدا دووبارە بوونەوە! ئای ئەو کەسانە چـەند زۆرن، کە شارەزای نیشانەو بەڵگەی خوای پەروەردگار دەبن، کەچی پێوەی پابەنـد نـابن! شارەزا دەبن، کەچی دوایی دەیکەنە مایەی گـۆڕین و تـەحریفی دینەکـە.. شـوێن هــەواو هــەوەس دەکــەون.. هەواوهەوەســی خۆیــان وهــەواو هەوەســی ئــەو دەسـەڵاتدارانەی ئـەمان وا دەزانـن رزق ورۆزی وسـامانی دنیـای ئـەمانیان لایـە! زۆرمان دی لەوانەی شارەزای ئەحکامەکانی دینەکـە بـوون، کـە هەمیـشە دەیـان گووت: یاساو رێسادانان مافی خوای گەورەیەو بەس. کەس بۆی نیە ئەو مافـە، نـە بەخۆی و، نە بە کەسی تر بدات، هەر کەسەش بڕیاری ئەو مافە بۆ خۆی بدات، کە بۆی هەیە یاساو رێسا بۆ خەڵکی داڕێژێت، ئەوە خۆی لەو خەڵکە کردووەتـە خـوا. هەر کەسیش وا بکات کافرە. هەر کەسێکیش بەو بڕیارەی ئەو رازی بێت و شوێنی بکەوێت، وەکو ئەو کافرە.. دیمان لەگەڵ ئەم زانین و پەی پێ بردن و شارەزاییەشدا، لەگەڵ ئەم بڕیارو شاهیدی دانەشدا، لە بەر خاتری دنیاویستی، ئینحـرافی دەکـردو رووی دەکردە تاغووتان و دەچووە خزمەتیان و ئیقـراری دەکـرد، کـە مـافی یاسـاو رێسا دانیان هەیە!! مافی خوایەتی پێ دەدان! هەر بەپێی ئەو رێـسایەی، کـە هـەر خۆی لەوەو پێش خەڵکی پـێ بـە کـافر دەناسـاند!! زۆرمـان لەوانـە دی، زۆریـان دەربارەی حەرامێتی سوو (ریبا) نووسی و پاشـانیش فـەتوای حـەڵاڵێتیان دایـەوە! ساڵێك دەیان ووت حەرامەو، ساڵێکی تر دەیـان ووت حەڵاڵـە! زۆرمـان لەوانـە دی، دەست خۆشی لەفەساد دەکردو لایەنگری داوێن پیسی بوو، حەزی بـە بڵاوبوونـەوەی خراپەکاری بوو.. ئەو زەلکـاوو زۆنگـاوەی داوێـن پیـسی وخراپەکارێتیـەی ناودەنـا دینداری! تاج ونەجمەی دەکردە سەر خراپەکاران و ناونیشانی دینی پێدا هەڵدەواسـین! ئەمە چ هەڵوێستێکە؟!. مەگەر هەر ئەوە نیە، کە ئایەتەکـە باسـی دەفـەرموێ: (.. آيَاتِنَا فَانسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِـنَ الْغَـاوِينَ) ٧ الاعـراف/١٧٤ ئەمـە هـەر

وەسفی ئەو مەلا وشێخ وموفتی وداعیە مونحەریفانەیە، کە کادیری مایەپووت وکلکە تاغووتن. ئەوە هەر لە وانەن، کە هێزی حەزی دنیایی چۆکی پێیدادان و نەی هێشت خوای گەورە بەرزیانکاتەوە (وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَلَكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلَى الارْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ) ٧ الاعراف/١٧٤ گەر خوای پەروەردگار بیوویستایە بەو زانیاریەی دەربارەی نیشانەو بەڵگەکانی خۆی دابوویێ بەرزی دەکردەوە.. بەڵام خوای گەورە حەزی بەوە نەکرد. چونکە ئەوکابرایە دوای زانین و شارەزا بوونی دینەکەی خوا، حەزی لەدنیاکردو، وایزانی بە نەمری تێدا دەمێنێتەوە. خۆی دوای پەی پێ بردن و زانین، باوەشی بەدنیادا کردو شوێن هەواوهەوەسی خۆی کەوت وهەڵپە هەڵپی بوو بۆ هێنانە دی حەزو ئارەزوەکانی.. ئەمە نمونەی هەر کەسێکە، کە خوای گەورە زانین و تێگەیشتنی پێ دەبەخشێ، تا شارەزای بەڵگەو نیشانەکانی خۆی دەکات، بەڵام سودی لێ وەرناگرێت و، پێیان ناکەوێتە سەر راستە شەقامی خواویستی.. نیعمەتی باوەڕو پلەی پابەندی وسەرراستی بەخۆی رەوا نابینێت و، خۆی دەکاتە شوێن کەوتوویەکی زەلیلی شەیتان.. تا ئەویش ژێر فشاری دەنێت ودەینێتە ژێر، تا دەیگەیەنێتە پلەی ئاژەڵ، بە تایبەتی توتك و تانجی و سەگی هار!!

باشە ئەو دەمەلاسکێ و قروسکانە بۆ کۆتایی نایێت؟! چونکە لە هەڵپەیەکی بەردەوامەوە دێت، کە بە دووی لەزەتەکانی ژیانەوەیە! ئەم حاڵەتە کەسیفەش دەرچەی سروشتی ئەو وازهێنانە ساویلکەیە لە ئایەت ونیشانەو بەڵگەکانی خوای گەورە.. ئەم هانکە هانکە، نیشانەی پشێوی ناخەو، ناسۆری ئاخەو کۆتایش نایەت. چونکە کابرای توتکی تاغووت، ئامۆژگاری بکەیت ونەکەیت، ئەو تازە بۆ لەتکە نانێ، ڕێی گرتۆتە بەرو تازە بە هەر چوار پەلەوە تێی کەوتووە، زەحمەتە دڵی بێت، یان بیەوێت بێتەوە دواوە.. لە ژیانی دنیادا، لە تەمەنی هەموو نەوەیەك و لەهەموو شوێن وکاتێکدا، زانای وا دەکەونە بەر چاو.. کەم هەیە لەو مەلا وشێخ و موفتی وداعیانە لەو تاقی کردنەوانە دەرچن.. زۆر هەن دەکەون..

هەر ئەوانەیان خۆ دەگرن، کە خوای گەورە دەیان گرێتە خۆ.. ئەوانەی بە ئایەت وبەڵگەو نیشانەکانی خوای گەورە لەبەر خۆ دانامالّن.. ئەوانەی باوەشیان بە دنیادا نەکردووەو، هێندە بە خەمیەوە نین.. ئەوانەی نابنە کۆیلەی ئالقە لە گوێی هەواو هەوەس.. ئەوانەی نابنە گوێ تەپی زەلیلی شەیتان.. ئەوانەی هەڵپە ناکەن بۆ سایەو سامانی سوڵتان.. ئەمە نموونەیەکە، قەت کۆتایی نایەت. هەمیشە هەیەو زوو زووش دەکەوێتە بەرچاو. ئەمە روداوێك نییە، جارێك لە نەوەیەکدا رووی دابێت و، ئێستا بگێڕرێتەوەو، کۆڕی پێ گەرم کرێت! نا.. نەخێرئەمە هەڕەشەی خوای گەورەیەو بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەفەرموێ: بۆیان باس بکە.. بەسەریاندا بخوێنەوە.. بیریان بخەرەوە.. با لەو کاتانەی ئایەتی قورئانیان بۆ دێتە خوارەوە، چاو ببڕنە ئەم نموونەیە.. سەرنج بدەنە هۆکارو ئەنجامی ئەم روداوە.. فەرمانی دا بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، کە بۆ ئوممەتەکەی باس بکەرەوە. بابە حەزەر بن. نەبادا ئەوانیش ئەو ئایەت و بەڵگەنەی خوای گەورە لەبەر خۆ داماڵن.. با نەوە دوای نەوە ئەم ئایەتەی قورئان بخوێننەوە.. با ئەوانەی شارەزای دینەکە دەبن، بە حەزەر بن.. با ئاگایان لەخۆیان بێت. نەکەونە ئەم چارە نووسە ڕەشەوەو، کۆتاییان بە دیمەنی سەگی وا زەلیل و هیلاك بێتەوە! بابە حەزەر بن، نەبادا غافڵ بن وبکەونە ئەو زار داپچڕین وهانکە هانك و زمان دەرکێشانە! هەواوهەوەس نەیانخاتە ئەو هەڵپە هەڵپەی قەت کۆتایی نایەت! نەبادا ئەو زوڵمە لەنەفسی خۆیان بکەن، کە دوژمن لە دوژمنی خۆی ناکات. با چاك بزانن، کە ئەو چارەنووسە ڕەشەو ئەو دۆخە کەساسیە، تەنها ئەوانەی تێ دەکەون، کە ئەو زوڵمەیان لەنەفسی خۆیان کردووە و ئینحرافیان کردووە. ئەوان هێندە چڵێس و چاوچنۆکن لەهەموو کەسێکی تر دەمرێنن.. هەر کەس وەك خۆیان بێت ولێیان نزیك بێتەوە، پێی دەوەڕن و دەکەونە نیزاع و ناکۆکی و شەڕە کەڵبە! هەر وەکو کە سەگەل شەڕیانە لەسەر لاکە تۆپیوو!!

ئەمانە هەر، کە ڕۆژ دەبێتەوە هەڵپەیانە، تا دەچنەوە کولانە، بەو هیوایەی زیاتر لە ئەربابان بچنە پێش.. تا زیاتریان دەسکەوێت.. تا لە تاغووتان نزیکتر ببنەوەو جێی بەرفراوانتر لە دۆزەخدا بۆ خۆیان مسۆگەر کەن! واوەیلا بە حاڵیان.. خوایە بمان گرە خۆت و جێگیرمان کەو ئارامی خۆتمان پێ ببەخشەو موسوڵمانانەش بمان مرێنە..

## ئیسلامی تەزویر:

قورئانی پیرۆز ئەو کات وئێستاش کاری خۆی لەسەرکردایەتی وڕێبەرێتی کۆمەڵگە موسوڵمانەکە دەکات. ئامادەی دەکاتەوە بۆ ئەرکە گرنگەکەی ئەو کۆمەڵگەی بۆ دروست بووە، کەسیش لە قورئان تێ ناگات، گەر بەو شێوە بزاقیە دیراسەی نەکاتەوەبەو سیفەتەی، کە بەرنامەی بوارە بەرفراوانەکانی بزاقی گۆڕانکاری کۆمەڵگەیە. تەنها ئەو کەسانەش لێی حاڵی دەبن، کە پێوەی دەبزوون..

ئیسلام شوێن کەوتووەکانی ئاگادار دەکاتەوە، کە لە تەزویرکاری دینەکەتان بەحەزەر بن ووریا بن، بزاڤودەزگاو دیکۆری قەستی ئیسلامیانەتان لەبەردەمدا قوت نەکەنەوە، لەوانەی لە حەقیقەتەکانی ئیسلام دوورن وزیان بە ئیسلام دەگەیەنن، وەکو دەربارەی مزگەوتی (ضرار)[1] دەفەرموێ: (وَالَّذِينَ اتَّخَذُواْ مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ اللّهَ وَرَسُولَهُ مِن قَبْلُ وَلَيَحْلِفَنَّ إِنْ أَرَدْنَا إِلاَّ الْحُسْنَى وَاللّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ) ٩ التوبة/ ١٠٧ واتە: ئەوانەی، کە مزگەوتێکیان کردەوە، تا لێوەی زیان بەموسوڵمانان بگەیێنن و بیکەنە مایەی تەفرەقەو ناکۆکی نانەوە لە ناو موسوڵماناناداو، لەوێوە زیان بە موسوڵمانان

---

[1] مزگەوتێك بوو، دووڕووەکانی مەدینە دروستیان کردو، پاشان هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وداوایان لێ کرد تەشریف بباتە لایان و نوێژێکیان لە مزگەوتەکەیاندا بۆ بکات. بەڵام خوای گەورە نەیهێشت و پێی فەرموو ئەوە مزگەوتی تەزویرە.. مزگەوتی فێڵە.. جێ فاقەو تەڵەیە. بۆیە پێغەمبەریش (ﷺ) ڕوخاندی.

بگەیەنن وبیکەنە مایەی تەفرەقەو ناکۆکی نانەوە لەناو موسوڵمانانداو، لەوێوە سۆراغی موسوڵمانان بکەن وئامادەی بکەن بۆ ئەوانەی، کە جەنگ بەرامبەر خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن (ﷺ)، ئەمە مزگەوت نی یە.. ئەمە جێ پیلانە! مەبەست لەم مزگەوتە کافربوون بە خواو زیان دانە لە موسوڵمانان.. ئەمە سەنگەری دژ بە ئیسلام و مۆڵگەی فیتنەیە.. بۆ دژایەتی کردنی کۆمەڵە موسوڵمانەکە ساز کراوە، تا لەژێر باڵی دینیدا، لەژێر تارمایی نەخشەو پلانی دوژمن کارانەیاندا، شەرعیەت وەرگرێت. تا دەبێتە هەنگاوی یەکەمی هاوبەشی دوژمنانی دین.. ئەمە مزگەوت نیە.. ئەمە ڕواڵەتێکی تەزویرو دیاردەیەکی جەعلییەو مۆری دینی لێ دراوە تا ببێتە مایەی فریوو دان!

باداعی وپێشڕەوانی ئیسلام لەهەموو کات وشوێنێکدا ئەوە بزانن، کە ئێستاو لە هەموو کاتێکدا مزگەوتی (ضرار)ی تری وا بۆ شێوازی تەزویر ودرۆو دەلەسە دروست دەکرێت.. مەرج نییە هەر مزگەوت بێت. شێوەو جۆری تریش هەیە.. دوژمنانی ئیسلام لەگەڵ پێشڕەفتی ژیاندا شێوەو شێوازی چەپەڵی تر دەگرنە بەر. ڕواڵەتی دەرەوەی جموجوڵ وچالاکی ئیسلامیانەیە، بەڵام لە ناوەرۆك و جەوهەرو ناواخندا پلانی ریشەکێش کردنی ئیسلامەتیە! نەخشەی شێواندن ولاوازکردن و سست کردنی بانگەوازەکەیەتی. (ضرار) ی تر لە دروشمدا دەردەکەوێت. لە لاف و گەزافی ئیسلام خوازی وادا دەردەکەوێت، هەر دەڵێی حەقیقەتی ئیسلامەکەیە! بەڵام لەراستیدا ئەمە کیسەخۆڵی سەر لێواری سەنگەرەو، دوژمنانی خوا لە پشتیەوە خۆیان مەڵاس داوە. لەو دیووەوە تیر دەگرنە ئیسلام.. (ضرار) لە تەنزیمات و پارت وکۆمەڵ ورێکخستنی ئیسلامیانەدا دەخرێتەوە ڕوو.. لە کتێب وباس ولێکۆڵینەوەی ئیسلامیانەدا، دیسان (ضرار) ی تر دەخرێتەوە مەیدان.. هەموو ئەم دیاردەو رەواڵەتانە مۆرکی ئیسلامیان پێوە دەبێت. بەڵام لە حەقیقەتیاندا دووڕوویی ودژایەتی ئەم دینەن.. بۆ ئەو مەبەستە دروست دەکرێن و نیشان دەدرێن، تا خەڵکە ساویلکە دڵ پاکەکەی ئیسلام مەست کەن. تا ئەم

دیندارانە لـە خـۆ گـرن، کـە شـارەزای دەبـەڕێك ڕاچـوون وململانێکـەی ئیـسلام وجاهیلیەت نین. لەوانەی خەم بۆ ئیسلامەتی دەخۆن، بەڵام سەنگەرە راسـتیەکانی ئەهلی ئیسلام ناناسنەوەو نایان دۆزنەوە.. موسوڵمانە سەر راست و پاك وچاکەکان ناناسنەوە. چونکە هەموو هەر سیماو دیاردەی ئیسلامیان پێوەیە!! جا ئەو (ضرار) انە مزگەوت بن یان رێکخستن.. گروپ بن، یان دەزگای ئیـسلامی.. کۆمـەڵ بـن، یان کتێب ولێکۆڵینەوە.. هەرچـی بـن هـەر تـەزویرن.. درۆو دەلەسـەن.. فێـڵ و تەڵەکـەبازین. مەبەسـت لێیـان فریـوودانی موسـوڵمانانە، مەبەسـت سـەر لێ شێواندنیانە، تا سەنگەری ئەهلی ئیسلامیان پێ جوێ نەکرێتەوە.. ئەو (ضرار) انە بە موسوڵمانان دەڵێن: نایەوێت خۆتان هەراسان و ناڕەحەت کـەن. ئـەوەتا ئیـسلام ماوەو لە برەودایەو بێ خەمبن لەبـەر ئـەم فێـڵ ومـەکرو چاوبەسـتەیە، کـە دەبـێ داعیانی ئیسلام وسەر راستانی دین، حەتمەن ئـەم مزگەوتـە (ضـرار) انـە ئاشـکرا کەن.. حەقیقەتیان بناسێنن.. دەبێ ناویان بزڕێنن.. فەزحیان کەن.. دەبێ لافیتـەو دروشمە ساختەکانیان بهێننە خوارەوە، نەهێڵن چاوبەست لەخەڵکی بکرێت.. دەبـێ حەقیقەتی ئەو دروشم و خاوەن دروشمانـە ڕوون ببنـەوە.. دەبـێ مەبەسـتە چـەپەڵ ونیازە خراپەکانیان بۆ خەڵکی کەشف بکرێن و ئاشکرا بکرێن. رماندنی مزگەوتـە (ضرار)ەکەی دووڕووەکانی مەدینە لەلایەن پێغەمبـەرەوە (ﷺ)، دوای ئـەو فـەزح کردنە ئاشکرایەی خوای زاناو کاربـەجێ. ئەمـە هەڵوێـستی شـیاوو کـاری بـەجێ وئەرکی موسوڵمانە سەر راستەکانە و، دەبێ ئیقتیدای پێ بکەنەوە.

# رێــــڕە و ڕێ ناسین

ئیسلام بریتی نییە تەنها لە کۆمەڵە ئامۆژگاری و ڕێنیشاندانێك، یان کۆمەڵـە ڕێساو دەستورێکی ئادابی ڕەوشتیی وبـەس، یـان کۆمەڵـە بڕگەیـەکی ئـەحکامی یاسایی، یان کۆمەڵە تەعلیماتێکی داب ونەریتی کۆمەڵایەتی، کە بـۆ بـارودۆخی تایبەت بشێت.. ئیسلام ئەمانە هەمووی دەگرێتەوە، بێ ئەوەی ئەمانە هـەموویان ببنە ئیسلام.. ئەمانە چ یەك یەك، چ پێکەوە، نابنە هـەموو ئیـسلام، ئەگەرچـی هەر یەکەیان بەشێکە لە ئیسلام.

ئیسلام خۆ تەسلیم کردنە، خۆ دانە بە دەست حـەزو وویـست و ئـیرادەو قـەدەری خوا یە.. ئیسلامەتی هەر لە سەرەتاوە بریتییە لە ملکەچی و گوێ رایـەڵی فـەرمان و بەرهەڵستیەکانی خوای گەورە.. بریتییە لە شوێن کەوتنی ئەو پرۆگرامەی ئیـسلام خۆی دایڕشتووە، بێ سڵ کردنەوەو ڕاڕایی ولاکردنەوە بـە لای هـیچ ئاڕاسـتەو هـیچ تەعلیماتێکی تردا، بێ ئیعتیماد کردنە سەر هیچ بەرنامەیەکی تـر.. ئەمـەش ئـەو باوەڕو هەستەیە، کە مرۆڤ لەم سەر زەمینـەدا ملکـەچ و تەسـلیمی ئـەو سیـستم و ڕێسا خواییە دەکەن، کە بۆی داڕشتوون. خوای گەورە، کە ژیـانی سـەر زەمـین ڕێـك دەخات، هەر وەکو کە ئەستێرەو خولگەکانیانی ڕێك خستووە. باوەڕ هێنـان بـەوەی، کە کاروباری هەموو بونەوەر، شاراوە بن، یان ئاشکرا، دوور بن یان نزیك، ژێری پەی پێ ببات، یان دەرکی پـێ نـەکات، هـەر هـەمووی هـەر خـوای تـاك وپـاك هـەڵی دەسوڕێنێت.. موسوڵمان دەبێت لەمە دڵنیا بێت، دەبێـت قەناعـەتی تـەواوی پێـی هەبێت، یەقینی لا دروست بوو بێت، کە مـرۆڤ بـە هـیچ شـێوەیەك بـۆی نیـە ئـەو سنوورە ببەزێنێت، کە خوای کردگارو خاوەنی دیاری کـردووە. لـە هـەمان کاتیـشدا داوای لێ کراوە، کە هەموو هۆکارێك بۆ سەرفرازی و سەرکەوتن بگرێتـە بـەرو، بـۆ ئەنجامی ڕەنج و بەرهەمی تێکۆشانەکەی، هەر دەبێت چاوەڕوانی قەدەری خوا بێت..

ئەمە ئەو ڕێسایەیە، کە یاساو ڕێساکانی تری لەسەر دادەمـەزرێت، ئـەو پێوانەیـە کە بارودۆخ و داب ونەریتی پێ دەپێورێت، ئاداب و ڕەفتارە ڕەوشتی پێ دەکێشرێت..

ئەم ڕێسایە بە واقیع کردن و چەسپاندنی داواکاریەکانی ئەو عەقیدەیەیـە، کـە لـە نـاخ و ویژدانـدا ڕەگ دادەکوتێـت. دیـاردەو ڕواڵـەتی پابەنـدی وشـوێنەواری کارتێکردنی ئەو خۆ تەسلیم کردنـە بـە خـوای کردگـاری خاوەنـەوەن، کـە دەبنـە بەڵگەی ڕازی بوون و وەرگرتن و پابەند بوون بە ڕێبازەکەی خوای گەورەوە..

ئیسلام عەقیدەیەکە یاسـاو ڕێـسای شـەرعی لێـوە وەردەگیرێـت.. سیـستم و دەسەڵاتی لێوە وەردەگیرێت، کە هەر لەسەر ئەم یاساو ڕێسایانە دەدەمەزرێت، ئەم سێ ڕوکنەش (عەقیدەو شەریعەت ودەسەڵات)، کە لازم و مەلزومی یەکن، پێکەوە دەبن و پێکیشەوە دێن، بە هەموان ئیسلامەکە پێك دەهێنن..

خوای گەورە یەك دڵی بۆ مرۆڤ دروست کردووە: (**مَّا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَـيْنِ فِـي جَوْفِهِ**) ٣٣ **الاحزاب/٤** واتە: خوای گـەورە دوو دڵـی لـە بۆشـایی سـینەی پیاوێکـدا دروست نەکردووە. دڵێکە. بۆیە هەر دەبێت یەك بیروباوەڕیش وەرگرێت، لەسەر یـەك ڕێبازو پابەندی یەك بەرنامە بێت، دەبێت یەك دیدو بۆچوونی دەربارەی ژیان و بـوون هەبێت، کە هەر لەو یەك بیروباوەڕەشەوە هاتبن. دەبێت یەك پێوەریشی هـەبێت، کـە داب ونەریتی پێ دەپێورێت و ڕوداوو واقیعەکانی پێ هەڵ دەسەنگێنرێت.. گـەر وای نـەکرد، حەتمـەن دڵـی یەکپارچـە نامێنێتـەوە، یـەك کەسـێتی بـۆ دانامـەزرێت، سەرگەردان دەبێت، پێچ وپەناو دووڕوویی زۆر دەبێت، هەر جارەو بـۆ هـەر ڕوداوێـك لەسەر ڕایەك دەبێت! حەتمەن وحەتمەن ئاراستەی لێك جوێ وەردەگرێـت و، ناتوانێـت لەسەر یەك ڕێباز خۆ دابین کات و بەرەو یەك لاو لایەن بڕوات..

مرۆڤ ناتوانێت داب ونەریت ورەوشتی لـە سەرچـاوەو ڕێبازێکـەوە وەرگـرێ و، یاساو ڕێساو ئەحکامی حوکمیشی لە سەرچاوەیەکی ترو، چارەسەری کۆمـەڵایـەتی و ئـابوری لـە سەرچـاوەیەکی سـێیەم و دیـد فەلـسەفی و هونـەرو ئەدەبیـشی لـە سەرچاوەیەکی چوارەمەوە وەرگرێت! ئەم تێکەڵاویە مرۆڤێك دانارێـژێت، کـە یـەك

دڵــی هــەبێت! بــەڵکو کەســێك بەرهــەم دەهێنێــت، کــە دڵــی لەگــەڵ هــەموو لاکردنەوەیەکدا دەسوڕێت!

ئەوی خاوەن عەقیدەیە ناتوانێت لەملاوە عەقیدەکەی، کە بە هەقی زانیــوە لــە دڵ وبیروهۆشیدا بچەسپێت، لەولاوەش هەڵوێستی پێــچەوانەی بنوێنێــت! لــەملاوە قەناعەت بە خۆی بکات، کە عەقیدەکەی راستە و لەولاوەش لە رەفتارێکیدا، یــان لە کردارێکیدا بچوك بێت، یان گەورە دژی عەقیدەکــەی، کــە قەناعــەتی تــەواوی بەراســتی و حەقیقــەتی کــردوە، ببێتــەوە.. ناتوانێــت دیــدو بۆچــوون و پێناســەو هەڵوێست و گرفتارو رەفتاری خیلافی قەناعەت وباوەڕەکەی دارێژێت، چونکە خوای گەورە تــەنها دڵێکــی پــێ بەخــشیوە. پێوەرێکیــشی داوەتــێ.. خــاوەن عــەقیــدە ناتوانێت رەفتارێك خیلافی عەقیدەکەی ئەنجام بدات، وپاشان بڵێت مــن ئــەوەم بــە سیفەتی شەخــسی خــۆم کــردووە!! ناتوانێــت بڵــێ هەڵوێــستی شــەرعی لــە فــلان مەسەلەدا ئاوایە، بەڵام من بە ســیفەتی شەخــسی خــۆم جــۆرێکی تــر هەڵوێــست دەگرمە بەر!! ئەوە رەفتاری خاوەن عەقیدە نییــە.. ئــەوە لــە سیاســەتبازو خــاوەن کۆمپانیاو پیاوانی واجیهەی کۆمەڵایەتی و زانــستییەکانی ئــەمڕۆی ناموســوڵمان دەوەشێتەوە، بەڵام لە خاوەن عەقیدەی ئیسلامی؟! نا، نەخێر..

ئەم مرۆڤــە یەکــەو یــەك دڵێــشی هەیــە. هــەر توانــای جــێ بوونــەوەی یــەك عەقیدەشی هەیە. خاوەن عەقیدە یەك دیدی بەرامبەر ژیــان هەیــە، یــەك پێــوەری هەڵسەنگاندنیشی هەیە، دیدو تێڕوانین و پێناســەی بــۆ شــتەکانی دەوروبەریــشی، هەر لە یەك عەقیدەوە سەرچاوەیان گرتووە، هەموو هەڵس وکەوتێکی ژیانی، هــەر مۆرو مۆرکی ئەو عەقیدەیان پێوەیە.. بەم دڵە تاکەیەوەیە، کە وەکــو تــاك دەژی، وەکو ئەندامی خێزانێك رەفتار دەکات، بەم تاکە دڵەوە دەبێتە ئەندامی کۆمەڵێك، بەم تاکە دڵەیەوەیە، کە بە بزاوتی تاکڕەوی وکۆمەڵکاری خۆی، خزمەتی سیستمی دەوڵەتەکەی دەکات. لە هەر گۆشەو کەنارێکی کات وشوێن بژی، هەر ئەو تاکەیە،

کە یەك دڵی پڕ لە عەقیدەو دیدەکەی هەیە. ئاوا لە ژیاندایە، خۆی شاردبێتەوە، یان ئاشکرا بێت هەر ئەوە سیفەتێتی.. کرێکار بێت، یان خاوەن کار، حاکم بێت، یان مەحکوم، دەسەڵاتدار بێت، یان بێ دەسەڵات، لە گرانیدا بژی، یان لە هەرزانیدا، دیدو تێڕوانین و پێوەری ناگۆڕێت.. نرخ وبە ها، شتێك نین بارودۆخ ودەوروبەر بیگۆڕن، یان کات وشوێن کاری تێ بکەن! نا: (**مَّا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ**).

پیاوی خاوەن عەقیدە لەسەر تاکە بەرنامەو پرۆگرامی خۆی نەگۆڕە. ڕێبازەکەی یەکەو سوورە لەسەری، دڵنیایە لە ڕێی وەحی خواییەوە پێی گەیشتووە، قەناعەتی وایە، کە عەقیدەکەی بەرەو یەك ئاراستەی دەبات، بەرەو یەك مەبەست هانی دەدات، بەرەو پابەند بوون و جیددییەتی تەسلیم بوون بە خوای تاك وتەنها.. چونکە دڵی ئەو جێی دوو خوای تێدا نابێتەوە، یەکە دوو خوا ناپەرستێت.. خزمەتی دوو (گەورە) ناکات ودوو ئاراستە وەرناگرێت، بەرەو دوو لاو لایەن ناڕوات. چونکە دەزانێت مومکین نییە دوو خەنجەر لە کالانێکدا جێیان ببێتەوە.. هەر دڵێکیش دوو جۆر پێچەوانە بگرێتە خۆ، حەتمەن هەلا هەلا دەبێت و بۆگەن دەکات..

ئیسلام هەر لەیەکەم هەنگاوەوە سوور بووە لەسەر پاڵفتە کردنی عەقیدە لە خلتەو پلتەی ئەو ئەفسانەو ئینحیرافاتەی، تێکەڵ بە عەقیدەی نەوەکانی پێشوو ببوو. ئەوەندە سوور بوو لەسەر ڕاست کردنەوەی باوەڕو پتەو کردنی عەقیدەکە لە ناخی دڵ و دەروونەکاندا.. چونکە خوابەیەکناسین (التوحيد) ئەو حەقیقەتە سەرەکیە سەرەتاییەیە، کە هەر هەموو بوونی لەسەر دادەمەزرێت. پاشان ئەو بوونەش ئەو شاهیدیە لەسەر یەکخوایی دەدات. خوابەیەکناسین ئەو ڕەگ و ریشاڵەیە، کە هەموو قەدو لق و پۆپێکی ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر ئەو نەبێت، ساڵحانە دانامەزرێت..

## خوایەتی خوا عەبدایەتی ئێمە دەخوازێت:

ئەو هاوەڵ بۆ خوا پەیدا کردنەی، کە قورئان سوور بوو لەسەر پاڵفتە کردنی عەقیدەی خوابەیەکناسی لێی، مەرج نەبووەو، ئێستاش مەرج نییە خوایانێك بن و لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، بەو شێوە سادەو ساکارەی موشریکانی زەمانی جاهیلییەتی پێشوو دایان دەنا، دانرێنەوە بپەرسترێن.. نا، چونکە لەوانەیە ئەو (آلهة وأنداد) انە شاراوە بن. لەوانەیە مەبەست و هیوایەك بن و، بە شێوەیەك لە شێوەکان، بە غەیری خوای خاوەنەوە پەیوەست کرابن. یان ترس و حەزەرێك بن و بە شێوەیەك لە شێوەکانلە غەیری خوای کارزان بکرێن. یان باوەڕو ئیعتیقاداتێك بن بە شێوەیەك لە شێوەکان بە غەیری خوای گەورە هەبن بۆ زیان دوور خستنەوەو سوودبەخشین! لەو شیرکە شاراوانە ئەوەیە، کە ئیبنو عەبباس خوا لێیان ڕازی بێت لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا (فَلاَ تَجْعَلُواْ للّهِ أندَاداً) ٢ البقرة/٢٢ دەفەرموێ: (الأنداد هو الشرك أخفى من دبيب النمل على صفاء سوداء، في ظلمة الليل. وهو أن يقول: واللهِ وحياتِك يا فلانة وحياتي، ويقول: لولا كلبةُ هذا لأتانا اللصوص، ولولا البط في الدار لأتى اللصوص، وقول الرجل لصاحبِه: ما شاءَ اللهُ وشئتَ، وقولُ الرَّجلِ: لولا اللهُ وفلانُ، لا تجعل فيها فلان، فإن هذا كلُّه به شرك)[1]. واتە: شەریك بۆ خوا بڕیار دانی ئەنداد (کە کۆی نددەوبۆ مەزنی وخۆشویستن وپشت پێ بەستنە) بریتیە لە شیرکێك شاراوەتر لە جێ پێی مێروولە لەسەر لەوحێکی ڕەش و لە شەوێکی تاریکدا. ئەو شیرکە ئەوەیە، کە کابرا دەڵێت: فلان خانم بە گیانی تۆ، بە گیانی خۆم[2] یان دەڵێت: ئەگەر ئەو سەگەی ئەوان نەبوایە، دز دەهاتە سەرمان، یان ئەگەر مراوی لە ماڵەکەدا نەبوایە، دز دەهات، یان کابرایەك بە برادەرەکەی دەڵێت: ئەوی خواو تۆ حەز بکەن، یان دەڵێت: ئەگەر خواو فلان کەس نەبوایە.. ئەمە هەر هەمووی

[1] أخرجه ابن أبي حاتم في التفسير (١/٨١)، وقال الشيخ سليمان آل الشيخ: "وسنده جيد". تيسير العزيز الحميد (٥٨٧)، وقال المحقق: "إسناده حسن".

[2] لە کوردەواریدا دەشڵێن بەسەری خۆم و خۆت، بەسەری تۆ نا، بەسەری خۆم..

شیرکە.. هەروەها: **(أن رجلاً قال للنبـي (ﷺ): ما شاء الله وشئت فقال: (أجعلـتني لله نداً؟! بل ما شاء الله وحده)**[١]

قورئانی پیرۆز بە دەیان شێوازو جۆری ئاخاوتن، جەخت لەسەر بـە یەکناسـینی خوای گەورە دەکاتەوە: بە بەیەکناسینی ئەو بەو سیفەتەی، تـەنها پەرسـتراوێکە، کە دەبێت هەموو دروست کراوان (مـەخلوقات) ئـەو بپەرسـتن و ملکەچـی وگـوێ ڕایەڵی هەر بۆ ئەو دەربڕن. بە بەیەکناسینی بەو سیفەتەی، تەنها لایەنێکـە، کـە ڕێساکانی داب ونەریت و ڕەفتارو ڕەوشتی لێ وەردەگیرێت. بـەو سیفەتەی تـەنها سەرچاوەی بنەماکانی یاساو ڕێـساو شـەریعەتە. بـە بەیەکناسـینی بـە وەرگـرتن وپابەند بوون بەو بەرنامەو ڕێبازەی ئەو بۆ مرۆڤایەتی دارشتووە، بەو سیفەتەی کە تەنها پرۆگرامێکە ژیانی مرۆڤایەتی ئاراستە دەکات: **(وَإِلَـهُكُمْ إِلَـهٌ وَاحِـدٌ لاَّ إِلَـهَ إِلا هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ) ٢ البقرة /١٦٣.**

مانای دین و ئیـسلامەتی ئەوەیـە، داوەری خـۆت ببەیتـەوە لای قورئانەکـەی خوای پەروەردگار و ملکەچی بۆ دەربڕیت و پێیەوە پابەند بیـت، ئـەوی وانـەکات، دینی نییە، موسوڵمان نییە، با هەر لاف و گەزافی ئیسلامەتیش لێ بدات. با هەر هاوار کات: خەڵکینە من موسوڵمانم و لەسەر دینی خوام! نا، چونکە دینی خـوای گەورە، هەر خوا خۆی دیاری دەکات کامەیە، هەر ئـەو خـۆی دەیناسـێنێت چـیەو چۆنە، هەر ئەویش خۆی ڕاڤەی دەکات وڕوونی دەکاتەوە. خۆ پێناسەو چـۆنیەتی و ئەحکامی دینی خوا، تەسلیم بە هەواو هەوەسی مرۆڤ نەکراوە، تا بە کەیفی خـۆی پێناسەی کات، خۆ مرۆڤ سەربەست نەکراوە، کە ئادەی خۆتان چۆنتان حەز لێیە وا دینداریی بکەن و چۆن ئەم دینە ڕوون دەکەنەوە، خۆتان ڕوونی بکەنەوە!!

مەسەلەی هەبوونی خوا، زۆر جێـی نکـوڵی کـردن و نـەفی کردنێکـی جیـددی موشریکان نەبووە، چونکە دانیان بەوەدا دەنا، کە خوا هەیەو ئەو کردگـارەو ڕۆزی

---

[١] أخرجه أحمد (١/٢١٤)، والبخاري في الأدب المفرد (٧٨٣)، والنسائي في عمل اليوم والليلة، والطبراني في الكبير (١٣٠٠٥)، وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة (١٣٩).

دەرەو ژێنەرو مرێنەر هەر ئەوە، بکەرو کارگێڕی کاروباری ژیان و گەردوون، هەر ئەویش بە توانایەو بەسەر هەر هەموو شتێکدا زاڵە، بەڵام ئەم ئیعتیراف کردنەیان هەر سەر زارەکی بوو، ئەم باوەڕ هێنانەیان نەدەهاتە ئاستی خۆ بە خوا تەسلیم کردن و پابەند بوون بە داواکاریەکانی ئەم باوەڕە مەعریفییەوە، دەبوو دوای ئەو ئیعتیراف کردنە بە تەواوی خۆ تەسلیم بەوەش کەن، کە تەنها خوای گەورە مافی ئاراستەی ژیانیانی هەیە، دەبوو لەگەڵ باوەڕ هێنان بە خوایەتی خوای گەورە، باوەڕیشان بەپەروەردگاریتی ئەو بهێنایە[١]. پەروەردگاریتی ئەویش واتە خۆتەسلیم کردن بە دینەکەی و وەرگرتنی پەیامەکەی بۆ هەر هەموو لایەنەکانی ژیانی مرۆڤایەتی. واتەوەك نابێت و ناشێت دروشمەکانی پەرستن بۆ غەیری خوای گەورە ئەنجام بدرێن، بە هەمان شێوەش بۆیان نییە غەیری خوای گەورە بکەن بە داوەرو فەرمانڕەوا، بە حەکەم وحاکم بەسەر کاروباری رۆژانەی ژیانی خۆیانەوە. ئەمەشە مانای ئەو ئایەتەی، کە خوای گەورە تێیدا دەفەرموێ: ﴿ذٰلِكُمُ اللّٰهُ رَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ﴾ ١٠ یونس/٣ واتە: ئائەوە خواکەتانە دەبیپەرستن.. پەرستنی خوای گەورەش وەرگرتنی دینەکەیەتی، پێوە پابەند بوونێتی، ملکەچی گوێ بۆ رایەڵ کردنێتی، لەگەڵ ئەم باوەڕو پابەند بوونەشدا، تەئکید لەسەر ئەوەیە، کە تەنها خوای پەروەردگار ئەمە سیفەتێتی و ئەم مافەش بۆ هیچ کەس و شتێکی تر نییە. ئەمەش ئیعتیراف کردنە بە خوایەتی خوا..

لە جاهیلییەتدا هەموو ماناکانی خوایەتی دەپەسترێنە یەك و، هەندێ کەس هەر وای لێك دەدەنەوەو سوورن لەسەر وا ناساندنی، کە باوەڕ هێنان بە هەبوونی خواو خوایەتییەکەی ئیدی بەسە! بێ ئەوەی لا بکەنەوە بە لای ئەو داواکاریانەی، کە ئەم باوەڕ هێنانە فەرزی دەکات، بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەو ئەرك و بەرپرسێتییە لەسەر ئەم باوەڕە دادەمەزرێت! بێ ئەوەی خۆ بکەنە خاوەن ئیلتیزامەکانی تری پەروەردگاریتی خوای گەورە، بێ ئەوەی دینداریتیەکەیان

[١] دیارە کە سەید خوایەتی (الالوهية) و پەروەردگاریتی (الربوبية) لە جێی یەکتری بە کار دەهێنێت، زۆر زانای تر یش هەن وایان کردووە..

تەواو کەن! بێ ئەوەی تەسلیم بەوە بن، کە مـاداخوای پـەروەردگار خاوەنیانـە، دەبێ تەنها ئەو بپەرستن و هەر ئـەویش بـە حـاکمی خۆیـان قبـوڵ بکـەن! هـەر کەسێکیش لە ناویاندا بووە دەسەڵاتدار، ئەوە بە مۆڵـەت و ڕێپێـدانی دینەکـەی ئەوە، نەك بە هێزو شیاوی خۆی!

دیسان لە جاهیلییەتدا هـەموو ماناکـانی پەرسـتن دەپەسـترێنە یـەك و لـە چـەند لایەنێکی پەرستندا گیر دەدرێن! بۆیە ئەو خەڵکە وا حاڵی دەبێت، کە هەر کاتێك ئـەو پەرستنانەی بـۆ خـوای گـەورە ئەنجامـدا، ئـەوە ئـیتر تـەوای ماناکـانی خواپەرسـتی هێناوەتە دی!! ئێ خۆ دەبێت هەر لەسەرەتاوە لەوە حاڵی ببێت کە پەرستن (عیبـادەت) هەر لە (عەبد) ایەتییەوە هاتووە! عەبدایەتی یەعنی ملکەچی و گـوێ ڕایـەڵی، بۆیـە ئەنجامدانی پەرستنەکان، دیمەن ورواڵەتێکی دەربڕینی ئەو ملکەچی و گـوێ ڕایەڵیـەن، نەك هەموو ماناو واتاو دیمەن و رواڵەت و جەوهەرێکی خواپەرستی..

## ئەوی پەروەردگار و کردگارە، دەپەرسترێت:

ئەوی دەپەرسترێت وملکەچی بۆ دەردەبڕرێت وگوێ ڕایەڵی دەکرێت، ئەوی ئـەو مافەی دەدرێتێ، کە هەر بەرنامەی ئەو لە ژیاندا پیادە دەکرێت، خوای کردگـارە، کردگاری هەموو شتێك، کەوا بوو هیچ کەس وهیچ شتێکی تر خـوا نییـە و، هـەر ئەو پەروەردگارە، چونکە خەلقی کردووە: (ذَلِكُمُ اللّهُ رَبُّكُمْ لا إِلَـهَ إِلا هُـوَ خَـالِقُ كُـلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَـيْءٍ وَكِيـلٌ) ٦ الانعـام/١٠٢ واتـە: ئـا ئەوەیـە خـوای پەروەردگارتان، کە هیچ پەرستراوێك جگە لەو نییە، ئەوە کردگاری هەموو شتێك، دەسا بیپەرستن، خۆ ئەو ئاگادراو چاودێری هەموو شتێکە.

تاقانەیی خوا بەوەی تەنها ئەو کردگارە، ئەوە فەرز دەکات، کە تـەنها ئـەویش خاوەن و دەسەڵاتدارە، ئەوی لە خەلق کردن و دەسەڵاتداریدا تاقانەیە، هەر ئـەویش ڕۆزی دەرە، چونکە هەر ئەو کردگاری هەموو مەخلوقاتەو ئەویش خاوەنیانە..

خوای گەورە لەو موڵك وسامانەی خۆی، کە ڕۆزی ئـەو خەڵکـە دەدات، هـیچ کەس لە هیچ پشکێکیدا هاوبەش نییە.. ئەوەی ئەو خەڵکـە لەسـەری د ەژیـن و، ئەوەی لەسەر ڕادەبوێرن ولەزەتی لێ دەکەن، هەر هەمووی موڵکی خوایـەو بـەس، موڵکی تایبەتی ئەوە.. ئەمانە ڕاستین، دەبێت ئەو کاتەی، کە ئـەم ڕاسـتیانە لـە بیری و ژیریدا دەچەسپێن کە: هەر خوای گەورە کردگارەو هەر ئەو خاوەنـەو، هـەر ئەویش ڕۆزی و بژێوی دەدات، دەبێت دەستبەجێ ئەو ڕاستیەی تریش لـەو بـیری و ژیریەدا بچەسپێت، کە پەروەردگارێتی و بەرنامە دارشتنیش پێویـست و حەتمەنـە، کە هەر هی خوای گەورەن. هـەموو ئـەو مافانـەی لـەو پەروەردگارێتیـەوە جـویێ دەبنەوە، هەرهی خوان، وەکو دەسەڵات و بەرپرسیی و ناڕاستەو ئـەو سـەروەرییـەی هەموو دەبێت بۆی ملکەچ بن وگوێڕایـەڵی بکـەن.. دیـاریکردنی ئـەو سیـستم و نەزمەش، کە کۆمەڵگەو ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر دادەمەزرێت، هەر دەبێـت هـی ئەو بێت.. بە مانایەکی تر: دەبێت پەرستن ـ بە هـەموو ماناکانییـەوە ـ هـەر بـۆ خـوا بێـت وبـەس. لـەو مانایانـەش، کـە پەرسـتن دەیانگرێتـە خـۆ: ملکەچـی و گوێڕایەڵی و تەسلیم بوونە..

عەرەبەکان وە نەبێت لە سەردەمی جاهیلیەتیاندا نکوڵییان لەوە کرد بێت، کـە خوا کردگاری ئەم بونەوەرەیە، یان کـە کردگاریئـەم خەڵکەیـەو، ئـەویش ڕۆزییـان دەدات و بژێوییان مسۆگەر دەکات، باوەڕیان بەوە بـوو، کـە هەرچـی خـوا دەیـان داتێ، هەر لە موڵکی خۆیەوەیەتی، دەیانزانی جگە لەو، کـەس خـاوەنی حـەقیقی سامان وموڵك نییە.. بیرمەندو کاربەدەستانی جاهیلییەتەکانی تـریش، جگـە لـە هەندێك فەیلەسووفی ماددی ئیغریقی، ئەم ڕاستیانەیان ئینکار نەدەکرد..

لەبەر ئەوە بوو، کـە ڕووبـەڕوو بوونەوەکـەی ئیـسلام بەرامبـەر ئـەو لادانـەی جاهیلییەتی عەرەبی کە لە خواپەرستندا دروست بـوو بـوو، بەرامبـەر ئـەو هەڵـە حاڵی بوونەیان ڕاوەستایەوە، کـە دەیـانووت: ئـەم بتانـە بـۆ ئـەوە لەگـەڵ خـوادا دەپەرستین، تا تکامان لای خوا بۆ بکەن! تا لە خوامان نزیك کەنەوە! هەروەها لەو

لایەنەوە، کە بە هەڵە وا حاڵی بوو بوون، کە خۆیان بۆیان هەیە بە کەیفی خۆیان وبە گوێرەی دیدو بەرژەوەندی خۆیان، سیستم وشەرع و یاساورێسا بۆ ڕێکخستنی ژیانی خەڵکی دارێژن! وەنەبێت ئیسلام لەو سەردەمەیدا ڕووبەڕوو بوونەوەکەی بۆ ئەوە بوو بێت، کە هەبوونی خوا بسەلمێنێت، وەکو ئەوەی ئێستا لەم سەردەمەدا، دەبێت ڕووە و ڕووی قەرەچەناغی هەندێ هەڵوەڕ ببێتەوە، کە بێ بوونی بەڵگەو زانستی ڕێنمایی و دەلیل، نکوڵی لە هەبوونی خوای پەروەردگار دەکەن!!!

لە راستیدا ئەوانەی، کە باوەڕیان بە خوای پەروەردگار نییە، هەر کەمینەیەکن، هەر واش بە کەمی دەمێننەوە، بەڵام ئەو لادان و ئینحیرافاتەی لە جاهیلییەتیی پێشوودا دروست ببوو، ئێستاش هەر ئەو لادان وئینحیرافەیە، کە لە ئارادایە! ئینحیرافی وەرگرتنی یاساو ڕێسای کۆمەڵگەو، بەرنامەی ژیان لە غەیری خوای پەروەردگارەوە، ئا ئەمەیە بناغەی ئەو جاهیلییەتە عەرەبییەی لەو زەمانەدا دروست بوو، هەر وەکو، کە بناغەی هەموو جاهیلییەتەکانی تریشە کە دروست بوون، یان دروست دەبن..

بۆیە ئەو کەسەی دەیەوێت موسوڵمانی تەواوو ئیمانداری سەرڕاست و یەکخواپەرست بێت، دەبێت حەتمەن حەقیقەتی ئەوخوابەیەکناسین (التوحید)ەی خوای پەروەردگار دەیەوێت، بەو شێوە ڕوون ئاشکراو راشکاویە وەرگرێت، کە قورئان ڕوونی کردۆتەوە.. ئەوی دەیەوێت موسوڵمان بێت، حەتمەن دەبێتبە ڕاست و ڕەوانی لە مانای (لا اله الا الله) تێبگا، بەو شێوەیە دەبێ لێی حاڵی بێت، کە هەموو پێغەمبەرێك بۆ ئوممەتەکەی خۆی ڕوون کردۆتەوە، کە هەر بریتییە لەو شێوەیەی، کە محمد المصطفی (ﷺ) بۆ ئوممەتەکەی و هەموو جیهانیانی ڕوون کردۆتەوە..

کاتێك کابرای ئەعرابی گوێی لێ بوو پێغەمبەر (ﷺ) خەڵکەکە بانگهێشت دەکات بۆ (لا اله الا الله محمد رسول الله) عەرزی پێغەمبەری (ﷺ) کرد: (هذا أمرٌ تَكرَهُهُ الملوكُ) واتە: ئەمە مەسەلەیەکە، کە پاشاکان دەیبوغزێنن! یەکێکی تریش، هەر بە سەلیقەکەی خۆی لەو ململانێیە حاڵی بوو، کە بۆ ئەم دینە نوێیە دێتە

پێش، بۆیە ئەویش بە پێغەمبەری (ﷺ) ووت: (إذنْ تُحارِبُكَ عليها العَرَبُ والعَجَمُ) واتە: جا کەوا بوو عەرەب و عەجەم لە دژت دەجەنگن[١]

ئەم دوو عەرەبە لە واتای زمانەکەی خۆیان حالّی بوون، دەیانزانی ئەم دوو ڕستەیە واتە چی؟ دەیانزانی (لا الە الا اللە) شۆڕشێکەو دژی ئەوانە بەرپا دەکرێت، کە حوکمی مرۆڤەکانی خوای پەروەردگار بە غەیری شەریعەتەکەی ئەو دەکەن.. جا ئیدی ئەو حاکمانە عەرەب بن، یان عەجەم، هەر یەك هەڵوێستیان لەم دینە هەیە! ئەوانە چاك دەیانزانی، کە (لا الە الا اللە) شۆڕشێکە دژی هەواو هەوەس، شۆڕشێکە دژی ئەو بارودۆخ ونەریت وداب و دەستوورانەیە، کە پێچەوانەی ڕێبازو بەرنامەو فەرمانی خوان.. (لا الە الا اللە)یە، کە دڵی خەڵکی دەخرۆشێنێت و ڕێبەریێتی بەندەکانی خوا بەرەو حاکمێتی دینەکەی دەکات!

---

[١] ئەمە قسەی موثەننای کوڕی حاریثەی شەیبانی بوو، کە پێغەمبەر (ﷺ) هۆزەکەی ئەوانی بانگهێشت کرد بۆ ئیسلام، پێی فەرموون (أدعُوكُمْ إلى شَهادةِ أنْ لا إلـهَ إلا الله، وأنّـي رَسولُ اللهِ، وأنْ تُؤْوني وتَمْنَعُوني وتَنْصروني حتَّى أؤدِّيَ عَنِ اللهِ مَا أمَرَني بِه) واتە بۆ ئەوەتان بانگ دەکەم، تا موسوڵمان بن و شایەتمان بهێنن (بڕیار بدەن کە تەنها اللە پەرستراوە، هیچی تر شایەنی پەرستن نیە، بڕیاریش بدەن، کە من نێرراوی خوام، ئینجا داڵدەم بدەن و پشتم بگرن و بەرگریم لێ بکەن و سەرم خەن، تا ئەو ئەرکەم جێبەجێ بکەم، کە خوای گەورە خستوێتیە سەر شانم.. موسەننا پێی ووت: بەڕاستی ئەمەی جەنابت خەڵکی بۆ بانگ دەکەیت ئەوەیە، کە پاشاکان دەیبوغزێنن، ئەمما ئەوی لە ناو تیرەو هۆزی عەرەبەکاندا بەرگریت لێ ناکات، هەنجەتی نییەو عوزری قبوڵ نییە، ئەمما ئەوی لەو دیوو سنووری عەرەبەوە، کە خۆت دەزانی وڵاتی فارسەو ئەوان حوکمی دەکەن، ئەوی لەوێ بەرگریت لێ نەکات، خاوەن هەنجەتەو عوزری قبوڵە.. پێغەمبەریش (ﷺ) بە غیرەت و دلێریەوە وەڵامی دایەوەو فەرمووی: (ما أسأتم الردّ إذا أفصحتم بالصدقِ، إنه لا يقومُ بدين الله إلا مَنْ حاطَهُ مِن جميع جَوانِبِهِ) واتە کە ڕاستگۆیانە وەڵامتان داوەتەوە، کارێکی خراپتان نەکردووە، بەڵام ئەم دینەی خوا هەر بەو کەسانە سەر دەخرێت، کە پەیپیان بە هەموو لایەنەکانی بردووە.. یەکێك لە بەنی عامری کوڕی سەعسەعە لێی پرسی: ئەگەر شوێنت کەوتین و بەسەر ناحەزانتدا سەرکەوتیت، دوای خۆت دەسەڵات بۆ ئێمە دەبێت؟ پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی ئەویش هەر دلێرانەو بێ باکانە دایەوەو فەرمووی: (الأمرُ إلى اللهِ يَضَعُهُ حَيْثَ يَشَاء) واتە: ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ خوای گەورە، دەیداتە هەر کەسێك، کە خۆی حەز بکات بڕوانە: حیاة الصحابة / کاندەهلەوی: ب ١/ لا ٧٤ــ٧٥. هەروەها تەفسیری تەبەری ب ٢ / لا ٨٤.

(لا اله الا الله) ئەو ئالآیە بوو، کە محمد (ﷺ) و پێغەمبەرانی پێشتر سەلامی خوایان لێ بێ بەرزیان کردەوەو خەڵکیان لەژێر سایەیدا کۆکردەوەو، بەرەو ئازادی ورزگار بوون بردیانن، تا لە هەموو دەسەڵاتی زوڵم وستەمی جاهیلییەت قوتاریان کردنبەڵام پێش ئەوە لە هەواو هەوەس وترس ونارەحەتی قوتاریان کردبوون، لە کۆت وزنجیرو هێزی ڕاکێشانی زەوی وحەزی قوڕو خاك وخۆڵ قوتاریان کردبوون، ئینجا لە دەسەڵاتی زوڵم و ستەمی جاهیلییەت رزگاریان کردن و حەساندنیانەوە.. دوای ئەوەی، کە (لا الە الا الله) بووە پەیوەستی دڵان، بووە هۆکاری پێکەوە بەستنی هەموو ئەو خەڵکەی لە ناخیاندا لە دەست خۆیان رزگار کرا بوون، لە پەرستنی هەرچی غەیری خوایە رزگار بوو بوون، لە بەزینی ناخ، لە وورە رووخاوی قوتار بوو بوون، کە لە ناخدا ئازاد بوون، قوتار بوونی دەرەکییان لە ڕێدا ما.. جیددییەتی (لا اله الا الله) لە هەست و بیرو هۆشی ئەو ئەو موسوڵمانە ئازادو رزگارانەدا خۆی گرتبوو، قایم بوو بوو ئەوانە، کە چاك لە زمانی دینەکە، کە هەر زمانی خۆیان بوو تێگەیشتبوون، بۆیە هەر هەموویان لە ناخیاندا یەکلا بوو بوونەوە، قەناعەتی تەواویان بەوە کرد بوو، کە وەك مومکین نییە دڵیان بە خوایەکی ترەوە پەیوەست ببێت، مومکین نیە روویان لە خوایەکی تر بێت، مومکینیش نییە حوکمی شەرعێکی تر قبووڵ کەن، کە بیەوێت هاوشان لەگەڵ (لا اله الا الله) دا بژی!!

ئاوا ئەم تێگەیشتنە قووڵ و سادەیە لە دڵ و دەروونیان چەسپی، بۆیە لە واقیعیشیاندا وا زوو چەسپی، تێگەیشتنەکەی ئەوان، وەکو تێگەیشتنی کزۆڵ وبێ تین وتروسکەی ئەم خەڵکەی ئەمڕۆ نەبوو، کە زۆرینەیان بێ دینیشن و لافی موسوڵمانێتی لێ دەدەن!!

## لەژێر ئالأی (لا اله الا الله) دا:

داعیە ئیسلامیەکان دەبێت ئاشکراو راشکاوانە(لا اله الا الله)کەیان مانا کەن، ئەمە راسپاردەی خوایەو وا لە گەردنیاندا.. دەبێت وەکو روون کردنەوەو ئاشکرا کردنی نوح و پێغەمبەرانی دوا تر سەلامی خوایان لێ بێت بیخەنە روو.. دەبێت حەقیقەتی ئەم شایەتمانە، وەکو خۆی بۆ ئەو خەڵکە بەیان کەن.. چونکە شایەتمان یەکەم بەردی بناغەی باوەڕو روکنی ئیسلامەتییە.. پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (خَيرُ مَا قُلْتُ أنَا والنَّبيُّونَ مِنْ قَبْلِي: لا اله إلا اللهُ وَحْدَهُ لا شَريكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ ولَـهُ الحَمْـدُ وهو عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَـديرٌ)[1] واتە: باشترین شتێك من و پێغەمبەرانی پێش من ووتبێتمان (لا اله إلا الله وَحْدَهُ لا شريكَ لَهُ، لَهُ الُملْكُ ولَه الحَمْدُ وهو عَلى كُلِّ شيءٍ قَديرٌ)ە. واتە شایەتیدان، کە هیچ پەرستراوێکی تر نیە شایانی پەرستن بێت، جگە لە الله، ئەو خوایەیە، کە خاوەنەو دەسەڵاتدارەو سوپاس و ستایش هەر بۆ ئەو دەکرێت و، هەر ئەویش بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە..

شایەتی (لا اله الا الله) شایەتیەکە، خەڵکانێك نارەحەت دەکات و خەڵکانێکی تر دەتۆقێنێت! خەڵکانێك، کە دەسەڵاتیان لەسەر فریوودان و چەواشەکاریی دامەزراندووە، لە بانگەوازی ئەم شایەتمانە دەترسن، دەزانن کە بە شایەتمان لێیان دەسێنرێتەوە!! بەڵام ئەم شایەتمانە روون کردنەوەی سەرلەنوێی دەوێت، تا ئەوەی دەیەوێت موسوڵمان بێت، شایەتمانەکە بهێنێت و بڕیاری لەسەر بدات و ئاشکرا بیڵێت، دەبێت هەر واش بیڵێت، کە مافی خۆی بداتێ، واتە بەو شێوەیە بووترێت، کە خوای گەورە وویستوێتی بڕیاری لەسەر بدرێت. بەو شێوازەش، کە محمد (ﷺ)

---

[1] رواه مالك عن طلحة بن عبيدالله بن كريز مرسلا، وأخرجه الترمذي وحسنه عن عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده بلفظ خير الدعاء دعاء يوم عرفة، وزاد: له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير، ورواه البيهقي عن أبي هريرة بلفظ أفضل الدعاء دعاء يوم عرفة، وأفضل قولي وقول الأنبياء قبلي لا إله إلا الله - الحديث، وزاد بعد وله الحمد: يحيى ويميت بيده الخير هەروەها رواه أصحاب السنن. وأخرج ابن ماجة في سننه عن عبد الله بن كنانة بن عباس بن مرداس السلمي أن أباه أخبره.

ئیعلانی کردووەو ڕوونی کردۆتەوە. ئینجا ئەوی شایەتمان ئاوا دێنێت، با لەسەر کۆسپی ڕێی ئارام بگرێت و تەحەممولی ئەو ناسۆرانە بکات، کە تاغووتان دەیهێننە ڕێی، تا ئەو زەمانەی خوای گەورە بارودۆخەکە دەگەێنێتە ئەو قۆناغی کات و شوێنەی، کە خۆی بڕیاری لەسەر داوە..

ئەگەر موسوڵمانان (لا اله الا الله)یان بە مانای حەقیقەتی خۆی وەرگرت، بە ڕاستی داخڵی ئیسلامەتیەکە دەبن وبە موسوڵمان دەژمێررێن.. جا ئەو کاتە ئەو فەرمایشتەی خوایان بەسەردا دەچەسپێت، کە دەفەرموێ: (**وَلَـن يَجْعَـلَ اللّـهُ لِلْكَـافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً**) ٤ النساء/ ١٤١ واتە خوای گەورە سەرپەرشتیاری موسوڵمانان ناداتە دەست کافران. ئەم بەڵێنەی خوا حەتمییە، ئەمە پەیمانێکی خوایە، کە لەم گەردوونەدالەگەڵ حەقیقەتی باوەڕو حەقیقەتی کوفردا یەك دەگرێتەوە.

بەڵام دەبێت هەر دەم ئاگامان لەوە بێت حەقیقەتی باوەڕ، تێکەڵ بە دیاردەو ڕواڵەتی باوەڕ نەکەین. حەقیقەتی باوەڕو ڕواڵەتی باوەڕ دوو شتی لێك جودان.. حەقیقەتی باوەڕ حەقیقەتێکی چەسپاوو نەگۆڕە، وەکو حەقیقەتی ڕێساکانی تری گەردوونە، کە کاریگەریان لەسەر دەروون و ئەو کردارو ڕەفتارو هەڵوێستانە هەیە، کە لە مرۆڤی ئیمانداراەوە دەردەچن.. حەقیقەتی باوەڕ ڕاستیەکی زۆر گەورەو مەزن و کاریگەری بوون و ژینە، بە تایبەتی لەو کاتانەدا، کە ڕووبەڕووی کوفر دەبێتەوە، ئەمیان لەملاوە چەسپاوو جێگیرو دابینی گەردوونەو، ئەویان نامۆو بێ پەناو لێك ترازاوە، گەرچی هەمیشە کوفر لە هەوڵی ئەوەدا یە، کە باوەڕو باوەڕداران بهێنێتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی، تا بوونی سەربەستی خۆیان نەهێڵێت و زەلیلیان کات. بەڵام کاتێك، کە حەقیقەتی باوەڕ دەبێتە باوەڕێکی دیاردەو ڕواڵەت، ئیدی کوفر بەسەریدا زاڵ دەبێت، چونکە ململانێکە بووە ململانێی حەقیقەتی کوفرو ڕواڵەتی باوەڕ! ئیدی حەتمەن حەقیقەت (کە لەگەڵ خۆیدا ڕاستی کردووە) بەسەر ڕواڵەتدا زاڵ دەبێت، چونکە باوەڕە ڕواڵەتەکە، هەر خۆفش کردنەوەو لاف وگەزافی ئینتیما بوو! ئەمەش سروشت و تەبیعەتی هەموو شتێکە. با ئەویان بشڵێت من باوەڕم و ئەو کوفرە..

کەوا بوو ئەرکی سەرشانی داعیانی ئیسلام ئەوەیە، کـە حەقیقـەتی (لا الـە الا الله) بـە تـەواوی و وەکـو خـۆی روون کەنـەوە، چونکە ئەمـە بناغـەی یەکـەمی بنیاتنـانی عەقیـدەو ویـژدانی موسـوڵمانەو، هـەر ئەمەشـە بناغـەی بنیاتنـانی سەرلەنوێی کۆمـەڵگەی ئیسلامی، دیسانەوە هەر ئەم حەقیقەتەیە، کە دەبێتەوە بـە بناغەی خیلافەتی ئیسلامی لەسەرزەوی.

تاغووتەکان بە درێژایی مێژوو زۆر باش لەوە حاڵی بوون، کـە ئـەو (لا الـە الا الله)یەی موسوڵمانان دەیڵێن، واتە چی؟! بەڵام هەمیشە لە هەوڵی کپ کردنی ئـەو ئیعلانەدا بوون و هەن، ناهێڵن ئەو بانگە ئیسلامیە سەر ڕاستە بە گوێی خەڵکیـدا بدرێت. کە دراش هەوڵی ئەوە دەدەن لێی حاڵی نـەبن، تـا ئـەو خەڵکـە هـەر بـە کۆیلەیی بەرەو دیدو نەریت و سیستم و یاسای خۆیان کێش کەن.. لەبەر ئەمەیـە، کە دەبێت داعیانی ئیسلام ئاڵای (لا اله الا الله)ەکە بەرز ڕاگرن و، لەسەر ڕێبـازی قورئـان و شـێوازی بانگەوازەکـەیان خـۆ گـرن، بـەردەوام بـێ تـرس و بـیم، حەقیەقەتەکەی روون کەنەوە، با دەرسی خەبات و ئارامی و قوربانی دانـیش، لـەو کەڵە پیاوچاکانەی پێش خۆیانەوە وەرگرن، کە ئەم ئیسلامە لە کاروانی بانگـەوازی خۆیدا ریزی کردوون..

## بەندی یەکەم: یەك عەقیـدە

دان نان بـەوە، کـە ئیـسلام پـەیامی خوایـەو لـەوەوە بـۆ حـوکمی کۆمەڵگـەی مرۆڤایەتی هاتووە، تەنها زامنێکە بۆ بەردەوام بوونی ئەو قەناعەت و باوەڕەی، کـە تەنها خوای گـەورە سـەرچـاوەی ئاراسـتەیەو، مـرۆڤ دەبێـت هـەموو بەرنامەیـەکی ڕێکخستنی ژیانی خۆی لەم دینەوە وەرگرێت. تا ڕێ لەو تاغووتانە بگیرێت، کە هەر ڕۆژەی یاسایەك دادەڕێژن و دەڵێن ئەمە یاسای خوایە!! تا ئەو ڕێیـە لـەو تاغووتانـە ببەستێت، کە چاوبەست لەو خەڵکە دەکەن، کە گوایە ئەمەی ئەوان لەسـەرین، هـەر ئەو شەریعەتەیە، کە خوا بۆ پێغەمبەرانی ناردووە، تا شەرعیێتیەکی قەڵب بە خۆیـان و سیستەم ودەسـەڵاتیان ببەخـشن. لـە کاتێکـدا ئاشـکرایە، کـە نـەك هـەر خۆیـان دایانڕشتووە، بەڵکو پێچەوانەی شەریعەتەکەی خواشە..

ئەو کەسانەی، کە وا لە سەر ئیسلام دەنووسن، کـە یەکـەمین دینێکـە ئـاوا بـە ڕوونی خوابەیەکناسین باس کردبێت، یان عەقیدەیەکی کامیل وتێروتەواو، دەربـارەی وەحی و پێغەمبەران و پەیامەکانیان هێناوە، یان باسەکانی ڕۆژی دوایی و پاداشت و سزای ئەو دنیای ئاوا بە ڕاشکاوی و ڕۆشنی بەیان کردووە!! ئەمانە بە حسابی خۆیـان بەرگری لە ئیسلام دەکەن، بەڵام لـە ڕاسـتیدا ئەمانـە هـەموو قورئـان بـە تـەواوی ناخوێننەوە، ئەگەر بە تـەواوی بیانخوێندایەتـەوە، لـەوە حـاڵی دەبـوون، کـە خـوای پەروەردگار هەموو پێغەمبەران ونێرراوانی خۆی سلاوی خوایان لێ بێـت، هـەر بـەو خوابەیەکناسـینیەوەی نـاردوون، هـەموویان هـەر ئـەو خوابەیەکناسـینیەیان ڕوون کردۆتەوە، بـێ ئـەوەی لای هیـچیان دیـد لێڵـی شـیرك لـە هـیچ شـێوەیەکیدا تـێ کەوتبێت، هەر هەمووشیان هـەر حەقیقـەتی وەحـی وپـەیامی خـوایی ونێـرراوێتی خوایان بۆ گـەلان ومیللـەتانی خۆیـان ڕوون کردۆتـەوە، ئـەوەیان بـۆ هـەموان ڕوون کردۆتەوە، کە ئەمـان هەرچەندە پێغەمبەری هەڵبژاردەی خوای گەورەن، بەڵام ناتوانن

زیان، یان سوود بە کەس بگەیێنن، هیچ نادیار(غیب)ێك نازانن، مەگەر خوای گـەورە پێی راگەیاندبن.. ناتوانن و بۆیان نییە رزقی کەس بدەن، یـان لـە کەسـی بگرنـەوە. هەموویان مژدەی سـەرفرازی رۆژی دوایـی و ئینـزاری هەرەشـەی خوایـان بـە گـەل ومیللەتانی خۆیان گەیاندووەو، هەموو ئەو راستیانەی لە عەقیدەی ئیسلامدا هـەن، ئەو بەرێزانەش هەر هەموویان بەیان کردووە، ئەم قورئانەش، کە کۆتا پەیامی خـوای گەرەدیە، شایەتی لەسەر ئەو ئەنجامدانانە دەدات.

ئەو جۆرە قسەو ئەو جۆرە (بەرگری)یانە، ئاسەواری دیدو رۆشـنبیری و کلتـوری ئـەوروپان، کـە دەڵـێن بنـەمای هـەموو بیروبـاوەڕە دینییـەکان، هـی دینـە ئاسمانیـەکانیش لەگـەڵ پێـشرەوت وپێـشکەوتن وچـاوکردنەوەی کۆمەڵگـەی مرۆڤایەتیدا پێگەیشتووەو، شان بەشانی ئەو نەش ونمای کردووە..

کەوا بوو دەبێت نوسەران و داعیان لەوە ئاگادار بن، هۆشیان لای ئەوە بێت، بە نەزانین بە بەهانەی ئەوەی، گوایە بەرگری لە ئیسلام دەکەن، ئـەو بنەمایانـە هـەڵ نەتەکێنن، کە قورئان روونی کردوونەتەوە.. ئەمە لێژگەیەکی دژوارە..

ئیسلام کۆتا پەیامە، قەدەری خوای گەورەش وای وویـستووە، کـە تـا کۆتـایی هـاتنی رەچـەڵەکی مرۆڤایـەتی لـە سـەر ئـەم زەمینـە دەمێنێـت، دەبـێ ئـەو بەرنامەیەی، کە دەبێ هەر بمێنێت ومرۆڤایەتی وەری بگرێت وپێوەی پابەند بێـت، هەر بەرنامەکەی ئیسلام بێ و بەس. دەبێ ژیـانی مرۆڤایـەتی بـە گـوێرەی دیـدو رێساکانی ئیسلام دابمەزرێت و، هەموو گۆشەو کەنارێکی ژیان هەر ئـەم ئیـسلامە ئاراسـتەی کـات و بـەس.. بۆیـە خـوای کـارزان ئـەم بەرنامەیەشـی وا گـشتگیر دارشتووە، کە وەڵامی هەموو پێداویـستیەکانی مرۆڤایـەتی بداتـەوەو بـە دەنـگ هـەموو داواکاریـەکانی ژیانیـەوە بێـت.. وورەو ووزەکـانی ئـەم مرڤایەتیـەش وا ئاراستە دەکات، کە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی پێ بەرزکاتەوە بۆ ئەو ئاستەی شیاوی ئەو مرۆڤەیە، کە خوای گەورە بە جێنشینی خۆی داناوە لەسەر زەوی. مـرۆڤ، ئـەو

زیندەودرە بەڕێزەیە، کە خوای گەورە لە هەمـوو مەخلووقاتێکی تر زیاتر ڕێزی لێناو لە ڕۆحی خۆی فووی پێدا کرد..

ئیسلامە، کە دەیەوێت ئەم ژیانە بە سروشتی دینی خۆیبەرەو پێش ببات، بە زۆرکردن ونەش ونما، بە پاککردنەوەو بەرز کردنەوە، ئیسلام هیچ ووزەیەکی پەك نەخستووە، هیچ ئامادەباشییەکی نەتاساندووە، بەڵکو ووزەکانی زیاتر گەشاندۆتەوە و ئامادەباشییەکانی زیاتر گورج کردۆتەوە، لە هەمان کاتیشدا پارسەنگی ئەو بەرەو پێش چوونەی ڕاگرتووە، کە وا لە نێوان بەرەو پێش چوون وبەرەو ئاسۆ بەرز بوونەوە، کە لە لایەکەوە ڕۆح لە دنیادا بۆ نیعمەتەکانی قیامەت ئامادە دەکات و، لە لایەکی تریشەوە ڕێی ئەو لەزەتانەش بۆ جەستە دەکاتەوە، کە لەش ساغ و پارسەنگ رادەگرن ودەیخەنە کار، لە کێڵگەی دنیادا بۆ دروێنەی ڕۆژی دوایی..

خوای گەورە وویستی وا بوو، کە سروشتی ئەم عەقیدەیە ئاوا بێت، پێغەمبەرەکەشی (ﷺ) ئاوا بۆ هەڵبژارد: مرۆڤێکەو هەموو گۆشەو کەنارێکی عەقیدەکەی تێدا دەدرەوشێتەوە، هەموو ڕاستیەکانی عەقیدەی تێدا چەسپیووە، بە شێوەیەکی وا ئاوێتە بوو کە پێغەمبەرە نازدارەکە (ﷺ) بە ڕەفتارو هەڵسو کەوتەکانی ژیانی، بۆتە جێبەجێ کردنو پراکتیزەی عەقیدەکە، بۆتە ئەو قاڵبەی هەموو عەقیدەکەی لەخۆ گرتووە! مرۆڤێکە، بەڵام هەموو جۆرە ووزەکانی مرۆڤی تێدا خراوەتە کار: هەموو ئەندامانی لاشەی ساغ و تەواون، جەستەی پتەوەو بە خۆیە، بنیاتی بەدەنی ڕاست و دروست هەڵچووە، هەموو هەستەوەرەکانی ساغ و سەلیمن، هەستی ناسکەو سۆزی هەستیارو سرکە، کە هەست بە شتێك دەکات، بە تەواوی دەیگرێتە خۆ، لەزەتی لە جوانیدایەو خرۆشانی وا لە لوتکەی بەرجەستەییدا، ئامێری وەڵامدانەوەی هێندە زیتو ووریایەو تێگەیشتنی لەگەڵ بزاوتی ڕووداودا ئامادەیە، لەگەڵ ئەمانەشدا بیری بەرفراوانو ژیری ڕەهایە، زوو پەی بە شت دەبات، ئیدراکی خێرایە! ئاسۆی دیدو بیری وەك گۆشە نیگای کراوەو دوورە، وویست و ئیرادەی کۆنترۆڵە، ئارەزووەکانی

لە دەست خۆیدان، بێ ئەوەی لە ساتێکدا بهێڵێت بکەوێتە ژێر کاریگەری هیچ حەزێکیەوە! پێش ئەم سیفەتانەو لەسەر هەمووشیانەوە، پێغەمبەرە! گەشەکردنی رۆحی بە نورێکی پاك و سافە، کیانی زۆر بە هەیبەت و دامەزراوە، بۆیە وەحی ئیستیعاب دەکات و ئیسراو میعراج دەبڕێت! پەی بە بانگێشتی ئاسمان دەکات و نووری خوای خۆی دەناسێت، حەقیقەتی هەموو بونەوەری لەبەر چاوەو، سەر لە بوونی هەموو جۆرو شێوەو شێوازەکانی بوون دەردەکات!! بەردو چەو سلاوی لێ دەکەن و قەدی دارخورما بۆی لەسۆزدایە، کێوی ئوحود لە حەشمەتیدا دەلەرزێ.. ئوحودی، چیای رێك و قیت!! کە هەر هەموو ئەم سیفەت و رەفتارانە بەو پارسەنگیە دەپێوێ، کە عەقیدەکە دەیەوێت، دەبینیت کتومت عەینی یەکن.. چەند ئەویان لە رووی تیۆرەوە موتەکامیلە، ئەمیشیان ئەوەندە لە رووی عەمەلییەوە موتەکامیلە!!..

باوەڕ هێنان بە پەیامەکانی خوای گەورەو بە پێغەمبەرەکانی، بێ ئەوەی جیاوازی بخرێتە نێوان هیچ کامێکیانەوە، یەکێکە لە داواکارییە سروشتییەکانی باوەڕ هێنان بە خوای گەورە وەکو، کە ئیسلام داوای کردووە: (وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ) ٢ البقرة/ ٢٨٥ واتە: بڕواداران هەموویان باوەڕیان بە خواو بە فریشتەکانیو بە پەیامو پێغەمبەرەکانی هێناوە، جیاوازی ناخەنە نێوان هیچ یەکێك لە پێغەمبەرەکانی خواوە..

باوەڕ هێنان بە خوای پەروەردگار ئەوە دەخوازێت، کە باوەڕ بە هەموو ئەوانە بهێنرێت، کە لەلایەن خوای گەورەوە هاتوون، هەروەها باوەڕ بە راستگۆیی هەموو نێرراوان و پێغەمبەرانی خوای گەورە، دیسان بەوەی، کە هەموو ئەو بنەماو بنچینانەی پەیام وبانگەوازی هەموویانی لەسەر دامەزراوە هەر یەکن، باوەڕ هێنان لە ئیسلامدا، ئا بەو شێوەیە بۆیە لە دڵی هیچ موسوڵمانێکدا، جیاوازی لە نێوان هیچ کام لەو پێغەمبەرە بەڕێزانەدا دروست نابێت، چونکە موسوڵمان لەوە دڵنیا دەبێت، کە پەیامی هەر یەکێکیان، کە لەسەر بنچینەو بنەمای هاوبەش

دامەزراون، بەڵام بە گوێرەی پێداویستی قۆناغی ئەو قەومانە هاتوون، کە بۆیان نێرراون. تا حاڵ گەیشتۆتە سەردەمی (محمد)ی پێشەواو کۆتای پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت. کە ئیتر پەیامەکەی ئەم بۆتە کۆتا پەیامی پێغەمبەرایەتی و، دینەکەشی بۆتە ئەو بەرنامەی، تا ڕۆژی دوایی مرۆڤایەتی بۆ بانگ دەکرێت، تا بە دەنگیەوە بێن و وەری گرن و لە ژیان و کۆمەڵگەکانیاندا بیچەسپێنن.

ئەم ئوممەتە موسوڵمانە، کەلەپووری پەیامی پێغەمبەران ئاوا وەردەگرێت، دینەکەی خوای گەورەش بەم دیدەوە بەرقەرار دەکات، میراتگرێتی پەیامی پێغەمبەران ئاوایە، بۆیە موسوڵمانان هەست بە گەورەیی‌و گرنگی ڕۆڵی خۆیان‌و بوونی دین‌و بانگەوازەکەیان دەکەن، دەزانن ئەو ئەرکەی لە دنیادا تا قیامەت خراوەتە سەر شانیان چەندەو چۆنە، دەزانن، کە ئەمان پاسەوان و ئێشککگری ئەو گەنجینە بەقەدرەی مرۆڤایەتین، کە بە درێژایی مێژووی خۆی کۆی کردۆتەوە.. موسوڵمانان ئا بەم دیدو بۆچوون و پێناسەو ئەرك و ڕۆڵەوە، ڕووبەڕووی بانگەوازی جاهیلییەتی ئەمڕۆ دەبنەوەولەژێر ئەم ئاڵایەی پێغەمبەراندا سەلامی خوایان لێ بێت، بەرامبەر بە ئاڵای جاهیلییەتی ناسیۆنالیستی‌و نیشتمانپەرستی و ڕەگەزپەرستی‌و زایۆنی‌و خاچپەرستی‌و ئیستیعمارو مسقۆفی (ئیلحاد)و، باقی تری دروشم‌و بیروباوەڕەکانی تری جاهیلییەتی، هەموو کات وجێیەك دەوەستنەوە..

ئەو گەنجینە ئیمانییەی، کە پاسەوانێتی وپاراستنی لەسەر زەمیندا، بە ئوممەتی موسوڵمان سپێرراوە ئەوەی، کە بەم ئوممەتەی میراتگری پێغەمبەرانە سپێرراوە، بەڕێزترین‌و گرنگترین‌و بە نرخترین گەنجینەو بەهای مێژووی ژیانی هەموو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییە، گەنجینەی هیدایەتی خوایی ورێنمایی ونووری ڕێنیشاندانی خواوویستییە، گەنجینەی متمانەو ئاسوودەیی‌و هێمنیە، گەنجینەی قەناعەت‌و ڕازی بوون‌و بەختەوەرییە، گەنجینەی مەعریفەت‌و دڵنیاییە. هەر دڵێك لەم گەنجینەی تێدا نەبێت تاریکە، نارەحەتە، نقومی وەسوەسەو ڕاڕاییە، پڕە لە خەم و پەژارەو هەستی مەحرووم بوون، کەلەو پڕە لە ناسۆرو ژان، ئەوی دوورە لەم نوورە، ڕێ بزرو گومڕایەو نازانێت پێ لە کوێ دانێت و ڕوو لە کوێ کات..

هات و هاواری خاوەن ئەو دڵە خاڵی و دەروونە بەتاڵانەی لە نووری خواوویستی مەحرووم بوون، لە هەموو سەردەم وشوێنێکدا لاڵانەوەو کڕووزانەوە بووە، هەر ئاهی ژان و ژانی مەینەتی بووە، ئەمە هی دڵانێك بووە، کە هەستی نێدا مابوو بێت، ئەگینا ئەوەی رقن و هەست مردوو بووە، یان سڕو تاساو کەوتووە، ئەوە کەلاکی رزیوو بووە، نە شەوقی قوتار بوونی تێدا ماوەو، نە شەیدای زانین و هیدایەت بووە.. بۆیە بوونی لەسەر زەمیندا، هەر وەك بوونی گاو گۆلك بووەو هۆشی هەر لە لەوەڕ بووە، یان هەر وەکو ئاژەڵی دڕندە، لەگەڵ ئەم و ئەو کەوتۆتە شەڕە قۆچ و جووتەو لەقە! مەگەر ئەو هەموو زوڵم و جەبەرووت و دەستدرێژی و خراپەکارییەی دروست دەبوو، لە کوێوە سەری هەڵ دەدا؟! ئەمانە هەمووی لە تاریکی جاهیلییەوە سەری دەردەهێنا، بۆیە هەمیشەو بە درێژایی مێژوو، بەر نەفرینی خەڵکی و لەعنەتی خوای گەورە دەکەوت..

ئەو کۆمەڵگانەی لە هیدایەتی خوایی بێ بەشن، کۆمەڵگەی پشێوو پڕ ناسۆرو موبتەلان، با بەرهەمیشیان لە هەندێ شتدا کەڵەکە بوو بێت، با ئازادی ومافی وناشتیشیان مسۆگەر بێت، با ئەمنیەتیشیان پایەدار بێت، بەڵام هەر ئاڵۆزو پڕ موعاناتن، ئەوەش لاپەڕەکانی مێژوو، بڕوانن چەند نموونەی زەقی ئاوای تۆمار کردووە، خۆ کەس ناتوانێت نکوڵی لەم راستیە بکات، مەگەر ئەو گەلۆرو موستەهتیرانەی گوێ بە هیچ بەهایەك نادەن..

# بەندی دووەم: یەك پەیام و یەك پێغەمبەرێتی

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ اللَّـهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ)٢ البقرة/ ٢٥٣
واتە: ئەو نێرراوانەی خوا (کە پێشتر باسی فەرموون) ڕێزو پلەی هەندێکیانمان داوە بەسەر هەندێکی تریاندا، هەیانە خوای گەورە راستەخۆ لەگەڵیدا دواوەو پلەو پایەی هەندێکی تریانی بەرز کردۆتەوە، چەندین بەڵگەو نیشانەی روونی پێغەمبەرێتیمان بە عیسای کوڕی مەریەم بەخشی و لایەنگریشی بووین و بە جوبرەئیلیش پشتیوانیمان لێ دەکرد..

یەکەمین دەرسێکی خۆش، کە لەم ئایەتەوە روون دەبێتەوە، ئەو دەستەواژە رەوانبێژییەی (تلك الرسل) ە، سەرنج بدە، نەیفەرمووە (هؤلاء الرسل)، کە مەبەست و مانایەکی زۆر بەهێزی تێدایە، جێی خۆیەتی هەندێك لایەنی لێ باس بکەین:

(تلك الرسل) ئەمانە پێش هەموو شتێك کۆمەڵێکن، سروشتی هەموانیان وەکو یەکە، بەڵێ هەموویان هەر مرۆڤن، بەڵام هەموو لە یەك شێوازو رەفتارن، ئەمانە کێن؟! پەیامییان چییە؟ سروشتی خۆیان و پەیامەکەیان چییە؟ ئەم پەیامە چۆن دەکرێتە عەمەلی؟ ئەدی بۆچی لە نێو ئەم هەموو جیهانیانەدا، هەر ئەوان بە نێرراوی خوای پەروەردگار هەڵبژێرراون؟ بە چییەوە نێرراون؟!

ئەمانە کۆمەڵە پرسیارێکی کۆنن، هەموو جارێك بە مێشکمدا دەهاتن و دەچوون، هەر خۆم لە وەڵامدانەوەیان دەبوارد! چونکە هەموو هەست وهۆش و کیانمی بۆ دەخرۆشا، هەر چەندم دەکرد ووشەو دەستەواژەی وام چنگ نەدەکەوت ئەو هەستە خرۆشاوەم تەعبیر کات، ئێستاش هەر وام، بەڵام ئەمجارەیان ناچارم هەر چۆنێك بێت، ووشەو تەعبیراتێکی وا بدۆزمەوە بە لانی کەمەوە بتوانێت وێنەیەکی ئەو هەست و هۆشەم بکێشێت..

ئا ئەم گەردوونەی ئێمەی تێدا دەژیــن و بــووین بــە بەشـێك لێــی، کۆمــەڵێك سیستم و ڕێسای ڕەسەن و کۆنی خــۆی هەیــە، کــە هــەموو بونیــادی گــەردوون و ژیانەکەی لەسەر وەستاوە، ئەم سیستمە هەر ئەو دەستورو یاسا گەردوونیانەیە، کە خوای کردگار بۆی دارِشتووە، تا بە گوێرەی ئەو ببزوێت ولەســەر خولگــەکانی ئــەو بڕوات و، ڕەفتاری ڕۆژانەشی بە پێی نەسەقی ئەو بێــت، کــە لەگــەڵ هــەموو تــاك تاکەکانی بوونــدا دەســازێت. مــرۆڤیش، تــا زیــاتر زانــستی بــەرفراوانتر ببێــت و نهێنیەکانی گەردوونی زیاتر بۆ دەربکەوێت و، پەی بە پەنهانیەکانی بــوون بکــات، جار بۆ جار و پلە بە پلە بەرچاو ڕوونتر دەبێت، لەگەڵ بەرفراوان بوونی گۆشە نیگاو ئیدراکی خۆیدا، جار بۆ جار شتی نوێ تری بۆ بەدەردەکەوێ، ئەگەر خۆی بــە پێــی ڕێسا شەرعیەکەی خوای گەورە ببزوێت، ئــەو بەدەرکــەوتن و ئیــدراك و پــەی پــێ بردنــە نوێیانــەی، زیــاتری هــان دەدەن و زیــاتری هاوکــاری دەکــەن لــە ڕەوتــی خەلیفایەتی سەر زەمینیدا، زیاتر دەبنە هۆکاری سەرکەوتنی، لە جێنشینێتی سەر زەوی و بەختەوەری خۆی و کۆمەڵگەکەیدا..

مرۆڤ بۆ ئەوەی بە تەواوی پەی بەم بوونە بەرفراوان و پڕ نهێنییە ببات، دەبێــت ئیعتیماد بکاتە سەر دوو هۆکار، کە هەر بە پێی پێــوەری خــۆیین، ئــەو دووانــەش بریتین لە: تێبینی کردن و تاقی کردنەوە(تەجروبە)، ئەمانــە لــە سروشــتی خۆیانــدا بەش بەشن، بەڵام کۆتایی نایەن و ئەنجامەکانیشیان ڕەهاو بێ ســنوورن. دەبینیــت جاری وا هەیە ئەم دوو هۆکارە پێکەوە، یان بــە یــەکێکیان مــرۆڤ لــە ماوەیــەکی دوورو درێژو دوای ماندوو بوونێکی زۆر، دەگاتە دۆزینــەوەی کۆمــەڵێك سیــستم و ڕێسای گەردوون، کە ئەگەر ووریا نەبێت بە هەڵــەدا دەچێــت، چــونکە وا دەزانێــت ئەمەی دۆزیویە تیەوە هەموو ڕێساکەیە، کەچــی دوای ماوەیــەکی تــر زانــای تــر، لایەکی تری هەمان ڕێسا دەدۆزنەوە دەکەن، ئەمانــەی دووەم هەســت دەکــەن، کــە ئەوەی ئەوانەی یەکەم دۆزیبویانەوە، هەر وەکو ســەرە داوێکــی ڕێــساکەیە!! بۆیــە هەرچی لایەنێك لەو ڕێسا گەردوونیانە بۆ مرۆڤ کەشف ببێت، نابێــت پێیــان هــەڵ

خەڵەتێ و وا بزانێت هەموو ڕێسا گەردوونیەکە هەر ئەوەیە، کە دۆزراوەتەوە، چونکە ڕێسای گەردوونی وبوون و ژیان، زۆر بەر بڵاوو ڕەهاو بێ سنوورن.. چونکە ئەو لایەنە شاراوانەی خودی بوون، هێشتا نەدۆزراونەتەوە، دیسان ئەو ڕێسایانەی بوونەکەیان پێ کەشف دەدۆزریتەوە، ئەمانیش هێشتا بەتەواوی نەدۆزراونەتەوە، ئینجا دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان جوزئیاتەکانی گەردوون وڕێساکانی ژیانیش، کۆمەڵێك نهێنی ترن! بەڵام جار بۆ جار لەگەڵ پێشکەوتنی زانست وپەی پێ بردنی مرۆڤ وبەرفراوان بوونی گۆشە نیگاو ئیدراکی مرۆڤەکان، لایەنی تری شاراوەیان بۆ ئاشکرا دەبێت وروونترو ڕاستت بۆ مەسەلەکان دەچن.. بەڵام هەموو ئەم کەشف ودۆزینەوەیەش ماوەی زەمەنی تووڵانی خۆیان دەوێت..

زەمەن کۆتا توخمی ئەم بوارە نییە، بەڵکو بریتییە لەو ئاست وسنوورەی، کە مرۆڤەکان دەیگەنێ، سنووری ئەوانە، نەك سنووری بوارەکە.. سنووری گەردوون زۆر زۆر بەرفراوان و دوورە، ئەوی جار جارە و لە زەمەنە جیاوازەکانی مێژووی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا دەردەکەوێت، بەڕو ڕادەی توانای مرۆڤ دەردەخەن، کە ڕادەیەکی کەمە، بۆیە ئەو ڕۆڵەی مرۆڤ دەتوانێت پشت ئەستوور بەو زانیاریانەی خۆی بیبینێت، کەم و نوقسانە! ڕێژەییە. نەك ئەو ڕۆڵەی مرۆڤەکانی ئەم سەردەمە هەر هەموویان و پشت بەستوو بە زانیارییەکانیانیشیان، کە پێکەوە بۆ تەواوکردنی یەکتری دەیبینن، هەر کەمە، بەڵکو زانیاری وئیدراك و ئەزمونی، هەر هەموو مرۆڤایەتی بە هەموو نەوەکانیەوە پێکەوە هەر کەمەو، ناگاتە ئەوەی جێ و ڕێی خۆی لەم گەردوونەدا بۆ دیاری بکرێت!! چونکە زانیارییەکانی هەر هەموو نەوەکانی مرۆڤایەتی بە درێژایی مێژوویان کۆ بکەیتەوە (کە ئاسانیش نییە، ئەگەر ئەستەمیش نەبێت) ناگاتە بەش (جوزء)ێك لەم گەردوون و ژیانە! دوای ئەم هەست کردن و پەی پێ بردن و ئیعتیراف کردنە، ڕۆڵی پەیامی خوایی دێت، ڕۆڵی پەیامە خواییەکە دێت، تا ئەم مرۆڤە بەو شێوازە ئاڕاستە بکات، کە لەگەڵ بزاڤی هەموو گەردووندا یەك دەگرێتەوەو لەگەڵ بەشەکانی ئەودا دەگونجێت.. چونکە ئاڕاستەی

پەیامەکەی دارێژراوە، کە لەگەڵ ئامادەباشی سروشتی مرۆڤ وگەردوون و ژیانەکەدا دەسازێت! هەموویان پێکەوە جوڵە دەکەن، ئەمما چۆن پێکەوە دەسازێن و دەگونجێن؟! ئەوەش خۆی لە خۆیدا نهێنییەکی ترە! ئێمەش بە تەواوی پەی بە شێوازو چۆنیەتی ئەو گونجان وسازانە نابەین، بەڵام لەبەر تیشکی پەیامە خواییەکەدا ئێمە لە خەڵکی زیاترمان بۆ روون دەبێتەوەو، گۆشە نیگامان بەرفراوانتر دەبێت ولە روانگەی دینەکەوە، ئەو رێسایانەمان زیاتر لە مێشك دەچەسپێت، کە ئەم (وجود) ەی لەسەر دامەزراوە..

ئەم جۆرە سروشتە تایبەتە، سروشتێکی ئامادەکراوە، ئەم سروشتە پەی بە وەحییە خواییەکە دەبات، ئەمیشە، کە ئیستیعابی دەکات، ئەمیشە، کە تەحەمولی وەرگرتنی دەکات، وەحیەکەش ئاماژەی خواییە و دەبێت ئامێرێك لەخۆی بگرێت، کە لەگەڵ ئەم (وجود)ە گەورەیەدا بگونجێت، چونکە ئەم بوونە گەورەیە، پێشتر هەر لە سەرچاوەی ئەو وەحییەوە ئاراستەی پێ گەیشتووە، کە کردگاری گەردوون و مرۆڤ و ژیانەو، بکەری رەهای ئان و ساتێتی.

## تەنها پێغەمبەران پێشەوان:

هەموو پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار بۆ تێگەیاندنی خەڵکی لە خوابەیەکناسین (تەوحید) هەڵی بژارد بوون، بە تەواوی پەییان بەو تەوحیدە بردو بە تەواوی ئیستیعابیان کرد، چونکە خوای گەورە سروشتێکی چاك و هەستێکی پاك و زەینێکی روونی پێدا بوون، کە وەکو ئامێری هەستیاری خواناسی بوو، بۆیە هەر هەموویان لەگەڵ بوون بە پێغەمبەرێتیاندا، بە هەموو کیانیانەوە وە دەم ئەو تاکە دەنگە غەیبییەوە دەچوون، ئەو ئامێرە خواناسییە وەکو قیبلەنوما (بۆسەڵە)ی ئاراستە زانین وابوو، بەردەوام رووی پێ دەکردنە خوای گەورە، رەزامەندی و کەناری ئەوی بۆ دەکردنە تەنها سەرچاوەو تەنها رووگە، قەناعەتی تەواویان هەر لە سەرەتاوە بەوە بوو، کە هەر چەند رێساو

دیاردەکانی ژیان وگەردوون وبوون هەبن و زیادو جۆراوجۆر بن، هیچ بوونێکی تر وەکو بوونی خوای گەورە نابێت! هەر بانگەوازێك بۆ لای هەر شتێکی تری غەیری خوا بانگەشە بکات، هەر بەو دەنگە غەیبییەی لای خواوە بۆیان دێت، بەراورد ناکرێت! جا چونکە ئەوان هەر هەموویان سەلامی خوایان لێ بێت، هەر لە سەرەتای گزنگی پەیدا بوونی مرۆڤایەتییەوە تەوحیدەکەیان ناسی، درکیان بە گرنگی و یەك بوونی ئەو سەرچاوەو، ئەو تەنها رووگەیە دەکرد، پێش ئەوەی ئەم رێسا گەردوونیانە بدۆزرێتەوە، کە ئاماژە بۆ یەك سەرچاوەیی و یەك رووگەیی لای خوای گەورە دەکەن..

ئەم پەی پێ بردن ودرك کردنەی پێغەمبەرانی خوا سەلامی خوایان لێ بێت بە حەقیقەت وگرنگی وئاراستەو مەبەستی تەوحید بوو، کە وای لێ دەکردن سوور بن لەسەر ناسین وتەنها پەرستنی خوای پەروەردگاری تاك وپاك و، واز هێنان لە شیرك وتوخن نەکەوتنەوەی، ئەمان لە هەموو کەس زیاتر هەستیان بە گەورەیی بانگەوازە خواوویستییەکەیاندەکرد، بۆیە ئەوەندەش سوور بوون لە سەری، ئەوەی وا لێ دەکردن، کە هەموو بوونی خۆیان لە پێناو سەرخستنیدا سەرف بخەنەگەڕ، ئیستیعاب کردنی تەواوی تەوحیدەکە بوو، بەو ئیعتیبارەی حەقیقەتی بوون و ژینە، بەو سیفەتەی پەیامێکەو لەلایەن خوای تاك وپاکەوە بۆیان هاتووە، ئەمانیشی بە تایبەتی بۆ هەڵبژاردووە، ئەمانیش بەو فیترە پاکەی خۆیان، کە بۆتە ئامێری وەرگرتن، درکیان پێ کردووە، لەوەش دڵنیا بوون، کە هەم سەرچاوەکە یەکەو، هەم یەك پەیامەو بە یەك نەغمە بۆ هەموویان هاتووە.. یەکەو، فرەیی هەڵناگرێت..

ئەم پەی پێ بردن و شارەزا بوون و، ئەم پابەندو پێوەبەند بوونەی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت بە کرۆکی پەیام و بانگەوازەکانیانەوە، ئەمەی، کە هەموویان بە سروشتی پاك و زەینی روونیان هەستییان پێ دەکرد، لە فەرمایشتی هەموویاندا لە قورئاندا دەردەکەوێت، هەموویان ئاماژە بەوە دەکەن، جاری واش هەیە قورئان خۆی پێغەمبەران بە بانگەوازەکەیان دەناسێنێت! جاری واش هەیە

ئاماژە بە درك كردنەكانیان دەكات، ئەوەتا بۆ سەیيدنا نووح دەفـەرمویّ: (قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَى بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّيَ وَآتَانِي رَحْمَةً مِّنْ عِندِهِ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ أَنُلْزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمْ لَهَا كَارِهُونَ. وَيَا قَوْمِ لا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مَالاً إِنْ أَجْرِيَ إِلا عَلَى اللّهِ وَمَآ أَنَاْ بِطَارِدِ الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّهُم مُّلاقُو رَبِّهِمْ وَلَـكِنِّيَ أَرَاكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ. وَيَا قَوْمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ اللّهِ إِن طَرَدتُّهُمْ أَفَلا تَذَكَّرُونَ) ١١ هود/ ٢٨ واتە: نووح فەرمووی: ئەریّ قەومینە، ئەگەر من لەسەر بەڵگەو نیشانەی ڕێبازو بەرنامەیەكی خوای خۆم بم و ئەو، خێرو ڕەحمەتی خۆی پیّ بەخشیبم، بەڵام كە ئێوە كوێر بن و نەیبینن، چی بكەم؟! كە نایبینن و ناتانەوێت، ئایا بە زۆر بە سەرتانیدا بدەین و بە خورتی ئیمان لە دڵتاندا دروست بكەین؟! هۆ قەومینە، خۆ من لە بەرامبەر ئەم بانگەوازو بانگ كردنەتاندا، داوای سامان و خەرجی ومەسروفتان لیّ ناكەم؟ پاداشتی من لەسەر كەس نییە، لە سەر خوای خۆمە.. من چۆن ئەوانە دەر دەكەم، كە ئیمانیان هێناوە؟ چۆن لە خۆمیان دوور دەخەمەوە،؟! خۆ ئەوانیش بە دیداری خوای خۆیان دەگەن، بەڵام دیارە ئێوە خۆتان نازانن و پەی بە شت نابەنئەریّ قەومینە، ئەگەر من ئەو ئیماندارانەم دەركرد، كیّ لە سزای خوا پەنام دەدات و لە خۆم دەگرێت؟! مەگەر ئێوە بیر لەوە ناكەنەوە، كە شتی وا نابێت و ناشێت ؟!

هەر ئەم شێوازەشە، كە لە فەرمایشتی سەیيدنا ساڵحدا دەیبینین: (قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَى بَيِّنَةً مِّن رَّبِّي وَآتَانِي مِنْهُ رَحْمَةً فَمَن يَنصُرُنِي مِنَ اللّهِ إِنْ عَصَيْتُهُ فَمَا تَزِيدُونَنِي غَيْرَ تَخْسِيرٍ)١١ هود/ ٦٣ واتە: فەرمووی: ئەریّ قەومینە، ئەگەر من لەسەر بەڵگەو نیشانەی ڕێبازو بەرنامەیەكی خوای خۆم بم و ئەو خێرو ڕەحمەتی خۆی پیّ بەخشیبم، باشە ئەگەر من سەرپێچیم لە فەرمانەكانی كردو پەیامەكەیم نەگەیاند، كیّ داڵدەم دەدات و لە سزای خوا پەنام دەدات و لە خۆم دەگرێت؟! ئاخر خۆ دیارە ئێوە زەرەری منتان دەوێت!

یان لە سیرەی سەیيدنا ئیبراهیمدا دەیخوێنینەوە، كە دەفەرمویّ: (وَحَآجَّهُ قَوْمُهُ قَالَ أَتُحَاجُّونِّي فِي اللّهِ وَقَدْ هَدَانِ وَلا أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِهِ إِلا أَن يَشَاء رَبِّي شَيْئًا وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا أَفَلا تَتَذَكَّرُونَ. وَكَيْفَ أَخَافُ مَا أَشْرَكْتُمْ وَلا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِاللّهِ مَا

لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَانًا فَأَيُّ الْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِالامْنِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ) ٦ الانعام/٨٠ واتە: قەومەكەی كەوتنە دەمەوەری و موجادەلەی، بەڵام ئەو پێی فەرموون: ئایا ئێوە دەربارەی تاك و تەنهایی ئەو خوا گەورەیە، كە هیدایەتی داوم و ڕێی ڕاستی نیشان داوم ئەو شەڕە دەمە لەگەڵ من دادەمەزرێنن ؟! من لەو شیركە ناترسم، كە ئێوە دەیكەن، ئەوانەی ئێوە بە هاوەڵی خوای گەورەیان دادەنێن، توانای زیان و سوودیان نییە، مەگەر خوای گەورە خۆی وویستی لەسەر شتێك هەبێت، چونكە خوای گەورە پەی بە هەموو شتێك دەبات و ئاگای لە هەموو شتێكە، بەڵام ئێوە بیر ناكەنەوەو بێ ئاگان.. من چۆن لەو شتانە بترسم، كە ئێوە كردووتانن بە خواو، لە جیاتی خوای گەورە داتاننناون و دەیانپەرستن، كەچی ئێوە لەو خوایە ناترسن، كە ئاوا بێ بەڵگەو دەلیل شەریكتان بۆ داناوە؟! جا ئەگەر ڕاست دەكەن و زانیاریتان هەیە، ئادەی با بزانین كام دەستەو لایەنمان شایستەی هێمنی و ئاسایش و ئاسوودەییە؟!

هەر ئەم شێوازی گفتوگۆیەیە كە لە سەر زمانی سەییدنا شوعەیبییش دەفەرموێ: (قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىَ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا وَمَا أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَى مَا أَنْهَاكُمْ عَنْهُ إِنْ أُرِيدُ إِلا الإِصْلاحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إِلا بِاللّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ) ١١ هود / ٨٨ واتە: فەرمووی: ئەرێ قەومینە، ئێوە دەبینن وا من لەسەر بەڵگەو نیشانەی ڕێبازو بەرنامەی خوای خۆمم، ئەویش خێرو ڕزق و ڕۆزییەكی پاك و چاكی لەلایەن خۆیەوە پێ بەخشیووم، من ڕێی شتێكتان لێ ناگرم، خۆشم لەولاوە ئەنجامی بدەم! (چی بە ئێوە دەڵێم بیكەن، خۆم پێش ئێوە دەیكەم) چونكە مەبەستم چاكسازییەو هیچی تر، تا بشتوانم دەیكەم، سەركەوتنیشم بە دەست غەیری خوای گەورە نییە، بۆیە پشتیشم هەر بەو بەستووەو لە هەموو كارێكدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە..

هەر ئەمەش لە سەییدنا یەعقوبدا دەبیستین، كە بە كوڕەكانی دەفەرموێ: (قَالَ إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ اللّهِ مَا لا تَعْلَمُونَ) ١٢ یوسف / ٨٦ واتە:

سکاڵاو ئاهو نزولەم دەبەمەوە لای خوا، چونکە ئەوەی من لە خوای خۆمی دەزانم، ئێوە نایزانن و پەی پێ نابەن.. وە هەروەها..

ئاوا لە فەرمایشتی هەموو پێغەمبەرانی خوای گەورە دا سەلامی خوایان لێ بێت لە ووتوو وێژو سیفاتیاندا، هەست بەو ئیدراکە گەورە هاوبەشە دەکەین، کە هەیانبووە، لە فەرمایشتی هەمویانەوە ئەوە روون دەبێتەوە، کە ئەم پۆلە هەڵبژاردەی خوا، بە دڵ ودەرونیان، بە قەناعەتیان، بە هەست و هۆشی بەرفراوانیان، بە هەموو کیان وبوونیان، پەیبان بە یەکخواناسی وخوابەیەکناسین و یەکخواوویستی دەبردو دەیانزانی، کە ئەمە ئەو حەقیقەتەیە، کە لە پێناویدا هەڵبژێرراون، هەستیان بەوەش دەکرد، کە هەموویان وەك یەك و بەیەك تەرزی باس، دەیانەوویست خەڵکی لێ شارەزا کەن..

## جیهازی هەستیاری ئیمان:

رۆژبەڕۆژ لەگەڵ زیاد بوونی زانیاری وبەرفراوان بوونی ئیدراکی مرۆڤ، یاسای یەکبوونی ئەم گەردونەی بۆ روون دەبێتەوە، زانایانی مرۆڤایەتی گەیشتوونەتە پەی بردن بە یەکێتی پێکهاتە و یەکێتی بزووتن لە بوار ومەیدانە جیاوازەکانی ئەم گەردوونە بەرفراوانەدا، لە سنووری ژێری پێ شکانی خۆشیدا، ئەوەی دۆزیوەتەوە، کە ئەتۆم بەردی بناغەی بنیاتی ئەم هەموو گەردوونەیە، مادەش کە لە ئەتۆمدا دەردەکەوێت بۆتە هێزی ئەم گەردوونە، ئەوە نەما کە خەڵکی وایان دەزانی، پێکهاتەی هەموو شتێك جووتە، ئێستا ئاشکرا بووە کە بنج و بناغەی هەموو پێکهاتەیەك هەر ئەتۆمە، هەر ئەتۆمیشە کە دەبێتە ووزە. دیسان مرۆڤ گەیشتۆتە ئەوەی، کە لە سنووری زانیاری خۆیدا بشزانێت، کە ئەتۆم لە ناوەوەی خۆیدا لە بزوتن و جموجوڵێکی بەردەوامدایە، چونکە لە ناوەڕاستی ئەتۆمەکەدا، ناوك هەیەو بە دەوری ناوکیشدا ئەلیکترۆن دەگەڕێت، وەکو (فریدالدین العطار) دەڵێت: ئەلیکترۆنەکان وەکو ئەستێرەی دەوری خۆرێکن، کە بەردەوام بەدەوریدا خول دەخۆن. وەکو خۆرەکەی خۆمان، کە ئەستێرەکان بە دەوریدا دێن و دەچن.

یەکێتی پێکهاتەو یەکێتی بزووتن لەم گەردوونەدا ئەو دوو دیاردەیەن، کە مرۆڤ کەشفی کردوون، هەردووکیان ئاماژەیەکی دووری یاسای یەکبوونە گشتگیرە گەورەکەن، کە ئەمڕۆ وا مرۆڤایەتی بە ڕادەی توانایی تێبینی و تەجروبەی مرۆڤیانەی خۆی، گەیشتۆتە ئەو پلەیەی دەرك کردنی.. ئەمما تەبیعەتە تایبەتیەکەی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت، هەر هەموو ئەم ڕێساو یاسا گشتگیرو گەورەیەی گەردوونی لە ساتێکی چاوتروکاندا دەرك پێ کرد. چونکە ئەو تەبیعەتە تایبەتە لە وەرگرتنە ڕاستەوخۆکەشیدا تایبەت بوو، لە توانای وەرگرتنیشیدا هەر تایبەت بوو..

ئەو ئیدراك و پەی پێ بردنەی پێغەمبەرانی خوا، لە ڕێی لێکۆڵینەوەی زانستی وتەجروبەی خۆیان، یا هی مرۆڤایەتییەوە نەبووە، بەڵکو ئەوان جیهازێکی هەستیاری کامڵی ڕاستەوخۆی ئیمانیان پێ بەخشرا بوو، بۆیە هەر ڕاستەوخۆو یەکسەر ئیستیعابی ئەو یەکێتی پێکهات ویەکێتی بزوتنەوەی گەردوونییەیان دەکرد، بۆیە زیاترو زووتریش لە هەموو کەسێکی دی هەستیان بەوە دەکرد، کە ئەم یەکێتی پێکهاتە هەر لە یەك ئاراستەشەوە دێت، ئاراستەی پێکهاتن و فەرمانی جووڵەو بزووتن، هەر لەیەك سەرچاوەوە دێت..

ئەم جیهازە هەستیارە خواییەی لەو تەبیعەتە تایبەتییانەدا تەرکیب کرابوو، لە هەموو ئامێرو ئالیەتێکی تر ووردترو گشتگیر ترو تەواوتر بوو، چونکە لە سات و ئانی چاوتروکاندا پەی بەو یەکێتی سەرچاوەی ئاراستە دەبرد، کە لە پشت پێکهاتەو بزووتنەوەکانەوەن، هەر زۆر خێراو تێروتەواو درکی بەوە دەکرد، کە لە پشت هەموو بزوتنەوەکانەوە، لە پشت هەموو ڕووداوەکانەوە، لە پشت هەموو یاساو ڕێسا گەردوونیەکانەوە، یەك سەرچاوە هەیەو، سەرچاوەکەش هەر یەکەو هاوتای نییە، بۆیە لە هەموو کەسێکیش خێراترو چاکترو قووڵتر باوەڕیان بە خوابەیەکناسین (تەوحید)ی خوای کردگارو پەروەردگارو دەسەڵاتدار هێنابوو..

وە نەبێت من، کە ئێستا باسی ئەو دوو دیاردەی، یان زیاترەی یەکێتی پێکهاتەی گەردوونە کەشف کراوەکەی بەردەستی مرۆڤایەتی دەکەم لەبەر ئەوە بێت، کە زانستی ئەمرۆ سەلماندوونی! نا چونکە زانست لە مەیدانی خۆیدا دەتوانێت شت بسەلمێنێت، یا نەفی کات، هەموو ئەو (حەقیقەت) انەش، کە زانست دەیانگاتێ شتێکی ڕێژەیی پێبەستن! مومکینیش نییە هەتا هەتایە بە ڕێگای ئەزمونی خۆی بگاتە کۆتایی حەقیقەتێکی تەواو، چ جای ئەوەی مرۆڤ بتوانێت بە تیۆرە زانستییەکانی، شایەتی چۆنیەتی حەقیقەتێکی گەردوونی وا بدات، جاری وا هەیە تیۆرێکی (زانستی) شتێك دەڵێت، تیۆرێکی (زانستی) تر بە درۆی دەخاتەوە! یان بۆی ڕاست دەکاتەوە.. من کە باسی یەکێتی پێکهاتەی گەردوون ویەکێتی بزووتنەوەکانیم کرد، لەبەر ئەوە نەبوو، تا ڕاستی ئیدراك و پەی پێ بردنەکەی پێغەمبەرانیان پێ بەراورد کەم! نەخێر، مەبەستی من ئەوە بوو، کە ئاماژە بە سەرچاوەی وەرگرتنی وەحیەکە بکەم، تا دیدێکی ڕوون وبیرێکی بەرفراوانی واقیعی و تێگەیشتنێکی تەواو و گشتگیرو سەر ڕاستانەمان دەربارەی حەقیقەتی بوون و گەردوون و مرۆڤ لا دروست ببێت..

لەوانەیە زانستی ئەمڕۆ درکی بە هەندێك دیاردەی گەردوونی کردبێت لەوانەی پەیوەندییان بە حەقیقەتی یەکێتی پێکهاتەکەوە هەیە، ئەو یەکێتییەی وەکو بوونە بەرفراوانە گشتگیرە ڕاستەوخۆکەی خۆی چوو بووە چوارچێوەی ئیدراك و ئیستیعابی پێغەمبەرانەوە سەلامی خوایان لێ بێت، کە بەتەبیعەتە تایبەتییە خواپێداوەکەی خۆیان، پەییان بە تەواوی دیمەن و وێنەو ڕوداوەکانی ئەو حەقیقەتە بردبوو، ئیدی ئەمە زانست دەتوانێت بیسەلمێنێت، یان ناتوانێت.. زانست باوەڕی پێیەتی، یان پێی نییە، پەی بە هەمووی بردووە یان نا، ئەوەیان مەسەلەیەکی ترە، چونکە تیۆرییە زانستییەکان خۆیان جارێ جێی باس و لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی زانستین، چونکە هێشتا تیۆرە زانستییەکان جێگیر نەبوون، نەشگەیشتوونەتە کۆتا بڕیار، بۆیە زانست ناشێت بکرێتە پێوەری ڕاست ودروستی پەیامی خوایی، چونکە دەبێت پێوەرو

تەرازووی پێوان وکێشان، خۆیان نـەگۆڕو جـێگیربن، ڕەهـا بـن وگەیـشتبنە ئاسـتی کۆتایی حەقیقەت. لەبەر ئەمانەیە، کە حەتمەن دەبێت پێوەر، پەیامی خـوایی بێـت، نەك شتی تر، دەبێت بڕیـاری کۆتـا فـەرمانی خـوایی بێـت، چـونکە نـەگۆڕەو بـێ هاوتایە، لەمەشەوە حەقیقەتێکی تری زۆر گرنگ دێتە کایەوە..

تەنها ئەم تەبیعەتـە تایبەتییـە خواپێداوانـەی ڕاسـتەوخۆ بـە ڕێـسای پێکهاتـەی گەردوون و بوونەوەرەوە پەیوەستن، مافی ئەوەیان هەیە نەخشەی ڕێی مرۆڤایەتی دارێـژن و ڕێبازو ئاڕاستەی ژیانیان دیاری کەن. چونکە ئەوەی ئەوان دیـاری دەکـەن و نیـشانی دەدەن لەگەڵ هەموو ڕێسا نـەگۆڕەکانی تـری پێکهاتـەی بـوون و چـۆنیەتی بزوتنـەوە گەردوونیەکان یەك دەگرنەوە، بە مانایەکی تـر: چـونکە گـەردوون پـەیامی بـەربڵاوی پەیامی پێغەمبەرانە، ئەو ڕێبازو بەرنامـەی ئـەوانیش، کـە دایدەڕێـژن گـەردوونێکی نوسراوەیە، چونکە سەرچاوەی پێکهاتن و فەرمانی بزاڤـی هـەردووکیان هـەر یەکـە.. ئەمەی ئەمان دەیکەنە ڕێبازو بەرنامەی مرۆڤایەتی، وەحی خوایەو بە هەڵەدا ناچـێت، گـومڕا نابێـت، سـەری لێ تێـك ناچـێت، درۆ ناکـات، ناشـارێتەوە، بەربەسـتەکانی ماهییەت و کات وشوێن کار لە هیچ حەقیقەتێکی ناکەن. چونکە وەحییەو لـە خـواوە هاتووە، وەحییەو پەیوەندی، نە بە کاتەوە هەیە، نە بە شوێنەوە..

## بەرنامەی ژیان و ڕێبازی خەبات وحەقیقەتی گەردوون:

ویستی خـوای کردگـار وا بـوو، کـە هـەر ناوبـەناو پێغەمبـەرانی خـۆی بـۆ کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتی بنێرێت، تا ئـەم مرۆڤایەتییـە هەمیـشە بـە حەقیقەتـە ڕەهاکەوە پەیوەست بێتەوە، ئەو حەقیقەتەی، کە دوای سەدان سەدەی لێکۆڵینەوەو سەرنجدان ئیدراکی بەشێکی کەمیان لێ کردووە، کە مومکین نییـە لـە ڕێـی بـیرو دیدو سەرنج و تەجروبەی خۆیانەوە، هـەتا هەتایـە بگەنـە هـەموو حەقیقەتەکـە، دروستی و سەلامەتی ئەو پەیوەسـت بوونـەش بـەوە دەبێـت، کـە هـەنگاوەکانیان لەگەڵ هـەنگاوەکانی گەردوونـدا هـەڵ بێننـەوە، تـا بـزاڤـوجموجوڵیـشیان لەگـەڵ

بزوتنەوەی گەردووندا بسازێت، تا سروشت وفیترەتـی مـەخلوقێتی خۆیـان لەگـەڵ سروشتی ئەم گەردوونە بەرفراوانەدا یەك بگرێتەوە..

لەم روانگەوە بوو، کە دەبوو هەر یەك سەرچاوە هەبێت، کە مرۆڤ دیدی ڕاستو روونو ئایدیۆلۆژییەکی تێروتەسەلی گشتگیرو پڕاوپـڕی حەقیقـەتی بونـەوەری وای لێوە وەرگرن، کە پڕاوپڕ گشتگیری کیانو بـوونی مـرۆڤ خۆیـەتی. کـە مرۆڤـەکان بەردو ئەو ئامانجە دەبات، کە بۆی خولقێنراون، بۆ ئەو مەبەستانەیان دەخاتە کـار، کە مرۆڤایەتییان بۆ هێنراوەتە کایەوە. لەم دیدەوە، لەم روانگەوەیـە، کـە دەبێـت پـەی بـەوە ببرێـت، کـە ڕێبـازی راسـتی خـەبات و بەرنامـەی دروسـتی ژیـانی مرۆڤایەتی، هەر دەبێت لە خواوە بێت، چونکە ئـەو کاتـە ووردەکارییـەکانی ئـەو ڕێبازو بەرنامەیە، لەگەڵ نەخشەکارییە ووردەکەی گەردووندا یەك دەگرنەوە، لەگەڵ بزوتنەوە فیزیکییەکەی گەردوونیشدا دەسازێن و ڕوو لەو ئاڕاسـتەش دەکـەن، کـە خوای هەموان، ئامـاژەیان پێ دەکات، کە بۆی بڕۆن. ئەو ساتە هـەموو خەڵکەکـە لەو تەسلیم بوون و گوێڕایەڵی (سیلم) ەدا دەبن، کە خوای گەورە داوای لە هـەموان کردووە وەری بگرن:

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ ادْخُلُواْ فِي السِّلْمِ كَآفَّةً) ٢ البقرة/٢٠٨ واتە: ئـەی ئـەو کەسـانەی باوەڕتان هێناوە هەمووتان تەسلیم بە خوای گەورە بن و گوێڕایەڵی ئەو بکـەن. چـونکە ئەم خۆ تەسلیم کردنە، گونجانە لەگەڵ گـەردوون، گونجانـە لەگـەڵ سروشـتی مـرۆڤێتی خۆیان، کە هەر وەکو سروشتی مـەخلوقێتی گەردوونـە، بەمـەش هـەموویان ئاشـتی لەگەڵ یەکتر دروست دەکەن، چونکە لە هـەموو هـەڵسو کـەوتێکی ژیـانو چـالاکیو گەشەو نەشو نمایەکی فیزیکی خۆیانو هێزی بیرو دەسەڵاتیاندا ئاشتیانە بۆ ئەو ئاسـتە بەرز دەبنەوە، کە دەبێت لە ژیانی دنیایی خۆیاندا بیگەنێ.

هەر یەك سەرچاوەی گەڕانـەوەو لێ وەرگـرتن هەیـە، غـەیری ئـەو، هـەمووی گومڕاییەو سەرگەردانی وپشێوییە، یەکەمیان ڕەوایەو غەیری ئـەو باتڵـە، چـونکە پەیوەستییان بە سەرچاوەی یەکەمەوە نییە، ئەو هۆکارو شێوازانەی ئیـدراك وپـەی

بردن، کە بەگشتی مـرۆڤ بەخـشراوە سـنوردارن، هـی ئـەوە نـین سـەربەخۆ مـرۆڤ بگەێننە ئیدراکی حەقیقەتە گەورەکەی گەردون و بوون، کەم وکورتن، هەر بۆ ئەوە بەم مرۆڤە بەخـشراون، تـا بـە رەنجـی خۆشـی هەنـدێك لـە حەقیقـەت و ڕێـسای گەردوونی وتواناو ووزەی خودی مـرۆڤ خـۆی کەشـف بکاتبـەو رادەیـەی، کـە بـۆ خیلافەت وئاوەدان کردنەوەی سەرزەمین پێویستێتی، کـە بـۆ پێشخـستنی ژیـانی دنیاو گەشەو نەش ونمای بیرو دیدی خەڵکی پێویستێتی، بۆیە لەوانەیە لەم رووەوەو هەنگاوی باش هەڵهێنێتەوەو چەندەها قۆناغی چاك پێش کەوێت، بەڵام هـەرگیزاو هەرگیز ئەم هـەنگاوو قۆناغانـە نایگەێننـە ئیـدراکی کـەنارێکی ئـەو حەقیقەتـە گەورەیەی بوون، کە شیاوی دیاری کردنـی ڕێبـازی خـەبات وداڕشـتنی بەرنامـەی ژیانی کەن! ڕێباز دیاری کردن و بەرنامە داڕشـتن، نابێـت بـە گـوێرەی بـارودۆخی نائاسایی و حاڵەتی کتـوپڕیی بێـت، بـەڵکو حەتمـەن دەبێـت بـە پێـی کۆمـەڵێك ئاڕاستەو ئامۆژگاری وا بێت، کە دواتر لەگەڵ ئەو پێکهاتـەی سیـستم و چـۆنیەتی بزاڤی گەردوونەدا یەکاندگیر ببنەوە، کە بوونی گـەردوون وژیـان ومرۆڤـی لەسـەر دامـەزراوە، بـۆ هێنانـە دی ئـەو ئامانجـە گەورەیـەش بـن، کـە گـەردون وژیـان ومرۆڤایەتییەکە بۆ هێنانەدی ئەو دروست کراون.. ئەو ئامانجـە گەورەیـەی، کـە کردگاری گەردوون وژیان ومرۆڤەکە دیوێتی و، دوور لـە کاریگـەری کـات وشـوێن وئاتاجیی دیاری کردووە، کە بە بێ هـیچ گومـان و دڵـە راوکەیـەك، ئـەم مرۆڤـە سنوورداره نەزانەی هەمیشە وا لەژێر کاریگەری کات و شـوێن وئاتـاجیی خۆیـدا، پەی پێ نابات وئیدراکی هەموو گۆشەو کەنارێکی ناکات..

ئەو کەسەی بەرنامە گەشتی ڕێیەك دیاری دیـاری دەکـات، دەبێـت هـەر ئـەو کەسە بێت، کە شارەزای هەموو ڕێگاکەیە. مادام مرۆڤیش بەپێی سروشـتی خـۆی ڕێگای هەموو ژیـان شـارەزا نییـەو، سـەدان و هـەزاران نیـشانەی ڕێناسـینی لێ شاراوەیە، تەنانەت نزکترین ساتی داهاتووشی لەبەر چاو نیەو، چـەندین بەربەسـتی لەرێدایـە، چـۆن دەتوانێـت ڕێبـازی خـەبات وبەرنامـەی ژیـانی مرۆڤایـەتی

داڕێژێت؟! هەر وەك ئەوەی، کە مرۆڤ ناتوانێت بەرنامەیەکی پاكو پوختو ڕەوا بۆگەشتی ڕێگایەك دیاری بکات، کە خۆی هیچ شتێك دەربارەی ئەو ڕێگایە نازانێت، کەوا بوو ناشزانێت وناتوانێت و، مافی ئەوەشی نییە ڕێبازی خەباتو بەرنامەی ژیانی خەڵکی دیاری بکات. لەبەر ئەمەیە، کە دەڵێین: یان دەبێ مرۆڤایەتی بکەوێتە گومڕایی وسەرگەردانی ولارو وێریەوە، یان دەبێ بگەڕێتەوە سەر ڕێبازو بەرنامەکەی خوای گەورە. ئەو ڕێبازو بەرنامەیەی، کە لە خوای کردگاری گەردوون و ژیان و مرۆڤەوە هاتووە.

پەیامەکانی خوای پەروەردگار، یەك بە دووی یەکدا هاتن و چوون، هەر یەکەیان دەستی مرۆڤایەتی دەگرت وبەسەر ڕێبازی دروست وڕێنمایی نووری خوادا بەردو خواوویستیان بەرز دەکردنەوە، گەرچی ئەم مرۆڤایەتییە بەدبەختەش، هەر نابینا خۆی رادەپسکاندو لە ڕێ لای دەدایەوە! دەکەوتەوە سەر بەرنامەکانی جاهیلییەت وگوێی خۆی لە ئامۆژگاری کاروانچییە شارەزاکان دەئاخنییەوە! هەر وا بەو سەرپێچی و یاخی بوونەوە، دەکەوتەوە زوڵم و ناڕەوایی، تا دیسان کاروانچییەکی تری دڵسۆزی بۆ دەهاتەوەو دەیگێڕایەوە سەر ڕاستە ڕێبازی خواوویستی و دادی کۆمەڵایەتییەکەی.. لەگەڵ هەر پێغەمبەرێکی ئازیزو پەیامی قۆناغێکی نوێدا، لایەکی نوێی حەقیقەتە گەورەکەی گەردوونی ئاسانتر بە گوێڕەی بوونی بۆ ڕۆشن دەبۆوە، تا ئیدی کۆتا پەیامی خواوویستی بۆ هات، تا لە زەمانی ڕوشدی ژیری مرۆڤایەتییدا بیدوێنێت، ئەم پەیامە کۆتاییە ژیری مرۆڤ دێنێتە دوواندن، تا هەموو حەقیقەتەکانی گەردوون و ژیان ومرۆڤی بە تەواوی پێ بناسێنێت، بۆ ئەوەی ئیتر دەرکیان پێ بکات وئەقڵی بەوە بشکێت، کە دەبێت لەگەڵ ئەواندا پێ هەڵگرێت، ئەم کۆتا پەیامە، ئەم حەقیقەتە ڕەهایانەی گەردوونو ژیانو مرۆڤیشی ئەوەندە جوان بۆ ئەم مرۆڤە ڕوون کردۆتەوە، کە ئیدی پێویستی بە پەیامێکی دی نامێنێت، لە دوای ئەم، بۆ ڕۆشن کردنەوەی زیاترو پێناساندنی زیاتری گەردوون وژیان ومرۆڤ بێت، ئەوانەی پەیامەکە ڕوون دەکەنەوەو ئایەتەکانی لێك دەدەنەوە، تا ڕۆژی قیامەت، بەسن..

پاشان: یان ئەوەیە مرۆڤایەتی دەبێت لەم چوارچێوە بەرفراوانەدا بجولێت، کە بواری تەواوی هەیەو دەتوانێت بە راقیترین شێوە داهێنانی خۆی وچالاکی نوێ کردنەوەی خۆی بخاتە روو، بە شێوەیەکیش، کە دەتوانێت بەردەوام بە حەقیقەتە گەورەکانی گەردوونەوە پەیوەستیان بکاتەوە، تەنها لەم رێیەشەوە دەتوانێت پەیوەست بێتەوە نەك لە رێی ترەوە، یان ئەوەیە لە ئاراستەی ئەم پەیامەش، خۆی راپسکێنێت ولە کۆتا رێبازی خوایی لادات وبڕوات، بۆ خۆی سەرگەردانانە رێ کات و وێڵ وگومڕایانە دوور لە هەموو مەشخەڵێکی خواوویستی هەنگاوی کوێرانە بنێت!!

## پلە و پایەی پێغەمبەران:

خوای گەورە، کە فەرمووی: ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ اللّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ﴾٢ البقرة/٢٥٣ واتە: ئەو نێرراوانەی خوا (کە پێشتر باسی فەرموون) رێزو پلەی هەندێکیانمان داوە بەسەر هەندێکی تریاندا، هەیانە خوای گەورە راستەخۆ لەگەڵیدا دواوەو پلەو پایەی هەندێکی تریانی بەرز کردۆتەوە، چەندین بەڵگەو نیشانەی روونی پێغەمبەرێتیمان بە عیسای کوڕی مەریەم بەخشی و، لایەنگریشی بووین و بە جوبرەئیلیش پشتیوانیمان لێ دەکرد..

ئەم ئایەتە چیرۆکی هەموو پێغەمبەرو پەیامەکانیانی لە خۆ گرتووە، هەروەها وەسفی تایبەتی کۆمەڵی پێغەمبەران دەکات و ئەو سیفەتە بۆیانەی، کە لە خەڵکی ئاسایی پێی جوێ دەکرێنەوە، هەر لەسەرەتاوە ئایەتەکە ئەوە باس دەکات، کە خوای گەورەیە، کە هەندێك پێغەمبەری لە هەندێکی تریان پایەدار تر کردووەو پلەیەکی بەرزتری پێ بەخشیوون، ئینجا هەندێك نیشانەو دیمەن باس دەکات، ئەو پلەو پایە باس کراوانەیان، لەوانەیە دەربارەی ئەو کەش و دەورو بەرەیانەوە بوو بێت، کە بە دەوریانەوە بووە، کە کارتێکردنی لەسەر چۆنیەتی بانگەوازەکەیان و شوێن

کەوتوانیان هەبووە، وەکو ئەوەی یەکێکیان پێغەمبەرێك بێت و بۆ تیرەو هۆزێك نێررا بێت، یان نێرراوی ئوممەتێك بووبێت، یان نێرراوی نەوەیەك، یان پێغەمبەری هەموو نەوەکانی مرۆڤایەتی بووە.. هەروەها ئەو پلەو پایەیە لەوانەیە دەربارەی ئیمتیازاتێك بووبێت، کە بە تایبەت بە یەکێکیان درا بێت، یان بە ئوممەتە موسوڵمانەکەی درا بێت.. یان ئەو پلەو پایەیە لەوانەیە پەیوەندی بە خودی پەیامەکانیانەوە بێت، وەك ئەوەی پەیامی یەکێکیان، لە هی ئەوانی پێشتر گشتگیر تر بێت و هەموو لایەنەکانی دیدو ژیانی خەڵکی بگرێتەوە..

دەقی ئەم ئایەتە لێرەدا دوو نمونەی سەییدنا موساو عیسای هێناوەتەوە سەلامی خوایان لێ بێت، ئینجا بە شێوەیەکی گشتی ئاماژەی بەوانی تر کردووە: (مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ اللّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ)..

خوای گەورە کە باسی یەکێك لە قورئاندا دەفەرموێ، کە لەگەڵیدا دوابێت، یەکسەر هۆش دەڕوات بۆ سەییدنا موسا، بۆیە پێویست ناکات ناوی بهێنێت! کە ناوی سەییدنا عیساش دەهێنێت، یەکسەر ناوی دایکی دەبات، حیکمەتی ئەمەش ڕۆشنە.. کاتێك قورئان دەهاتە خوارەوە، ئەفسانەگەلێك دەربارەی سەییدنا عیساو دایکی هەبوون، کۆمەڵێك قسەو قسەلۆك هەبوون، کە گوایە نەعوزوبیللا کوڕی خوایە! یان دەربارەی ئەوەی، کە ژیانی پیرۆزی ئەو دوو لایەنی لاهوت و ناسوت (بەشەریی و خوایی) تێدایە! یان گوایە سروشتێکی خوایەتی هەبوو، کە لە سروشتە بەشەرییەکەیدا تواوەتەوە! هەر وەکو خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە! زۆر داستان و چیرۆك و ئەفسانەی تر، کە کەنیسەکان کوڕی هەموو کۆمەڵگەیەکیان پێ گەرم و سەرگەرم کردبوو! ئینجا بوو بوو بە موناقەشەیەکی زۆر دژوار، کە هەزارانی لەسەر کوژرابوو، روباری خوێنی لە دەوڵەتی ڕۆمانیدا لەسەر هەستابوو! ئینجا دەبوو ئاوا قورئان راستی سەییدنا عیسا روون کاتەوەو بەشەرێتی ئەو زاتە بسەلمێنێت و، هەمیشە بە ناوی دایکیەوە ناوی بهێنێت، ئەمما (روح القدس) ئەوە قورئان روونی کردۆتەوە، کە مەبەستی لەوە جوبرائیلە سەلامی خوای لێ بێت، کە وەحی بۆ پێغەمبەران دەهێنا..

ئەمەش گەورەترین لایەنگیریی خوایی بوو، بەو ئاماژە خواییە ئەو بەرپرسێتیو پلەو پایەی پێشەوایەتیە بۆ ئەو پێغەمبەرە بەڕێزانە لە ناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا چەسپا، ڕۆڵی گەورەی ئەوان لای خۆیانو لای خەڵکیش روون بۆوە، ئەوەش چەسپا، کە ئەوە هەر خوای گەورەیە، کە ئەو بەڕێزانە پایەدار دەکاتو جێو ڕێیان بۆ دیاری دەکاتو دەشیان پارێزێت، ئەو دەستی بە باڵیانەوەیە، تا ئەو ڕێ دوورو سەختەی بانگەوازی خوایی ببڕن، هەر ئەویشە، کە هێمنیو ئاسودەییو دابین بوونو خۆگرییان پێ دەبەخشێت، هەر خوایە، کە لە کاتی ناڕەحەتیو قووتبوونەوەی کەندو کۆسپی سەر ڕێیاندا پشتیان دەگرێتو دڵنەواییان دەکاتو هانیان دەداتەوە بۆ ئارامگرییو بەردەوام بوون.. ئەمانە هەمووی ئەو لایەنگیرییو پشتیوانییە، کە ئایەتەکە باسی دەکات (وَأَيَّدْنَاهُ).. ئەمما بەڵگەو نیشانەکان (الْبَيِّنَاتِ)، کە بە سەیدنا عیسای سەلامی خوای لێ بێت بەخشی ئەوە زۆرن، لەوانە ئینجیل، کە بۆی ناردە خوارەوە، هەروەها ئەو موعجیزانەی تریش، کە بریتی بوون لە دەیان کاری نائاسایی، کە لەسەر دەستی پیرۆزی رووی دەدا، کە لە زۆر شوێنی قورئاندا بۆ بە راست ناساندنی خۆی و پەیامەکەی باسی فەرموون وەکو: (وَرَسُولاً إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنِّي قَدْ جِئْتُكُم بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ أَنِّي أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِ اللّهِ وَأُبْرِىءُ الأكْمَهَ والأَبْرَصَ وَأُحْيِـي الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللّهِ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ) ٣ ال عمران /٤٩ واتە: سەیدنا عیسا بە بەنو ئیسرائیلیەکانی فەرموو، کە من نێرراوێکی خوای گەورەمو بۆ ئێوە هاتووم، بە دڵنیاییەوە من بەڵگەو نیشانەی بەهێزم لە خوای خۆتانەوە بۆ هێناون: من لە قوڕ شێوەی باڵندەتان بۆ دروست دەکەم و، لەبەرچاوتان فووی پێدا دەکەم، کە بە فەرمانی خوای گەورە دەبێتە باڵندەی راستی! من کوێری زگماکو گەرییو گولییو بەڵەکی زگماکتان بۆ چاك دەکەمەوە، بە وویستو ئیرادەو مۆڵەتی خوای گەورەش، مردووتان بۆ

زیندوو دەکەمەوە! هەواڵی ئەو شتانەشتان پێ ڕادەگێنم، کە لە ماڵەوە دەیخۆن یان هەڵی دەگرن ولە گەنجینەی دەکەن! بە ڕاستی ئەمانە نیـشانەو بەڵگـەی گـەورەیی خواو ڕاستی پێغەمبەرایەتیەکەی منە، ئەگەر ڕاست دەکەن و باوەڕیش دەهێنن..

دەقـی ئـەم ئایەتـە لێـرەدا نـاوی محمـد (ﷺ) ناهێنێـت، چـونکە نـاوەڕۆکی ئایەتەکەی ئێرەو ئەوانی بڕگەکە، ئاڕاستەی سەیدنا محمد خۆی کراوە، بە بەڵگـەی ئایەتەکانی پێشترو پاشتری ئەم، وەکـو: (تِلْـكَ آيَـاتُ اللّـهِ نَتْلُوهَـا عَلَيْـكَ بِـالْحَقِّ... ) باسەکە باسی پێغەمبەرە بەڕێزەکانەو، بۆ ئەم (ﷺ) دەکرێت.

کە تەماشای پلەو پایەو مەنزیلەی پێغەمبەرانی بەڕێز سەلامی خوایان لێ بێت دەکەین، دەبینین لـە هـەموو لایەنەکانـەوە محمـد (ﷺ) لـە لوتکەدایـە، جـا لـەو لایەنـەوە سـەیر کـەین، کـە پەیامەکـەی گـشتگیرەو هـەموو لایـەنێکی ژیـانی کۆمەڵگـەی مرۆڤایـەتی لـە هـەموو نەوەکانیـدا گرتۆتـەوە، یـان لەلایـەنی ئـەو کۆمەڵگەی لێوە دەرکەوت و، ئەو ئوممەتە زۆرەی باوەڕی پـێ هێنـاوە، ئەنجامەکـە هەر نەگۆڕەو مەنزیلەی ئەو لە هەموو لایەکەوە شایانی پلەی بەرزی خواییە..

## ئیسلام حەقیقەتی یەکبوونی گەردوونە:

ئیسلام تەواوترین دەربڕی دیدی حەقیقەتی یەکبوونی خـوای پـەروەردگارە، لـە هەموو حەقیقەتەکانی گەردووندا، ئیسلام لە هەموویان مەزنترو ڕوونـترە، چـونکە وویستی ئەو کردگارەیە، کە هیچ شتێك لـە وێنـەی ئـەو نیـە، ئیـسلام وویـستی خوایەو حەقیقەتی ئەو فەرمانە خواییەیە، کە فەرموویەتی: (كُـنْ) واتـە ببـە! ئـەم بونەوەرەش لە وویستی ئەو (كُنْ فَيَكُـونُ)ەوە هاتووە، کە بۆتە ئەو ڕێسایەی حوکمی هەموو یەکبوونی گەردوون دەکات، لە یەکبوونی سێڵێکی سادەوە، تـا یـەکبوونی مرۆڤێکی تەواو! هەروەها یەکبوونی هەر هەموو مرۆڤایەتی، هـەر لـە ئادەمـەوە (علیه السلام) هەتا کۆتا زارۆك و وەچـەی ئـەو لەسـەر ئـەم زەمینـەدا! هـەروەها یەکبوونی دین و بەرنامە خواوویستیەکەی خوای گەورە، کە بۆ قۆناغ بـە قۆنـاغی

کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی هاتووە. هەروەها یەکبوونی دەستەی پێغەمبەران، کە ئەم دینەیان لە کات و شوێنە جیاوازەکاندا وەك یەك دەگەیاند! دیسان یەکبوونی ئوممەتە موسوڵمانەکەی، کە وەدەم بانگەوازی ئەوانەوە لە کات وشوێنێی جیاوازدا هاتووە! دیسان یەکبوونی جۆرو شێوازی ئەو چالاکیە مرۆڤییانەی بۆ خواو بەرەو خوا دەچێت، کە ناوی (خواپەرستی)! لێ نراوە.. ئینجا یەکبوونی دنیاو ئاخیرەت! دوو ماڵەکەی سزاو پاداشت! ئیتر بڕۆ بۆ یەکبوونی ئەو بەرنامەش، کە خوای گەورە بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی داناوەو غەیری ئەویان لێ قبووڵ ناکات! تا دەگاتەوە یەکبوونی ئەو سەرچاوەیەی، کە دیدو تێڕوانین و پێناسەو بەرنامەی هەموو لایەنەکانی ژیانیانی لێوە وەردەگرن..

گیانی پیرۆزی محمد بوو (ﷺ)، کە توانی وەڵامی حەقیقەتی ئەو یەکبوونە مەزنە بداتەوەو تەحەمولی کات! هەر وەکو، کە ژیریی کامڵی ئەو بوو، کە توانی ئەو دیدو تێڕوانینە تەواوە ئیستیعاب بکات، هەم لە خۆی بگرێت وهەم بیدرەوشێنێتەوە! هەر کیانی پیرۆزی ئەویش بوو، توانی ئەو حەقیقەتە خواییەی (كُنْ فَيَكُونُ) ە لە ژیانی خۆیدا لە واقیعێکی هەست پێکراوو بەرجەستەدا بۆ خەڵکی بخاتەوە ڕوو!! ئاخر بۆیە ئەو زاتە پیرۆزە شایانی ئەوە بوو، کە ببێتە پێغەمبەری هەر هەموو مرۆڤایەتی؛ هەر لەو ڕۆژەوەی خەڵاتی پێغەمبەرایەتی درایە، تا ئەو ڕۆژەی خوای گەورەو کارجوان کۆتایی بە ژیان دەهێنێت و، سەرلەنوێ مرۆڤایەتی بۆ ژیانەوەیەکی دیکە دەخولقێنێتەوە.. ئەو پێغەمبەرە نێو نەتەوەییەی، کە پەیامەکەی ئیعتیمادی کردە سەر پەی پێ بردن ودرکی مرۆڤایەتی پێی، بێ ئەوەی دوچاری تین و فشار بکرێت، تەنانەت بێ ئەوەی ناچاری موعجیزەی ماددی ناسایش بکرێت، ئەو پەیامەی، کە بە هاتنی، بووە نیشانەی قۆناغی باڵغێتی مرۆڤایەتی..

ئاخر بۆیە بووە کۆتا پێغەمبەرو نێرراوی خوای گەورە، بۆیە پەیامەکەشی بووە کۆتا پەیامی خوایی، بۆیە بە کۆتایی تەمەنی پیرۆزی ئەو، وەحی بڕاو وەستا!

چونکە لە دینەکەی ئەودا، لە پەیامەکەی ئەودا، نەخشەو خانە بە خانەی ئەو یەکبوونە گەردونیە گەورەیە روون کرابۆوە.. پەیامەکەی ئەو، راگەیاندنێکی جیهانی بوو، کە خەڵکینە ئەوا ئەو بەرنامە بەرفراوانە گشتگیرەتان بۆ هات، کە هەر هەموو لایەنەکانی چالاکی و ووزەو وورەتان دەگرێتە خۆو، بۆ بەختەوەریی و ئاسودەیی خۆتان لە چوار چێوەی خۆیدا دەیخاتەوە گەڕ، خاڵە سەرەکیەکانی بەرنامەکە بە تەواوی ریزبەند کران و، ئەوی ماوەتەوە ووردەکاریەکان ولێکدانەوە جۆراو جۆرەکانی مرۆڤایەتی خۆیین، کە ژیریی مرۆڤەکان خۆیان دەتوانن تەفسیلاتی لەبەر رۆشنایی خاڵە سەرەکیەکانی بەرنامەکەی خوادا، بۆ ئاراستەی ژیانی رۆژانەیان بدەنێ! ئیدی پێویستیان بە دینێکی دیکە نەماوە..

ئەو خوای کردگارەی، کە مرۆڤایەتیەکەی دروست کردووە، دەیزانی مرۆڤ کێیەو چی دەوێت؟! دەیزانی چیش دەکەن و چۆنیش راست دەکرێنەوە؟! بۆیە زانی بەرنامەکەی خۆیان چۆن بۆ دابرێژێت؟! بە شێوەیەکی وا، کە هەموو کونج و کەنارێکی ژیانی دنیایان لە هەموو کات وشوێنێکدا بگرێتەوە.. خوای گەورە ئاسوودەیی مرۆڤایەتی دەویست، بۆیە ئەم پەیامەشی ئاوا بەو خاڵە سەرەکیانەی دیدو تێڕوانین وپێناسەی حەقیقەتەکانەوە بۆ ناردن، تا یارمەتی گەشەو نەشونماو پەرەپێدانی ژیانی دنیاو ئاخیرەتیانی پێ بکات وبەختەوەری هەردوو دونیایان بکات پێی.. ئاخر لەبەر ئەوەیە، کە هەر مرۆڤێك وا بزانێت، کە ئەو شارەزاترە وەك لە خوای کارزان، ئەو زیاتر پەی بە بەرژەوەندیەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دەبات، وەك لە خوای کردگارو داناو بە توانا، یان وا بزانێت ئەم پەیامە خواییە، هی ئەوە نەماوە بۆ ژیانی پێشکەوتووی سەردەمی نوێ بگونجێت، یان وا بزانێت ئەو دەتوانێت بەرنامەیەکی جوانترو چاکتر لەوەی خوای کارجوان بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دارێژێت، حەتمەن ئەو کەسە کافرە، کافرێکی موتڵەق، هیچ گومان و دوودڵ و ڕاڕاییەکیش لە حوکمی بە کافردانانیدا نامێنێت، ئەو کەسە، نەك هەر کافری موتڵەقە، بەڵکو خراپەکاری موتڵەقیشە، هەم بۆ خۆی و هەم بۆ کۆمەڵگەی

مرۆڤایەتیەکەی دەوروبەریشی! چونکە هەڵوێستێکی دوژمنکارانەی زەق و ڕاشکاوی بەرامبەر خوای گەورە نواندووە و، ئیعلانی شەڕی بەرامبەر کردووە! دیسان ئیعلانی خراپەکاریشی بەرامبەر ئەو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیە کردووە، کە خوای کردگارو پەروەردگارو کارزان پەیامی خێرو خۆشی و ئاسوودەیی بۆ ناردوون، تا پیادەی کەن، بەڵام ئەم ناهێڵێت!! ئەم بەرنامە خواییەکەی خستۆتە کەنارەوەو ناهێڵێت باڵی ڕەحمەت و هێمنییەکەی بەسەر خەڵکیدا بکشێت.

# بەندی سێیەم: دیدی ئیسلام و ڕێبازی دینداریی

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (فَبَعَثَ اللّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُواْ فِيهِ.. ) ٢ البقرة/ ٢١٣ واتە: ئینجا خوای گەورە پێغەمبەرانی بە مژدەو هۆشداریەوە ناردو کتێبی حەقی خۆی پێدا ناردن، تا حوکمی ئەو خەڵکەی لە هەموو ناکۆکیەکی نێوانیاندا پێ بکەن.

پێویستە کەمێك بۆ سەرنجدان لەبەر دەم (الْحَقِّ)دا بوەستین.. چونکە حەق دەخاتە ئەو چوارچێوەیەوە، کە پەیامی خوایی لە خۆی گرتووە، واتە حەق ئەوەیە، کە لە پەیامی خوادایەو بەس.. ئەم حەقەش بۆیە هاتووە، تا ببێتە حاکم و، دادپەروەریی لە نێوان خەڵکیدا بەرقەرار کات، تا ببێتە ناوبژیوان و داوەری نێوان خەڵکی، کە ڕاجیان، کە ناکۆکن لە گوفتارو رەفتاریاندا، یان لە دیدو بیریاندا، یان لە بەهاو نەریت و پێوەرو کێشیاندا، چونکە حەق لە کتێبەکەی خوادا هەیەو بەس، هەر داوەرییەك لە نێوان خەڵکیدا دوور لەم حەقە خواییە بکرێت، یان هەر حوکمێك بێ ئەم حەقەی، کە یەکەو فرەیی هەڵناگرێت، بدرێت، یان مل لێنەنان و ملبادانی تێدا بکرێت، یان تەسلیمی ئەو حەقە نەبێت؛ ژیان پارسەنگ نامێنێت، خەڵکەکەش لە ڕاجیایی و ناکۆکی ناو خۆیان رزگار نابن وکێشەکانیان کۆتایی نایات.. ئەمەش واتە بەرقەرار نەکردنی ئاشتی و هێمنی و ئاسوودەیی لەسەر زەمین و، مانەوەی خەڵکی لە دڵەڕاوکێ و ترسی شەڕو شۆڕو پێکدادانداندا..

چەسپاندنی ئەم حەقیقەتە، کاریگەریەکی گەورەی هەیە لە دیاری کردنی ئەو لایەنەی، کە خەڵکی دەبێت بیروهۆش ودیدو تێڕوانین و یاساورێسای لێوە وەرگرن، لە دیاری کردنی ئەو مەرجەعیەتەی، کە دەبێت لە چارەسەر کردنی کێشەو ناکۆکیەکانی نێوانیاندا، بگەڕێنەوە سەر بڕیارو تەعلیماتەکانی. ئەم لایەنەش هەر یەکەو فرەیی هەڵناگرێت، ئەویش ئەو لایەنەیە، کە کتێبە حەقەکەی خۆی ناردۆتە

خوارەوە، تا ببێتە حاکمی نێوان خەڵکی.. کتێبەکەشی لە ئەسڵدا، هەر یەکەو فرەیی هەڵناگرێت، هەر ئەوەیە، کە هەموو پێغەمبەران لە یەك لایەنەوە هێناویانە، ئوممەتەکەش، کە بۆتە شوێن کەوتووی هەر یەکێکیان، هەر یەکە!!

ئەم دیدو بۆچوونەش یەکەو فرەیی هەڵناگرێت..

ڕێسای ئەم حەقیقەتە ئەوەیە، کە خوا یەکەو پەروەردگار یەکەو پەرستراو یەکەو یاساو ڕێسا دانەری هەر هەموو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، لە هەموو قۆناغەکانی کات و شوێنێاندا هەر یەکە!! ئەمەیە ئەسڵ.. ئەمما تەفسیلات، ئەوە پاشان وەکو لق و چڵی بڕیار دێن، بە گوێرەی پێداویستیەکانی ژیانی نەوەکانی مرۆڤ وپەیوەندیەکانیان دەبن. ئەمەش جاربۆ جارو قۆناغ بە قۆناغ هات، تا گەیشتە ئیسلام، کە بوو بە کۆتا چاپی تەعلیماتی یەك لایەنەکە! چونکە ئیسلام ڕێی بۆ مرۆڤایەتی خۆش کرد، تا لەبوارێکی زۆر بەرفراوانی ژیاندا، بێ هەبوونی بەربەست لەژێر ئاراستەی خواویستیدا گەشە بکات. تا بە سەرپەرشتی خوای پەروەردگار وبە پێی بەرنامەو پرۆگرامی شەریعەتە زیندووەکەی ئەو، کە بەردەوام نوێ دەبێتەوە، ژیانی خۆی دامەزرێنێت وبەڕێوەی ببات.

ئا ئەمەی قورئان دەیسەلمێنێت و بڕیاری بنبڕی خۆی لەسەر دەدات، ئەو تیۆرە ئیسلامیەیە، کە وەك ڕێبازو خەتی مەشی هەموو دینەکانی لەسەر هاتووە، دینی هەموو پێغەمبەرەکان سەلامی خوایان لێ بێت هەر لە یەك ئەسڵەوە هاتوون، لە یەك زەمینەوە دەرچوون، کە بریتیە لە تەوحید.. بەڵام دوای هەر پێغەمبەرێك ئینحیرافات دەستی پێ دەکردەوە، تا زەمانی پێغەمبەرە عەزیزەکەش دوور دەکەوتەوە، دید لێڵی و بیدعەو ئەفسانە زیاتر مەیدانی بۆ خۆش دەبوو، بازاڕی گەرم دەبوو!! تا وایان لێ دەهات بە تەواوی لە ئەسڵە ڕاستەکە دوور دەکەوتنەوە، ئیدی پەیامێکی نوێ دەهات، تا عەقیدە ڕەسەنەکە لە مێشکی خەڵکیدا ڕاست کاتەوە، تا دیدو بیریان لە پیس و چەپەڵی شیرك و تەمومژی بیدعەو ئەفسانە پاك کاتەوە و، بە گوێرەی ژیانی نوێ و داهێنانی سەردەمیان، بڕیاری یاساو ڕێسا

نوێیان بۆ بداتەوە. ئەم تیۆرە رەواترە خەڵکی شوێنی کەون، وەك لەو تیۆریەی غەیرە موسوڵمان دەیڵێن، کە گوایە عەقیدەو دین، قۆناغ بە قۆناغ دامەزراوەو لە سادەییەوە بەرەو رەسەنێتی پێشبردی کردووە، کە جاری وا هەیە هەندێك لە موسوڵمانانیش، بە بێ ئاگابوون دەکەونە ژێر کاریگەرێتیەکەی و، ئەوانیش وەکو توێژەرەوە جاهیلییەکانی رۆژئاوا، لە دووی ئەوە دەگەڕێن بزانن چۆن دین قۆناغ بە قۆناغ هاتووە!!

ئەم ئەسڵە نەگۆڕەی دیدی ئیمانی، زیاتر لەگەڵ ئەرکی ئەو کتێبەدا دەسازێت، کە خوای گەورە بە حەق و حەقی پێدا ناردۆتە خوارەوە، تا حوکمی نێوان خەڵکی پێ بکرێت و، ببێتە داوەری نێوانیان بۆ چارەسەری کێشەو ناکۆکیەکانیان، لە هەموو سەردەمەکان و لەگەڵ هەموو پێغەمبەرێکیشدا..

هەر دەبوو تەرازوویەکی نەگۆڕ لەبەر دەستی خەڵکیدا هەبێت، تا هەر کاتێك لە ناو خۆیاندا راجیایی و ناکۆك بوون خێرا بێنەوە لای و، مافی هەر یەکەیانی پێ دیاری بکەنەوە.. هەر دەبوو دەستوری ناوبژیوان هەبێت، تا خەڵکی لە ناوکۆییەکانیاندا بزانن چۆن پارسەنگ دەبنەوە، نەشدەکرا لایەنێکی تری غەیری سەرچاوەکەی یەکەم، کە یەکەو فرەیی هەڵناگرێت ئەم تەرازوە دانێت، نەدەکرا غەیری ئەو، کە یەکەو فرەیی هەڵناگرێت دەستورەکە دارێژێت.. چونکە ئەو، حەکەمی دادپەروەرەو ناکەوێتە ژێر هەواو هەوەس و کورت و نوقسانی مرۆڤ و نەزانی وهەڵچونەوە!

دیاری کردنی ئەو تەرازووەو چۆنیەتی و یاساو رێسای شەرع بە کەسێك ناکرێت، کە زانیاریەکی سنورداری هەبێت، دارشتنی دەستورێکی ناوبژیوانی نێوان مرۆڤایەتی، لە هەموو قۆناغ وسەردەمێکیدا پێویستی بە زانیاریەکی رەهاو بێ سنوور هەیە، زانیاریەك، کە پەی بەوانە ببات، کە هەن، کە هەبوون، کە دەبن، زانیاریەك، کە پەیوەستی، نە بە کاتەوە هەبێت، نە بە شوێنەوە، زانیاریەك، کە هیچ بەربەستێکی نەیەتە رێ، زانیاریەك، کە ئیدراکی رابوردوو ئێستاو داهاتووی

مرۆڤایەتی کردبێت، کە دڵنیایی و گومان و نەزانراوی لای خەڵکی لا نەبێت، زانیاریەك، کە نەکەوێتە ژێر بەربەستی شوێن، نزیك و دوورو دیارو نادیار و هەست پێ کراو وهەست پێ نەکراوی لا نەبێت، ئەمەش زانیاری خوای کردگارە، کە پەی بە هەموو شتێکی هەبوون دەبات و، هەموو هەبوون پەی بە هیچ زانیاریەکی ئەو نابەن! بۆیە هەر ئەو دەزانێ حاڵی خەڵکیش بە چی چاك دەبێت و، هاوکێشەکانی ژیانیان چۆن پارسەنگ رادەگیرێت..

دیاری کردنی ئەو تەرازووەو دارشتنی ئەو دەستورە، دیسان پێویستە لە یەکێکەوە بێت، کە ئاتاج (موحتاج) نەبێت، لە کەم و کورتی بە دوور بێت، دیار نەمان و نەمانی بەسەر دا نایەت، دووربێت لە تەماع و هەڵپەکاریی، لە حەزو ترس، بەرزتر لە هەر هەموو گەردوون بە هەرچی تێیدایەتی وبە هەر کەسێکەوە، کە تێیدایەتی.. دیاری کردنی ئەو تەرازووە ودانانی پێویستی بە خوایەك هەیە، کە گیانی تۆڵەو هەواو هەوەس و حەزو لەزەتی نیە، کە لاوازو کەموکورت نیە، کە پەی بە هەموو پێداویستیەکانی هەر هەموو دروست کراوان لە یەك ئان و ساتدا دەبات.. ئەم تەرازووە، ئەم دەستورە پێویستی بە خوای کردگارو زانای ئاوا هەیە، نەك بە ئەقڵی مرۆڤ، کە لە زۆری و جۆراوجۆری و تێکچڕژاوی بارودۆخ و حاڵەتە جیاوازەکاندا، سەری لێ دەشێوێت، لەگەڵ پێداویستیە نوێوە بووەکانی مرۆڤی جیاوازی کۆمەڵگە جیاوازەکاندا سەری دنیای لێ دێتەوە یەك و دەپەشۆکێت! ناتوانێت بڕیاری شیاو بۆ حاڵەتی جۆراوجۆری ساتە جیاوازەکان لە یەك کاتدا بە پێی پێویست بدات، ژیریی مرۆڤ ناتوانێت ئەو تەرازووە دانێت، کە ئەو خەڵکە لێك جوداو دوورە بۆ چارەسەری کێشە جیاوازەکان و، ناکۆکی ململانێی حەزو دەسەڵاتیان پێویستیانە، بێنەوە سەری وپارسەنگانە مافی هەموویان دادپەروەرانە بداتەوە.. چونکە ژیریی خۆی دەکەوێتە چەوتی و راستیەوە، دەکەوێتە حەق و ناحەقەوە، دەکەوێتە ڕەواو ناڕەواییەوە، بۆیە هەر دەبێت ژیانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بە پێی ئەو تەرازووە راگیرێت، کە خوای خاوەن، خوای کردگار، خوای

کـارزان و کـارجوان بـۆ مرۆڤایـەتی دامەزرانـدووەو، وەکـو پـەیامێکیش بـە پێغەمبەرەکانیدا سەلامی خوایان لێ بێت ناردوێتی، ژیان ئاوا پارسەنگ دەبێـتو خەڵکەکەش ئاوا بە مافی خۆیان دەگەنو لـە ژیانیانـدا ئاسـوودە دەژیـن، چـونکە دەزانن خوایەکی بەبەزەییو بەدەسەڵاتو دادپەروەر، حوکمی هەموویان دەکـاتو، فەرقو جیـاوازی ناخاتە نێوان کەسیانو واسیتەی کـەس بـۆ کـەس لـە ناهەقیـدا قبووڵ ناکات..

ئەم کتێبە خواییە بۆ ئەوە نەهاتووە جیاوازی سروشتی نێوان خـەڵکی یەکـسان کات، یان حەزو ترسو ئامادەییو چۆنیەتیو شێوازی جیاوازی خەڵکی لە قاڵبـداو بیانکات بە یەك، چونکە ئەوە نامومکینە.. خوای گەورە خۆی وا لەو سـیفەتانەدا بە جیاواز دروستی کردوون، بەڵام بۆ ئەوە هاتووە، تـا پێیـان بڵـێ بـۆ چارەسـەری ناکۆکیەکانی نێوانتان وەرنـەوە لای ئـەم، تـەنها لای ئـەم، لـەم حەقیقەتەشـەوە، حەقیقەتێکی تر دێتـە گۆڕێ، کە دیدی مێژوویی ئیسلامی لەسـەر بنیـات نـراوە، کە ئەمەیە:

ئیسلام کە ئەم (کتێب)ەی، کە خوای گەورە (حەق)ی تێداو پێدا بۆ حوکم کردنی خەڵکی ناردۆتە خوارەوە، بۆ ناوبژیی کردنیـان لـە هەرچـی ناکۆکیـەکی، کـە لـە نێوانیاندا دروسـت دەبێـت، ڕێـسایەك بـۆ ژیـانی مرۆڤایـەتی دادەنـێو ژیانەکـە دەکەوێتە گەڕ.. ئیتر یان ئەوەیە خەڵکەکە لەسـەر ئـەم ڕێـسایە دەڕۆن وبـەردەوام پایەداری دەکەن، یان ئەوەیە، کە لێـی لا دەدەن و ژیانیـان لەسـەر ڕێـسای دیکـە دادەڕێژن، ئەمەشیان ناهەقیە، ئەگەر گریمان هەر هـەموو خـەڵکی لـە ماوەیـەکی مێژوودا بە غـەیری ئـەم هەقـە ڕازی بـوونو، لـە ژیـانی خۆیانـدا بەرنامەیـەکی ناهەقیان بەرقەرار کرد، ئەمە ئەو ڕێسا حەقەی سەرەوە ناگۆڕێت، خەڵکی حەکـەم نین، تا حەقو ناحەقی لێك هەڵاوێرن، تا بڵێین ئەمەمان پێ حەقـەو ئەمـەمان پـێ باتڵە! مەرج نیە ئەوەی، کە خەڵك بڕیاری لەسەر دەدات حەق بێت، ئەوەی خەڵکی بڕیـاری لەسـەر دەدات نابێتـە دیـن، دیـن ئـەوە نیـە، جیهـانبینی ئیـسلام هـەر

لەسەردتاوە ئەوەیە، کە کاری خەڵکی شتێکەو قسەی خەڵکی شتێکەو بنیاتنانی ژیانیان لەسەر شتێك، شتێکی ترە، ئەم شتانە ئەگەر پێچەوانەی کتێبەکەی خوا بوون نابن بە حەق، ناشبن بە ئەسڵێك لە ئەسڵەکانی دین! تەنانەت ناشبن بە راست تەفسیر کردنی دینەکەش!!

ئەم حەقیقەتە زۆر گرنگە لە پاراستنی بنەماکانی دینەکەدا، کە ناهێڵێت خەڵکی راوبۆچوون و لێکدانەوەی خۆیان بخەنە ناو ئەو بنەمایانەوە، بۆ نموونە، لە مێژووی ئیسلامیدا ئینحیراف روویداوە، تا هاتووە گەورەتر بووە، بەڵام ناشێت بوترێت، هەر کاتێك ناهەقیەك لە ناو موسوڵمانانندا روویداو ژیانی خەڵکی لەسەر دامەزرا، ئیتر دەبێتە وێنەیەکی واقیعی ئیسلام و ئیسلامەتی! نەخێر. ئیسلام هەر بە پاکیو دووریو بەریئی دەمێنێتەوەلەو واقیعە ناهەقەو ناشهێڵێت، چونکە ئینحیرافە، باتڵە، بیلکێنن بە دینەکەوە، ناشێت بکرێتە بەهانەی دامەزراندنەوەی ژیان لەسەری.. نابێتە بەڵگە، نە لە کاتە رابوردووەکەیدا، نە ئێستایو نە لە داهاتووی ژیانی خەڵکەکەشدا.. بۆیە ئەرکی سەرشانی ئەو کەسەشە، کە دەیەوێت ژیانی خەڵکی سەر لە نوێ لەسەر بنەماکانی ئیسلام دارێژێتەوە، ئەو بەڵگە ناهەقیانە کەنار خاتو نەهێڵێت بهێنرێنە پێش، پێویستە خێرا خۆیو خەڵکەکەش بگێرێتەوە بۆ ئەو کتێبەی، کە خوای گەورە بە حەق ناردوێتی و، حەقیشی پێدا ناردووە، تا حوکمی نێوان خەڵکی لە هەموو ئەو ناکۆکیانەی لە نێوانیاندا روو دەدات، پێ بکرێت..

بەڵێ کتێبەکە هاتۆتە خوارەوە.. بەڵام هەواو هەوەس لێرەو لەوێ، جارجارە بەسەر دەروونی خەڵکانێکدا زاڵ دەبۆوە! حەزو ئارەزوو، نەزانین و گومرایی، کاریگەر دەبوونەوە لەسەریان دووریان دەخستنەوە لە قبوولْ کردنی حوکمی دادپەروەرانەی کتێبەکەو، لە رازی بوون بەو حەقەی، کە کتێبەکە بۆ لای وی رێنیشاندەرێتی دەکردن، بەڵام ئەمانە ناحەقی ناکەن بە حەق، حەق لە کتێبەکەدایەو بە نەگۆڕی وپارێزراویی دەمێنێتەوە..

## بەندی چوارەم: مەرجی دینداریـیەکە

خوای گەورە دەفەرموێ: (وَقَالَ اللّهُ إِنِّي مَعَكُمْ لَئِنْ أَقَمْتُمُ الصلاَةَ وَآتَيْتُمُ الزَّكَـاةَ وَآمَنـتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرْتُمُوهُمْ وَأَقْرَضْتُمُ اللّهَ قَرْضًا حَسَنًا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَلأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّاتٍ تَجْـرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ فَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ مِنكُمْ فَقَدْ ضَـلَّ سَـوَاء الـسَّبِيلِ)٥ المائـدة/ ١٢ واتـە: خوای گەورە فەرمووی: بە راستی من لەگەڵتاندام بەو مەرجەی نوێژەکانتان بکەنو زەکات بدەنو باوەڕ بە هەموو پێغەمبەرو نێرراوانی من بهێننو ڕێزیان لـێبگرنو پشتیوانیان بنو لە پێناوی خوادا سەروەت و سامانتان بە قەرزێکی جوان بـۆ خـوا ببەخشن؛ منیش حەتمەن لە گونـاح و هەڵـەکانتان چاوپۆشـی دەکـەم و دەتانخەمـە بەهەشتانێکەوە، کە کانیو جۆباریان بە ژێردا دەڕوات، ئەو کەسەشتان، کـە (دوای ئەو پەیامانەی پێغەمبەران) باوەڕ نەهێنێت وبە کافری بمێنێتـەوە، ئـەوە گومـانی تێدا نیە ڕێی ڕاستی بزر کردووەو گومڕابووە..

باوەڕ هێنان بە نێرراوانـی خـوا، واتـە بـاوەڕ هێنـان بـە هـەر هـەموویان بـێ جیاوازی، بەو سیفەتەیان، **کە لەلایـەن خـوای پـەروەردگارەوە** پێـی نێـرراون، کـە هەموویان پەیامی دینیان هێناوە، **چونکە باوەڕ نەهێنان بە یەکێکیان** وکافر بـوون بەوانی دیکەیان، یان باوەڕ هێنان **بە هەندێکیان و باوەڕ نەهێنان بەوانی دیکـەیان،** مانای باوەڕ نەهێنانە بە پەیامە خواییەکەو **کافر بوون پێی!!**

باوەڕ هێنان شێوەیەکی ساکاری مەعریفی سلبی نیە، هەر بەوەندە بەس بێـت، کە ئەمە لە بیرو ژێرییدا بچەسپێت، کە (پێغەمبەران نێرراوی خوا بـوون)! نـەخێر، باوەڕ پـێ هێنانیـان کـارکردنێکی ئیجـابی سەرخـستنی ئـەو بەڕێزانەیـە، پـشت گرتنیانە لە هەڵگرتنی ئەو پەیامەی خوای گەورە پێیدا ناردوون، کە هەموو ژیانی خۆیان بۆ بڵاو کردنەوەی بانگەوازەکەی تەرخان کردبوو.. بـاوەڕ هێنـان بـە دیـنی خوای گەورە، هەر لە سەرەتاوە ئەوە دەخوازێت، کە موسوڵمان هەم دەبێت بۆ خۆی

ئەو دینە سەرخات، کە باوەڕی پێ هێناوەو هەوڵ بدات بڵاوی بکاتەوە، هەم دەبێت هەموو ئەو کەسانە سەرخات، کە دینی خوایان گرتووەو پابەندبوون پێوەی‌و بانگەوازەکەی بڵاودەکەنەوە.. تا لەسەر زەمیندا بچەسپێت، تا لە واقیعی ڕۆژانەی خەڵکی سەر زەمیندا کاری پێ بکرێت‌و بدرەوشێتەوە.. چونکە دینی خوایی هەر باوەڕهێنانێکی عەقائیدی نیە، تەنانەت هەر بەجێهێنانی دروشمەکانی خوا پەرستیەکەش نیە، بەڵکو هێنانەدی و چەسپاندنی هەموو بەرنامەی خوایە لە هەموو لایەنێکی ژیانی مرۆڤ وکۆمەڵدا، ئیسلام پرۆگرامی واقیعیانەی ژیانە، سیستمی ئاراستەکردنی کاروباری کۆمەڵگەیە.. بەرنامەو پرۆگرامی واش، پێویستی بە سەرخستن‌و پشتیوانی لێکردنە، پێویستی بە بەهێز کردنە، پێویستی بە ڕەنج‌و هەوڵ‌و کۆشش‌و جیهادە، تا لەلایەکەوە وەکو خۆی بە ڕاستی‌و پاکی‌و درەوشاوەیی بمێنێتەوەو، لە لایەکی تریشەوە، تا لە دنیای واقیعی کۆمەڵگەیەکیشدا بەرقەرار بکرێت.. گەر وا نەکرا، مانای وایە شوێن کەوتووەکان پەیمانی خۆیان نەبردۆتە سەرو، ئەو بەیعەتەیان فەرامۆش کردووە، کە بە خوای خاوەنی خۆیان و خاوەنی دینەکەیان داوە..

باوەڕ هێنان بە پێغەمبەرێتی هەموو نێرراوانی خوای گەورە، مەرجی موسوڵمان بوون و ئیمانداریێتیە، بۆیە باوەڕ نەهێنان بە یەکێکیان، باوەڕ نەهێنانە بە هەموویان، کافربوونە بە پەیامە خواییەکەیان، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: (إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيْنَ اللّهِ وَرُسُلِهِ وَيقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً. أُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا. وَالَّذِينَ آمَنُواْ بِاللّهِ وَرُسُلِهِ وَلَمْ يُفَرِّقُواْ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ أُوْلَـئِكَ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْ وَكَانَ اللّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا) ٤ النساء /١٥٠ - ١٥٢ واتە: ئەوانەی باوەڕ بە خواو پێغەمبەرانی ناهێنن ودەیانەوێت جیاوازی بخەنە نێوان خواو پێغەمبەرەکانیەوە (بەوەی گوایە باوەڕیان بە خوا هەیە، بەڵام باوەڕیان بە هەبوونی وەحی‌و پێغەمبەرانی نیە، یان باوەڕ بە هەندێك نێرراوی دەهێنن‌و باوەڕ بە

هەموو نێرراوەکانی ناهێنن) ودەیانەوێت ڕێبـازێکی دی لـەو نێوانـەدا بـۆ خۆیـان داڕێژن!! ئەوانە بە ڕاستی کافری موتڵـەقن، ئێمـەش سـزای وامـان بـۆ کافرەکـان داناوە، کە هەمووی هـەر سـووکایەتی و سەرشـۆڕی و زەلیلییـە. بـەڵام ئەوانـەی موسوڵمانن و باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرانی هێناوەو، هیچ جۆرە جیاوازیەکیان لە باوەڕ پێهێنانیاندا نەخستۆتە نێوان هیچیانەوە، ئـا ئەوانـە بـە دڵنیاییـەوە خـوای گەورە پاداشتی خۆیان دەداتەوە، خواش لێخۆشبوو میهرەبانە..

جولەکـەکان پاڵانتـەی ئـەوەیان دەکـرد، کـە گوایـە باوەڕیـان بـە هـەموو پێغەمبەرانی خوا هەیە، بەڵام نکوولێیان لە پەیامی سەیدنا عیساو سەیدنا محمد سەلامی خوایان لێ بێت دەکرد!! نەسرانیەکان (گاورەکان)یش لاف وگەزافی ئەوەیان لێ دەدا کە باوەڕیان بە پێغەمبەران هەیەو سەیدنا عیسا علیه السلام یشیان، نەك هەر بە پێغەمبەری خـوا بـەڵکو پەنابـەخوا، بـە کـوڕی خـواش دەزانـی!! کەچـی نکوولێیان لە باوەڕ هێنان بە پێغەمبەرێتی محمد (ﷺ) و پەیامەکەی دەکرد!!

قورئـانی پیرۆزیـش بەرپەرچـی هەڵوێـستی هـەردوولایانی دەدایـەوەو، دیـدو تێڕوانینی ئیسلامی گشتگیرو تەواوی بۆ ئەوانیش‌و بۆ موسـوڵمانان‌و کۆمەڵگـەی مرۆڤایەتی ڕوون دەکردەوە، کە باوەڕهێنان بە خوای گەورە چـۆنە، باوەڕهێنـان بـە نێرراوە بەڕێزەکانی چۆنە، کە نابێت باوەڕ بە خوا بهێنرێت‌و نکوڵی وەحی بکرێـت، هەروەك، کە ناشبێت باوەڕ بە هەندێك پێغەمبەر بهێنرێت‌و، باوەڕ بەوانی دیکەیان نەهێنرێت.. ئەمەشی ناو دەناسەرگەردانی‌و گومڕا بوون، لەم ڕوانگـەوە بـوو، کـە ئیسلام بوو بە تەنها (دین) ێك، کە خوای گەورە پێی ڕەوایە شوێنی کـەون‌و، هـیچ دینێکی دیکەی پـێ ڕەوا نـەما، داوای لـە هـەر هـەموو خـەڵکی ئـەو زەمانـەو زەمانەکانی دوایی کرد، کە ئەم ئیسلامە بکەنە بەرنامەی ژیانیـان‌و دینێکـی تـر نەگرنە بەر.. چونکە تەنها ئەم ئیسلامە بەو دیدو تێڕوانین‌و پێناسـانەیەوە، لەگـەڵ خوا بەیەکناسیندا یەك دەگرێتەوەو، داواکاریەکانی خواناسی دێنێنێتە دی.

خوابەیەکناسینی خوای گـەورە بـەو شـێوەیەی ئیـسلام ڕاڤـەی کـردووە ئـەوە دەخوازێت، کە وا سەیری ئەو دینە بکرێت، کـە بـە پێغەمبەرانیـدا نـاردووە، کـە

یەکە، پێغەمبەرانیش هەموویان یەکن، یەك دیدو تێڕوانین و پێناسەی دینی خواییان هێناوەو، بانگەوازی هەموویان بۆ خواناسین هەر یەك بووە، گەیاندنی پەیامی خوابەیەکناسین لای هەمووان راسپاردەیەکی خوایی بوودو هەمویان، لە سەردەمانی جیاوازدا بە کۆمەڵگەی جیاوازیان گەیاندووە. بۆیە باوەڕ نەهێنان بە هەر یەکێك لەو پێغەمبەرانە، لە راستیدا کەلێن خستنە ناو باوەڕهێنانە بە خودی دینە خواییەکەو بە یەکێتی پێغەمبەران، دید لێڵی وگومڕاییە لە پەی پێبردنی خوابەیەکناسین وخواپەرستی و دینداریێتیدا.. چونکە دینی خوای گەورە، کە بۆ بەرنامەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ناردووە، وەك چۆن لە سەرچاوەیەوە هەر یەکە، هەر بە یەکیش دەمێنێتەوەو بە گوێرەی جیاوازی سەردەم و کۆمەڵگەو نەوەکانی مرۆڤایەتی ناگۆڕێت..

لەم ئایەتەدا، کە خوای گەورە فەرمووی ئەوانەی، کە دەیانەوێت جیاوازی بخەنە نێوان خواو پێغەمبەرەکانیەوە بەوەی، کە باوەڕ بە خوای گەورە بهێنن، بەڵام باوەڕ بە وەحی وبە پێغەمبەرەکانی نەهێنن! هەروەها ئەوانەی، کە دەیانەوێت جیاوازی لە باوەڕ هێنانیاندا بخەنە نێوان پێغەمبەرەکانەوە بەوەی، کە باوەڕ بە هەندێکیان بهێنن، کە نێرراوی خوان، بەڵام باوەڕ بەوانی تریان نەهێنن، کە ئەوانیش نێرراوی ئەون! هەردوو پۆلە خەڵکەکەی بەو کەسانە ناوزەد کردوون، کە باوەڕیان بە خوا پێغەمبەرەکانی نەهێناوە! چونکە جیاوازیان خستنە نێوان خواو پێغەمبەرانی، یان نێوان خودی پێغەمبەرانەوە سەلامی خوایان لێ بێت، ئەمەشی لێ کردوونەتە باوەڕ نەبوون بە خوای گەورەو بە دینەکەی..

باوەڕ یەکە لێك هەڵناوەشێت، باوەڕ هێنان بە خوای گەورەو بە یەکخوایێتی ئەو، ئەوە دەخوازێت، کە باوەڕ بەوە بکرێت، کە سەرچاوەی هەموو دینەکان یەکەو، خوای گەورە بۆیە بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ناردووە، تا ژیانی خۆیان بە پێی دیدی ئەو و، لەسەر زەمینەی ئەو و بە پێی رێنمایی حەڵاڵ و حەرامی ئەو دامەزرێنن..

باوەڕ بوون بە یەکێتی پێغەمبەران، کە بەم دینەوە هاتوون، کە خۆیان لە خۆوە نەهاتوونو خۆیان لە خۆڕا لەو خەڵکە نەکردۆتە پێغەمبەری خواو پێشەواو

سەردار، بێ ویستی خوای گەورەو بێ وەحی نەهاتوون! باوەڕ بوون بە یـەکێتی ئـەم بەڕێزانە، یەك هەڵوێستی بەرامبەر هەر هەموویان دەخوازێت.. ئـەم بـاوەڕ بوونـە شتێکە لێك ناترازێنرێت، یان باوەڕهێنان، یان کافر بوون.. باوەڕ هێنانەکەش بـەو شێوەیە، کە ئیسلام روونی دەکاتەوە، باوەڕ نەبوونیش ئەوەیە، کـە خـەڵکانێك بـۆ خۆیان داتاشیووەو، پێیان وایە ئەو ئینحیرافەی ئەوانیش هەر باوەڕ بوونە! نا، ئەوە کافربوونە، با خاوەنەکانیشیان وا بزانن باوەڕیان هێناوە.. چونکە ئەوان باوەڕیان بە هەندێك هێناوەو باوەڕیان بەوانی دیکە، یـان بـە هەنـدێکیان نـەهێناوە، ئەمـەش جێی رەزامەندی خوای گەورە نییە.. بۆیـە سەرەنجامیـشی سـزایە.. هـەر هـەمان سزای ئەو کافرانەیە، کە هەر لە سەرەتاوە باوەڕیان بە هیـچیان نـەهێناوە، سـزای هەموویان هەر (سووکایەتی و سەرشـۆڕی و زەلیلییـە)، چـونکە کـافری حـەقیقین: (أُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًـا) واتـە: ئەوانـە بـە راسـتی کافری موتڵەقن، ئێمەش سزای وامان بـۆ کافرەکـان دانـاوە، کـە هـەمووی هـەر سووکایەتی و سەرشۆڕی و زەلیلییە..

موسوڵمانان، کە لە دیدێکی راستەوە روانیویانەتە ئەم حەقیقەتـەو، وەك خـۆی دیویانەو وەکو خوای گەورە داوای کردووە باوەڕیـان هێنـاوە؛ باوەڕەکـەیان راسـتە، دروستە، قبووڵە.. چونکە باوەڕیان بە خوا هێناوە، باوەڕیان بە وەحیەکەی هێناوە، کە بۆ نێرراوانی خۆی ناردووە، باوەڕیـان بـە هـەر هـەموو پێغەمبـەرکانی خـوای گەورە هێناوە، بێ جیاوازی لە نێوانیاندا، هەر هەموو نێرراوێکـی خـوای گـەورە، لایان خۆشەویستەو جێی رێزە لایان.. هەموو دینە ئاسمانیەکانیشیان لا پەسـەندە و پێیان رەوان، مەگەر ئەوەی تەحریفاتی تێـدا کـرا بێـت، ئـەو لایەنانـەی گـۆڕرابن تێیاندا.. ئەوە دینی خوا نین، ئەوانە رای مرۆڤن و بە ناوی دینـەوە خراونەتـە روو! چـونکە موسـوڵمانان باوەڕیـان وایـە، کـە ئەسـڵی دینـەکان یەکـە، سەرچـاوەی هەموویان، هەر یەکە لە یەك خوای کارزان و کارجوانەوە هـاتووە، کـە ویـستوێتی مرۆڤایەتی دینەکەی ئەو وەرگرن و، ئەو دینـەی ئـەو بکەنـە بەرنامـەی ژیانیـان،

هەموو پێغەمبەران و نێرراوانی خوای گەورە، هەر بەو یەك دینەوە هـاتوون، هـەر بەو یەك بەرنامەوە هاتوون.. لە بیری موسوڵمانانددا، کاروانی بەرێزی پێغەمبـەران پەیوەستە. لە نوحەوە بۆ ئیبراهیم.. بۆ موسا بۆ عیسا بۆ محمد سەلامی خوایان لێ بێت.. هەموویان برای یەکن، پێشەوایەتی کردنی ئەم کاروانـە بـەرێزەیان، کۆنـە و ڕێبازێکی تولانیان بڕیووە، هەموویان هەڵگری یەك راسـپاردەی خـوایین، بـۆ یـەك بانگـەواز خـەڵکیان بانگهێـشت دەکـرد، هـەر یەکـەیان میراتگریـی بەرێزەکـەی پێشووتری بوو، بێ ئەوەی یەکیان لە دیدی خۆیەوە شتێك لـەم بانگـەوازە خوایـیـە بگۆڕێت، یـان لێـی لادات، بـەردەوام دەبـوو.. دیـن لەوانـەوە وەرگـیراوە، دیـنی هەمووشیان یەکەو هەقەو دروست و ڕەوایە، غەیری بانگەوازی ئەوانیش ناهەقی و گومڕاییە.. سەرگەردانی و وێڵییە..

ئا ئەمە ئەو ئیسلامەیە، کە خوای گەورە ئەو نەبێت، هیچی تری لا دین نیەو لە کەسی وەر ناگرێت.. موسوڵمانانیش ئا ئەوانـەن، کـە شـایانی پاداشـتی لای خـوای گەورەن بەوەی لەبەر خاتری ئەوو، بۆ ڕەزامەندی ئەو کردوویانە، لە هەمان کاتیـشدا شایانی لێبوردن و لێخۆشبوونی ئەویشن، لەوەی تێیدا کەمتەرخەم وکـەمکار بـوون: (**أُولَـئِكَ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْ وَكَانَ اللّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا**)٤ النسـاء / ١٥٢..

ئیسلام کە بـەم شـێوەیە لـە باوەڕهێنـان بـە خـوای گـەورەو پێغەمبەرانیـدا، توندوتیژ دەبێت لەبەر ئەوەیە، کە ئەم باوەڕە لایەقی ئەوەیە بکرێتە زەمینەی ئـەو فیکرو بۆچوونەی، کە موسوڵمان دەبێ دەربارەی خوایەتی خوای گـەورە هـەیبێت، هەر ئەویش بناغەی دیدێکی ڕاست ودروست وڕەوایە و شتی لەسەر ڕێك دەخرێت، فرەیی ناگرێتە خۆ، چونکە فرەیی بەو دیدە نامۆیـە، فرەیـی مانـای پێککێشرانی دیدو بۆچوونەکان، دیدی یەکخواناسی وەکو، کە ئیسلام پێناسەی دەکات، یـەکێتی هەموو ڕێساو یاساکانی هەبوون وگەردوون وژیان بە درێژایی بـیرو قـوڵایی ژێریـی دەناسێنێت، ئەمە وەکو گەردوون وژیان ومرۆڤ، ئینجا یەکێتی هەر هەموو مرۆڤە، کە موسوڵمانەکانی مێژووشی دەخاتە پاڵ، پێیان دەڵێ، کە هەموو ئەو ئیماندارانە

لە هەر کات وشوێنێکدا بن لە کاروانێکدان، هێزی کوفریش بەرابەر هەموویانـە، ئەمان حزبێکن و بەرامبەر حزبەکانی شەیتان وەستاونەتەوە.. بۆیە زۆر هۆشیاریان دەداتێ، کە ئەم ریزو بەرەیەی ئەمان ئەوە نیـە، هـەر لارێ و دیـد لێـڵ و خـوارو خێچێك بە ناوی دینەوەی خۆی پێدا کات، رێ بدرێت بێتە ناوی!! ئەمە ریزێك نیە جێی لارێ و موئحەریفانی تێـدا ببێتـەوە، بـا لـە نەسڵێـشیدا کتێبێکـی ئاسمانی هەبووبێت.. ئەمە ریزو بەرەی خاوەن باوەڕە راست و دروسـت و پتەوەکانـە، ریـزی خاون عەقیدە دامەزراوەکانە، کە لێی لانادەن..

بۆیە ئیسلام ئەو دینەیە، کە خوای گەورە پێی رازیەو دەیەوێت، لەبەر ئەم دیدە عەقائیدیەشە، کە موسـوڵمانانیش باشـترین ئوممـەتن لـە مێـژودا، کـە خراونەتـە بەرچاو.. موسـوڵمانە عەقیدە پاکەکان، ئەوانەی بەم عەقیدە پاکەوە دەبزون.. نـەك هەر کەسێك، کە لە ماڵـە موسـوڵمانێکدا لـەدایکبووبێت، یـان ئەوانـەی وشـەی ئیسلامەتیان کردۆتە بنێشتە خۆشەی سەر زاریان..

لەبەر رۆشنایی ئەم پێناسەو روون کردنەوەدا، ئەو کەسانە ئاشـکرا دەبـن، کـە جیاوازی دەخەنە نێوان خواو پێغەمبەرەکەیەوە، ئەوانەی جیـاوازی دەخەنـە نێـوان ئەم پێغەمبەرو ئەو پێغەمبەرەوە، ئەمانەی، کە لە کاروانی ئیمانداران جـێ مـاون ودەیانەوێت هەرچۆنێك بووە خۆی پێـدا هەڵڕۆسـکێننەوە!! ئەمانـە ئـەو یەکێتیـە هەڵدەوەشێننەوە، کە خـوای گـەورە بـەم عەقیدەیـە هێناوێتیـە بەرچـاو، ئەمانـە نکووڵی لەو یەکێتیە گشتیە دەکەن، کە باوەڕ بە خوا هێنـان بـە پێناسـەو راڤـەی ئیسلام دەیهێنێتە دی..

کاروانی پێغەمبەران یەکە، لەو سەری کاروانەکەوە، تـا ئەمـسەری بـە درێـژایی مێژوی مرۆڤایـەتی، هـەر یـەك بانگـەوازیان لێ دەبیـستیت! قۆناغـەکانی مێـژوی مرۆڤایەتیان بەم بانگەوازەوە پێکـەوە بەسـتۆتەوە، یـەك پـەیامیان بـۆ مـژدەدان و هۆشـداری هێنـاوە.. یـەك کـاروانی پـیرۆز، کـە سـەر قافڵەکـەی نـوح وئیـبراهیم وئیـسماعیل وئیـسحاق ویـەعقوب وئەسـبات وعیـساو ئـەییوب ویـونس وهـارون

سولەیمان و داودو موسایە.. ئەمان و ئەو بەڕێزانـەی تـریش، کـە خـوای گـەورە لـە قورئانەکەیدا باسیانی بۆ پێغەمبەرە نازدارەکەی (ﷺ) فـەرمووەو ئەوانەشـیان، کـە باسیانی بۆ نەفەرمووە، کاروانی بەڕێزی پێشەوایەتین لە جۆرەهـا خـاك وخـوێن، لـە جۆرەها گەل وشوێن.. رەگەزو نەسەبی هیچیان نەبۆتە هۆی لێك جوداییان، کەسـیان نابینیت پابەندی خاکێك بووبن، یان بـە نیـشتیمانێکەوە پەیوەسـت بـووبن، نـە بـە کات‌و نە بە شوێنەوە پەیوەند نەبوون.. کێ عەقیدەکەی لێ وەرگرتبن، کەسیان بووە، کویێ پەیامەکەی وەرگرتبن بۆتە ولاتیان: (إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ وَالاسْبَاطِ وَعِيسَى وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُدَ زَبُورًا. وَرُسُلاً قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلاً لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا. رُّسُلاً مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا)٤ النساء / ١٦٣- ١٦٥ واتە: ئێمە وەحیمان بۆ تۆ نارد، هەروەکو، کە وەحیشمان بۆ نوح ناردو پێغەمبـەرانی دوای ئـەویش، وەحیمـان نارد بۆ ئیبراهیم‌و ئیسماعیل‌و ئیـسحاق‌و یـەعقوب‌و ئەسـبات‌و عیـساو ئـەییوب‌و یونس‌و هارون‌و سولەیمان، زەبوریشمان بۆ داوود نارد. هەروەها بـۆ پێغەمبـەرانێکی دیکـەش، کـە هەیانـە بەسـەرهاتیانمان بـۆت گێڕاوەتـەوەو، هەشـیانە بۆمـان نەگێڕاویتەوە، خوای گەورە قـسەی لەگـەڵ موسـادا بـە دوانـدنی ڕاسـتەوخۆ کـرد. پێغەمبەران‌و نێرراوانمان ڕەوانە دەکرد، تا مـژدەدەرو هۆشـیاردەر بـن، تـا خـەڵکی دوای ناردنی ئەو بەڕێزانە، هیچ بەهانەو بیانوویەکیان (بۆ بێ دینی‌و بـاوەڕ بـە خـوا نەکردن) نەمێنێت، خوای گەورە خاوەن دەسەڵات‌و دانایە..

هەموویان لەو سەرچاوە بەڕێزو پڕ ڕێزەوە هاتوون‌و پەیامی هیدایـەتیان لـەوێوە هێناوە، هەر هەموو لەو نورە پاك‌و بێ گەردو رۆشنەیان وەرگرتووەو، بە ژیانی پـڕ فەڕیان بریسکاندوویانەتەوە، هەر هەمووشیان هەمان مـژدەو هۆشـدارییان هێنـاو دایان بە خەڵکی، هەر هەمووشیان پێشەوایەتی مرۆڤایەتیان، کە دەکرد بـۆ ئـەوە بوو بەرەو ئەو نورە خواییەیان ببـەن، ئـیتر هـەیانبوو بـۆ تـیرەو هۆزێـك هـاتبوو،

هەیانبوو بۆ نەتەوەیەك، هەبوو بۆ شارێك، یان بۆ شارۆچکەیەك هاتبوو، ئینجا هەیانبوو بۆ هەر هەموو مرۆڤایەتی هات، وەکو محمد (ﷺ) کە کۆتا پێغەمبەرە..

ئەم بەڕێزانە هەر هەموویان وەحیان لە خوای گەورەوە وەردەگرت، کەسیان هیچ شتێکی لەخۆوە نەهێناو بفەرموێت ئەمە وەحیە! دادو بەزەیی بەرفراوانی خوای میهرەبان وای دەخواست، کە ئەم پێغەمبەرو نێرراوە بەڕێزانەی، کە خوای گەورە هەندێکیانی لە قورئانەکەیدا باس فەرمووەو، هەشیانە باسیانی نەفەرمووە، پەیامی خوایی بۆ مرۆڤایەتی بهێنن و مژدەی ئەوەیان بدەنێ، کە ئەگەر باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرانی هێناو بە دینەکەیەوە پابەند بوون، خوای گەورە پاداشتێکی ئێجگار زۆرو گرنگی بۆ دیار کردوون، کە خەڵاتیانپێی دەکات، ئەو پاداشتە گەورەیە بۆ ئەو ئیماندارانەیە، کە شوێن کەوتەی ئەم پێغەمبەرانەی خوا بوون و ئاوا ماونەتەوە، تا بە دیداری وا شاد بوون و پاداشتەکەیان بەڕێزەوە لەبەر چاوی خەڵکی قیامەت دراوەتێ و، خراونەت ئەو مەنزیلەو پلە ڕێزەی، کە شایانی بوون و ئیتر لە نیعمەتەکانی خوادا ماونەتەوە.. لە هەمان کاتدا هۆشداری ئەوەیان بدەنێ، کە ئەگەر باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرانی نەهێناو بە دینەکەیەوە پابەند نەبوون، ئەگەر کافر بوون و سەرپێچیان کرد، ئەوە حەتمەن بەر غەزەبی خوا دەکەون، سزا دەدرێن، دەخرێنە دۆزەخەوە.. ئەمەیە کە دەفەرموێ: (لِئَلا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ) ٤ النساء /١٦٥ واتە: تا خەڵکی دوای ناردنی ئەو بەڕێزانە، هیچ بەهانەو بیانوویەکیان (بۆ بێ دینی و باوەڕ بە خوا نەکردن) نەمێنێت.

خوای گەورە بەڵگەو نیشانەی لە ناخی مرۆڤ وئاسۆی گەردوون و ژیاندا زۆرن، ژیریی بە مرۆڤ بەخشیووە، تا لەو بەڵگەو نیشانانەی ناخ وگەردوون بکۆڵێتەوەو، بیانکاتە مایەی باوەڕ هێنان و عەقیدە پتەو کردن، بەڵام خوای پەروەردگار، کە دەیزانی مرۆڤی وا لاسار هەیە، ئەم ژیریی و بیرییەی ناخاتە کار، زۆرن ئەوانەی شوێن هەواو هەوەسی خۆیان دەکەون و، خۆ گێل دەکەن وگوێ بەو بەڵگەو نیشانانە نادەن و، بە دووی ئارەزووەکانیاندا وێڵ دەبن و بەرەو خوای گەورە نایان،

بۆیە هەر لە بەزەیی خۆیەوە، بە دانایی خۆی بە باشتری زانی، پێغەمبەرانیان لە ناودا هەڵبژێرێت، تا مژدە دەریان بن، تا هۆشداریان بدەنێ، تا خوای گەورەو رۆژی دوایی و پاداشت و سزاکانیان بخەنەوە یادو رێی چاکەیان نیشاندەن، تا هەوڵیان لەگەڵدا بدەن، سروشتی مرۆڤانەیان پاك کەنەوەو چڵك و چەپەڵی گومان ودوودڵییان لە بیرو ژیرییدا بڕەوێننەوەو، تۆزو خۆڵی هەواو هەوەس لە دڵیاندا بتەکێنن و، ئامادەی خواوویستیان بکەنەوەو بیانهێننەوە سەر راستە شەقامی دینداریی، تا سەرکەوتوی دنیاو ڕووسووری قیامەتیان کەنەوە..

# بەندی پێنجەم: سەرچاوەی ڕێنمایی

خوای پەروەردگار دوای ئەوەی باسی سەیدنا ئیبراهیم دەفەرموێ، ئینجا دێتە سەر باسی هێندێکی تر لەو پێغەمبەرە بەڕێزانە سەلامی خوایان لێ بێت دەفەرموێ: (وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ كُلاً هَدَيْنَا وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ وَمِن ذُرِّيَّتِهِ دَاوُدَ وَسُلَيْمَانَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَى وَهَارُونَ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ. وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَى وَعِيسَى وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِّنَ الصالِحِينَ. وَإِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا وَكُلاًّ فَضَّلْنَا عَلَى الْعَالَمِينَ. وَمِنْ آبَائِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ وَإِخْوَانِهِمْ وَاجْتَبَيْنَاهُمْ وَهَدَيْنَاهُمْ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ. ذَلِكَ هُدَى اللّهِ يَهْدِي بِهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَلَوْ أَشْرَكُواْ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ. أُوْلَـئِكَ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَـؤُلاء فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُواْ بِهَا بِكَافِرِينَ. أُوْلَـئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللّهُ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ قُل لاَّ أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرَى لِلْعَالَمِينَ) ٦ الانعام / ٨٤-٩٠ واتە: ئیسحاق و یەعقوبمان پێ بەخشی، کە هەر یەکەیانمان ڕێنمایی کردبوو! پێشتریش نوحمان هەر وا ڕێنمایی کرد، ئینجا لە نەوەی ئیبراهیم داوودو سولەیمان وئەییوب ویوسف وموساو هارونمان هێنایە بوون وڕێنماییمان کردن، ئێمە ئاوا پاداشتی پیاوچاکان دەدەینەوە.. هەروەها زەکەریا و یەحیاو عیساو ئیلیاس، بەڕاستی هەموویان لە پیاوچاکان بوون. دیسان ئیسماعیل ویەسەع ویونس ولوط (ڕێنماییمان کردن) و فەزڵیانماندا بەسەر هەموو خەڵکی جیهاندا (لە سەردەمی ژیانی خۆیاندا) دا.. هەروەها باب وباپیرانی ئەوان و وەچەو نەوەو برایانی تریانمان هەڵبژاردو هەموویانمان ڕێنمایی کردو ڕێی ڕاستمان نیشان دان.. ئەوەیە هیدایەت و ڕێنمایی و ڕێنیشاندانی خوایی، کە هەر کەسێکی بیەوێت لە بەندە شایان وشیاوەکانی، دەستگرۆیی دەکات وهیدایەتی بۆ ئەو ڕێبازەی خۆی دەدات، هەر کەسێکیش شەریك بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە هەرچی کارو کردەوەی هەیە پوچەڵ دەبێتەوەو مایەپووت دەبێت.. ئەوانە ئەو

پیاوچاکانەن، کە ئێمە کتێبی ئاسمانی خۆمانمان بۆ ناردوون و هیدایەت وحیکمەت (کە بە مانای دەسەڵاتی فەرمانڕەواییش دێت) و پێغەمبەرێتیمان داونەتێ، جا ئەگەر نەفامێك باوەڕیان پێ نەهێنێت، کەسانی تری ژیرو فامیدەی وامان دیاری کردووە، کە کافر نەبن بەوان وهیدایەتی خوایی وەرگرن لێیان وپشتیوانیان لێ بکەن. ئەوانە (ئەو بەڕێزە ناوبراوانەی سەرەوە) ئەو کەسانەن، کە خوای گەورە بە تایبەت ڕێنمایی کردوون، دەی سا تۆش (وشوێن کەوتوانیشت) شوێن هیدایەتی ئەوان کەوەو بە نمونەیان وەرگرە، بەو خەڵکەش بڵێ: ئاخر خۆ من لەسەر ئەم بانگەوازە (خواییەم کە ئێوەی بۆ بانگهێشت دەکەم و دەمەوێت هیدایەتی خوایی وەرگرن) داوای کرێ و پاداشتم لێتان نەکردووە، ئەم قورئانە، کە خوا بە مندا ناردوێتی بۆ هەموو جیهانیان، مایەی بیرکردنەوەو یادی خوایە..

لەو ئایەتانەی سەرەوەدا، ناوی حەڤدە پێغەمبەرو نێرراوی بەڕێزی خوایی، جگە لە نوح و ئیبراهیم سەلامی خوایان لێ بێت هاتووەو، ئاماژەی بۆ نێرراوی تریشی تێدایە (وَمِنْ آبَائِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ وَإِخْوَانِهِمْ): هەروەها باب وباپیرانی ئەوان و، وەچەو نەوەو برایانی تریانمان هەڵبژارد.. باسی ئەم کاروانە بەڕێزە بەو شێوەیەو پێکەوە پێشەکیەکی ئەو بڕیارە خواییەی دواییە: (ذَٰلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ) ئەوەیە هیدایەت وڕێنمایی وڕێنیشاندانی خوایی، کە هەر کەسێکی بیەوێت لە بەندە شایان و شیاوەکانی دەستگرۆیی دەکات و هیدایەتی بۆ ئەو ڕێبازەی خۆی دەدات، هەر کەسێکیش شەریك بۆ خوا بڕیار بدات ئەوە هەرچی کارو کردەوەی هەیە پوچەڵ دەبێتەوەو مایەپووت دەبێت.. ئەمە بڕیاری یەکەمە..

**بڕیاری یەکەم:** پێناسەو ئیقرار کردنی سەرچاوەی هیدایەتی خواییە لەسەر ئەم گۆی زەویە دا.. هیدایەتی خوایی، ڕێبازی خواویستی وا، بەو شێوە ڕوونەی، کە لەو وەحیەدا هاتووە، کە پێغەمبەرانی بەڕێز لە خوای گەورەوە هێناویانە، ئەوی باوەڕی هێناوە لەوە دڵنیایە، قەناعەتی بەوە هەیە، کە دەبێت بۆ خواناسیی شوێن

ئەو بەڕێزانە بکەوێت، دەبێت لەو تەنیا سەرچاوەیەوە هەڵهێنجێت وبەس. چونکە لەوەش دڵنیابووەو قەناعەتی تەواوی لا دروست بووە، کە ئەوە ڕێنماییەکەی خوای گەورەیە، ئەویش هیدایەت دەدات وڕێنیشاندانی دەکات، ئەو بە فەزڵی خۆی هەر کەسێکی بوێت لە بەندەکانی ڕێنمایی ئەو ڕێبازەی دەکات.. خۆ هەر سات و ئانێك، ئەو بەندە ئیماندارو هیدایەتدراوانە لە تەوحیدەکە دەرچن، لە یەکخواناسی بترازێن، کە ڕێنماییەکەی بەرەو خوایان لێوە وەرگرتووە، ئەوە کەوتوونەتە شیرکبازیی! جا لە عەقیدەو باوەڕیاندا بێت، یان لە پەرستن دا، یان لە وەرگرتنی دیدو ڕێبازیاندا بێت.. چارەنوسیان حەتمەن ئەوە دەبێت، کە کارو کردەوەکانیان پووچەڵ دەبێتەوەو بە هەدەر دەڕوات! واتە هیچیان بۆ نامێنێتەوە، وشەکانی ئەم ئایەتە چارەنوسە، کە بە دیمەنێکی سەیر دەچوێنێن: دیمەنی مانگایەکی هەڵاوساو، کە گیایەکی ژەهراوی خواردووەو پێی ئاوساوەو خاوەنە نەزانەکەشی، وا دەزانێت گۆشتی گرتووەو بۆی بۆتە مایەی دەوڵەمەندی! بەلام کاتێك دەزانێت بەلادا دێت و ڕاست نابێتەوەو ئەوەندەش بۆگەن دەکات، کە دەبێت زوو توڕی هەڵداو لە خۆی دوورخاتەوە!! ئەوەش روون کردنەوەی زمانەوانیی (حُبُوط) ە.

(أُوْلَـئِكَ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَـؤُلاء فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُواْ بِهَا بِكَافِرِينَ): ئەوانە ئەو پیاوچاکانەن، کە ئێمە کتێبی ئاسمانی خۆمانمان بۆ ناردوون وفەرمانڕەوایی و پێغەمبەرێتیمان داونەتێ، جا ئەگەر نەفامێك باوەڕیان پێ نەهێنێت، کەسانی تری ژیرو فامیدەی وامان دیاری کردووە، کە کافر نەبن بەوان وهیدایەتی خوایی وەرگرن و پشتیوانیان لێ بکەن.. ئەمەش بڕیاری دووەمە..

**بڕیاری دووەم**: ئیقراری بەڵگەنەویستێکە، کە ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە ناو براوانەو ئەوانی دیکەش، کە ئاماژەیان پێکراوە، ئەوانن، کە خوای گەورە هیدایەت وحیکمەت و(کە بە مانای دەسەلاتی فەرمانڕەواییش دێت) پێغەمبەرێتی خۆی پێ بەخشیوون و پەیامی پێیدا ناردوون.. هەندێك لەو

پێغەمبەرە پێشەوایانە کتێبی تایبەتی پێدا ناردوون، وەکو سەیدنا موسا، کە تەوراتی بۆ ناردووە، یان سەیدنا داوود، کە زەبوری بۆ ناردووە، یان سەیدنا عیسا کە ئینجیلی بۆ ناردووە.. هەندێکیان خوای گەورە دەسەڵاتی حوکم و فەرمانڕەوایی پێ بەخشیووە وەکو سەیدنا داوود وسولەیمان.. بەڵام هەر هەموویان بەو پەیامە دینیەی دراویانەتێ، ئاراستەی خواویستیان بە خەڵکەکە ناساندووەو، بەو دینە دەسەڵاتی خواییان لە دڵ و دەروونی شوێن کەوتوانیاندا جێگیر کردووە..

خوای گەورە هەر پێغەمبەرێکی ناردبێت، ئەوەی بۆ ئیمانداران روون کردۆتەوە، کە دەبێ گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆ دەربڕرێت.. وەکو لە ئایەتی تردا دەردەکەوێت[1] بۆیە خوای گەورە کتێبی خۆی پێدا ناردوون، تا حوکمی خەڵکی و داوەریی کێشەی نێوانیان بە دادی خوایی بکەن، هەمووشیان ئەو حیکمەت و دەسەڵاتەیان دراوەتی، کە بە ناوی خوای گەورەوەد وەکو وەحی ئاراستە بکەن و، وەکو حیکمەتی دانایی خۆشیان لەژێر چاودێریی وەحی خواییدا حوکم بکەن، فەرمان دەرکەن.. خوای گەورە ئەوانی کردۆتە وەکیلی خۆی وپێناسەو جێبەجێ کردنی دینەکەی خۆی پێ سپاردوون، بانگەوازی خواویستی خۆی داونەتێ، تا خەڵکەکەی خۆیانی بۆ بانگهێشت کەن، تا دینەکە بە ساغ و تەواوی لە ناویاندا پیادە کەن، جا ئەگەر موشریکانی عەرەب باوەڕیان بە پەیامەکەی نەهێناو نەهاتنە ژێر ئالای خوابەیەکناسین، ژێر دەسەڵاتی حوکم وحیکمەتی ئەمەوەو شوێن پێغەمبەرێتیەکەی نەکەوتن، با ئەم و موسوڵمانان لەوە بێ خەم بن، کە خوا هیچ باکی بەوانە نیە؟! ئەم دینە چ ئیحتیاجی بەوانە؟! ئەمان خۆیان و شوێنکەوتووە ئیماندارو پیاوچاکەکان بەسن.. ئەم دینە ئەمانەی دەوێت..

---

[1] وەکو (وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ فَإِذَا جَاءَ رَسُولُهُمْ قُضِيَ بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ) یونس/ ٤٧ یان: (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ) الحدید/ ٢٥..

ئەمە حەقیقەتێکی کۆنە، ڕەگ و ریشاڵی بە مێژوودا ڕۆچووە، ئەمە کـاروانێکی پیرۆزەو بەردەوام بەڕێوەیە، ئاڵقـەی پەیوەسـتییان پێکـەوە بەنـدە، قۆنـاغ بـە دووی قۆناغدا هاتووە، یەك بانگەوا زو هەموو پێغەمبەران و نێرراوانی خوای گەورە، یـەك بە دوای یەکدا هەڵیان گرتووەو گەیاندوویانە، ئەوی شایان وشیاوە، خوای گـەورە لـە چارەی نووسیوەو هیدایەتەکەیان لێ وەردەگرێت، ئەمە سـوکنایی دڵـی موسـوڵمانە، ئەمە هێمنی دەخاتە قوڵایی ناخی دەروونەوە، موسوڵمانان هەرچـەند کـەم بـن، لـە هەر کوێ بن، لە هەر کاتێکدا بن، هەست دەکەن لقەدارێکی بڕاو نـین! موسـوڵمانان لە هەر کات و شوێنێك بن، پەلو پۆو لقی درەختێکی خوارسکن، کە ریشاڵیان وا لـە نـاخی زەویـداو لـق و پۆپیـان بـۆ ئاسمـان هەڵـشکاوە.. ئەمانـە هەرچـەند کـەم و پەرتەوازەی کات وشوێن بن، هەر یەك کاروانن. مـەوکیبێکی پـیرۆزن و روویـان لـە خوایەو لەسەر ڕێبازی ئەون و بە هیدایەتی ئەو دەڕۆن..

**بڕیاری سێیەم**: ئەوەیە کە تاکی موسوڵمان لە هەر سەر زەمینێك بێت، یـان لـە هەر نەوەیەك بێت، بەهێزە بەهێز، گەورەیە گەورە، ئەو لەو درەختە پتـەوە بڵندەیـە، کە لق و پۆپی بۆ ئاسمان هەڵکشاوەو، رەگی بە ناخی سروشتی مرۆڤ وناخی مێـژووی مرۆڤایەتیدا رۆچووە، ئەو هەر لە کۆنەوە ئەندامێکی ئەو کاروانە بەڕێزەیـە، کـە بـە خواوە پەیوەستە و بەپێی هیدایەتی ئەو بـەڕێ کـەوتووە: (**أُولَـئِكَ الَّـذِينَ هَـدَى اللَّـهُ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ**) ٦ الانعام / ٩٠ واتە: ئەوانە (پێغەمبەران سـەلامی خوایـان لێ بێـت) ئەو کەسانەن، کە خوا ڕێنمایی کردوون و هیدایەتی داون دە تۆش لەسەر ڕێبازەکـەی ئەوان برۆ.. (**قُل لا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِنْ هُوَ إِلا ذِكْرَى لِلْعَالَمِينَ**) ٦ الانعـام / ٩٠ واتـە: بڵێ خۆ لەسەر ئەم ڕێنمایی کردنەتان من داوای کـرێ و پاداشـتان لێ ناکـەم! ئەمـە بیرەوەرە و بۆ هەموو جیهانیان هاتووە، تا خوا بناسن و بیپەرستن.. ئا ئەو پێـشەنگە بەڕێزانەی ئەم کاروانە پیرۆزەی ئیماندارییانیان لە خۆ گرتـووەو پێـشەوایەتی دەکـەن، ئەوانەن کە خوای گەورە هیدایـەتی داوون، ڕێـی نیـشان داون! ئـەو هیدایـەت دانـە خواییەش بۆ پێغەمبەری بەڕێزو شوێن کەوتوانی، بۆتە مایەی شـوێن کـەوتن! ئـەوی

ئەم لەسەری دەڕوات ئەو وەحیە خواییەیە، ئەو ڕێنماییە خواییەیە، ئەمە هەر ئەو هیدایەتەیە، کە خەڵکەکەی بۆ بانگهێشت دەکات و مژدەی قبووڵ بوونیان دەداتێ! بە هەمووبانگ کراوان دەفەرموێ: (لا أسْألُكُمْ عَلَيْهِ أجْرًا) داوای کرێتان لێ ناکەم! ئەمە پەیامی یاداوەریی خواییە: (إنْ هُوَ إلا ذِكْرَى لِلْعَالَمِينَ) ئەمە بیرەوەرییەکە بۆ هەموو جیهانیانە.. هەموو جیهانیان، نەك تایبەت بێت بە قەومێك بەرەگەزو توخمێك، یان بە کەسانی نزیك، یان دوور، ئەمە ڕێنمایی خوایە بۆیێر خستنەوەو یاداوەری هەموو خەڵکی، ئیتر پێویستی بە کرێ وەرگرتن لە کەس نیە.. چونکە خوای گەورە خۆی بە لوتفی خۆی کرێکەی گرتۆتە خۆی.. !

دواتر بەردەوام دەبێت و نارازی خۆی بەرامبەر ئەو کەسانە دەردەبڕێت، کە نکوولّی لە پێغەمبەرو پەیامی ئاسمانی دەکەن.. بەوەش ناوزەدیان دەکات، کە ئەوانە قەدری خوایان لا نیە، دانایی وبەزەیی ودادی خوا ئیستیعاب ناکەن ودرکی پێ ناکەن.. ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت، کە ئەم پەیامە خواییەی دوایین، هەر لەسەر ڕێسای پەیامەکانی تری پێش خۆی دەڕوات، ئەم کتێبە خواییەی دواییش، کە قورئانە ناوەڕۆکی کتێبە ئاسمانیەکانی پێش خۆی بە ڕاست دادەنێ و، لەگەڵ ڕەوتی کاروانە پیرۆزەکەی پێش خۆی، هاودیدو سۆزو سازاوە: (وَمَا قَدَرُواْ اللّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُواْ مَا أَنزَلَ اللّهُ عَلَى بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ قُلْ مَنْ أَنزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاء بِهِ مُوسَى نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُواْ أَنتُمْ وَلاَ آبَاؤُكُمْ قُلِ اللّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ. وَهَـذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ الْقُرَى وَمَنْ حَوْلَهَا وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِ وَهُمْ عَلَى صَلاَتِهِمْ يُحَافِظُونَ) ٦ الانعام / ٩١- ٩٢ واتە: وەکو کە دەبوو، ئەوان ڕێزی خوایان لا بوایە، نەبوو، چونکە دەیانووت خوا هیچ پەیامێکی بۆ کەس دانەبەزاندووە!! پێیان بڵێ: دەی کە وایە کێ ئەو کتێبەی بۆ موسا ناردووە، کە هەمووی هیدایەتی خوایی و ڕوناکی ڕێی خەڵکیە!؟ کەچی ئێوەش دێن بەش بەشی دەکەن و، خۆتان چیتان ویست، ئەوە نیشانی خەڵکەکە دەدەنەوە!! زۆرینەشی دەشارنەوە.. دیسان ئەوەشیان پێ بڵێرەوە، کە ئێوە خۆشتان و باب وباپیرتان زۆر شتتان، کە نەدەزانی

کێ فێری کردن؟! مەگەر خوای گەورە نەبوو، کە بە هـۆی پـەیامی خۆیـەوە فێـری دەکردن؟! لێشیان گەڕێ با ئەو دەمەوەریە بەتاڵەی خۆیان کاوێژ کەن! ئەم قورئانـە کتێبی پیرۆزی خوایەو، ئەو ناردویێتیە خوارەوە، کە راستی کتێبـەکانی پێـشووتری خوای گەورەی لەخۆگرتووەو دەسەلمێنێت، کە لە خواوە هاتوون، دیسان هۆشـداریی دەداتە دانیشتوانی مەککەو دەوروبەری وبـەرەو ئیـسلامیان بـانگ دەکـات، ئـەو کەسانەی باوەڕیان بە رۆژی دوایی هێنـاوە، بـاوەڕ بـەم پەیامـەش دێـنن، ئەوانـە ئەوانەن، کە نوێژەکانیان لە کاتی خۆیاندا دەکەن و راست پیادەی دەکەن..

موشریکەکان لە کەللە رەقی وهەڵوێست سەختی خۆیاندا بۆ دەمەوەری وقـسەو قسەلۆك دەیانووت: خوا هیچ نێرراوێکی خۆی لە مرۆڤ هەڵنەبژاردووەو، وەحـی بـۆ هیچ مرۆڤێك نەناردووە، کەچی هەر لەو لاتەنیشتەی خۆیانەوە جولەکەو مەسیحی دەژیان، بەوانیان وانەدەووت، نکوڵیان لـە پێغەمبـەرێتی پێغەمبـەرەکانی ئـەوان نـەدەکرد! تـەنها بەرامبـەر بـە پێغەمبـەری ئیـسلام محمـد (ﷺ) ئـاوا گەوجانـە دەوەستانەوە! بە جولەکەکانیان نەدەووت، کە تەورات لە خوای گەورەوە بۆ موسای ئێوە سەلامی خوای لێ بێت نەهاتووە، بۆیـە خـوای گـەورە قـسەکەی خۆیـان بـە چاویاندا دەداتەوە ئینجا پێیان دەفەرموێ: ئەدی ئەوە نیە کتێبی دیکە پێـشتر بـۆ موسا هاتوە.. جا لەبەر ئەم بێ ئەدەبیەیانە، کە دەفەرموێ: (وَمَـا قَـدَرُواْ اللّـهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُواْ مَا أَنزَلَ اللّهُ عَلَى بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ) واتە: وەکـو کـە دەبـوو، ئـەوان رێـزی خوایان لا نەبوو، چونکە دەیانووت خوا هیچ پەیامێکی بۆ کەس دانەبەزاندووە!!

ئەم قسانەی ئەهلی جاهیلییەتی عەرەبەکان، کە لەسەر دەمـی هـاتنی قورئانـدا دەیانووت، ئەهلی جاهلییەتی هەموو سەردەمێکی تر هەر دەیلێنـەوە.. دەقـی ئـەو بن، یان وەکو ئەو.. ئەوە نیە لەم زەمانەشـدا کەسـانی وا هـەن لاف وگـەزافی ئـەوە لێدەدەن، کە دین داڕێژراوی دەستی خودی مرۆڤەو، قۆنـاغ بـە قۆنـاغ لەگـەڵ دیـدو تێڕوانینی خەڵکی و بەرفراوانبوونی ئاسۆی بیرکردنەوەیاندا پەرەی سەندووە و ئەویش پێشکەوتووە.. چونکە نازانن جیاوازی نێوان ئیـسلام و ئـەو هـەموو بتپەرستیانەی

کۆن ونوێ چیە، کە لەگەڵ حەزو مەیلی دەسەڵاتداراندا، یان لەگەڵ هەواو هەوەسی شوێن کەوتوانیاندا بەرزو نزمیان دەکرد.. بەڵام بە تەئکید ئەوانە لە دەرەوەی دینی خوان.. دینی خوای گەورە وەکو، کە پێغەمبەرە پاکە سەرڕاستەکان لای خواوە هێناویانەو گەیاندوویانە خەڵکانێك وەکو خۆی وەریان گرتووەو، پێوەی پابەند بوون و زۆرینەش وەریان نەگرتووەو دژی وەستاونەتەوە، ئیتر لە مەدای نەوەکانی یەك بە دوای یەکی کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتیدا، دیندارەکانیش کزو کەم بوون، یان ئاگایی و شارەزاییان لە بنەمای دینەکە کەم بۆتەوەو سەر لە نوێ خەڵکەکە کەوتوونەتەوە شیرك و کوفرەوە، تا پێغەمبەرێکی تری بەڕێزیان بە بنەمای هاوبەش لەگەڵ هەمان دینی پێشوودا، کە راست بووە، بۆ هاتووە..

ئەم قسەیەی کۆنو نوێو، ئەم هەڵوێستەی جاهیلییەتی ئەمڕۆو دوێنێ، هەر وەکو یەکەو، هەموویان هەر، کە دەیکەنەوە هەر لەبەر ئەوەیە، کە رێزی خوایان لا نیە، چونکە نایناسن: ﴿وَمَا قَدَرُواْ اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُواْ مَا أَنـزَلَ اللَّـهُ عَلَـى بَشَرٍ مِّـن شَيْءٍ﴾ ن واتە: وەکو کە فەرز بوو قەدری بگرن، وا نەدەبوون، ئەوان رێزی خوایان لا نەبوو، چونکە دەیانووت خوا هیچ پەیامێکی بۆ کەس داناەبەزاندووە!! ئەو کەسەی، کە بەخشندەیی و بەزەیی و دادی خوایی نازانێت چیەو، درك بە هیچ لایەنێکی ناکات، دەڵێ: خوا مرۆڤ ناکاتە نێرراوی خۆی! ئەگەر بیەوێت پەیامێك بنێرێت، بە فریشتەیەکی خۆی دەکاتە پەیامنێرو پەیامەکەی خۆی پێدا دەنێرێت، نەك بە مرۆڤدا! چونکە بە دیدی تەنگی ئەوان و لە کورت بینی ئەقڵی خۆیانەوە پێیان وایە، کە خوایەکی کردگاری ئەم گەردوونە بەرفراوانە، خوای بەهێزو کارزان چۆن پەیامی خۆی بۆ ئەم مرۆڤە بچووك و نەزانە دەنێرێت؟! بۆ سەر ئەم زەمینەی، کە خۆی دەڵێی جێ پێی مێرووڵەیەو بەم گەردوونە گەورەوە دیار نیە!! فەیلەسووفی کۆن ونوێ لە بیری تەسك وگۆشە نیگای بچوکی خۆیان ولە کورتبینیی ژیرییانەوە دەیانووت: چۆن خوایەکی کردگارو هەڵسوڕێنەری سات بە ساتی ئەم گەردوونو ژیانە، بۆ ئەوەی مرۆڤ گومڕا نەبێت پەیامی خۆیان بۆ دەنێرێتە سەر زەویو

دەشیداتە دەست یەکێك لە خۆیان؟!! یان بە دەردی مارکسیە فەرماسۆنە بێ دینەکان دەڵێن: نا.. ئەم دینانە هەر بیرکردنەوەو پەی پێبردنو ڕاووبۆچوونی ئەو پێغەمبەرانە خۆیان بوون، کە کەسانی هەڵکەوتەی سەردەمانی خۆیان بوون!! یان پلان ونەخشەی دەوڵەمەندو دەسەڵاتدارانی سەردەمەکان بوون، تا ئاسانتر خەڵکیان بۆ مەیسەر بێت و بۆ بەرژەوەندی خۆیان بیانچەوسێننەوە..

ئەمانە هەمووی نەفامیە، هەمووی درك نەکردنە بە ڕێزی خوای گەورەو ئەو پلەوپایەی، کە دەبێت لە دڵ و ژیریی مرۆڤدا بەرامبەری هەبێت.. ئەمانە هەمووی قەدر نەزانینی خوای گەوردن، خوای بەڕێزو مەزنو دادپەروەرو بەبەزەیی‌و زاناو دانا لە خوای گەورە ناوەشێتەوە، کە ئەم مرۆڤەی دروستی کردووە هەر وا بەرەڵای کاتو لێی گەڕێت! خوای گەورە کە خۆی خەڵقی کردووە، هەموو نهێنی‌و ئاشکرایەکی ئەم مەخلوقە دەزانێت، پەی بە هەموو ئاتاجیەکانی دەبات، درکی هەموو ووزەو توانایەکی دیارو شاراوەی دەکات، دەزانێت کوێی هێزەو، کوێی لاوازیە، دەزانێت کەی یارمەتی دەوێت و چۆن؟!! دەزانێت بۆ پارسەنگ ڕاگرتنی پەیوەندی نێوان خۆیان، چیان پێویستەو دەبێت چۆن ئاڕاستە کرێن، دەبێ لەسەر چ سیاسەتو سیستمێك بڕۆن.. خوای کردگاری ئەم مرۆڤ و مرۆڤایەتیە چاك دەناسێت، ئیدی چۆن دەبێت دیدو تێڕوانینو بەرنامەی ژیان، مرۆڤەکان خۆیان دایڕێژن؟! خۆیان چوزانن خوا چۆن بناسنو بیپەرستن؟! خوای گەورە بۆ خۆی دەزانێت، کە چۆن دەبێت خوا بەم مرۆڤایەتیە بناسێنرێت، یاساو ڕێسای چۆنیان بۆ دابڕێژرێت.. دەبێ چی بڵێنو چی بکەن، چی نەڵێنو چی نەکەن.. چۆن هەڵسوکەوت کەن، تا لەگەڵ سیستمی هەموو گەردوونو ژیاندا یەك دەگرنەوە، چی نابێت بکەن، تا بەو سیستمی گەردوونە نەکێشرێنو موبتەلا نەبن.. خوای گەورە دەزانێت چیان بۆ باشەو چیان بۆ خراپە، چی‌و چەندو چۆن چاکیان دەکاتو، چی‌و چەندو چۆن ئینحیرافیان پێ دەکات، بۆچی‌و بەچی لاسەنگ دەبنو، چۆنو بۆچی بۆ یەکتریی دەبنە مایەی ئازارو ژانو ناسۆر.. خوا دەزانێ چی بکەن ڕاستە، چی

بکەن بەهەڵەدا دەچن.. کورت پوخت، خوای زانا دەزانێت چۆن ژیانی ئەم مرۆڤایەتیە دادەمەزرێت و، بە چی و چۆن ئاسودە دەبن..

خوای زاناو دانا دەزانێت، کە ئەو ژیرییەی لەم مرۆڤەیدا خوڵقاندووە، هی ئەوە نیە بە تەواوی پەی بە گەردوون وژیان وماهییەتی مرۆڤ ببات، چونکە ئەم ژیرییە نوقسانە، کەمبینە، کورت بینە، دەکەوێتە ژێر تین وفشاری حەزو ئارەزوو، یا پاڵنەری خوارو خێچ، یان تەماع و هەڵپە کردن، یان ترس و بیم و ئینفیعالەکانی تری داخی ناخ.. کورت وپوخت ژیریی ئەم مرۆڤە، هی ئەوە نیە روانگەی دیدی راست وبنەمای فیکری رەسەن و رێسای مەحکەمی سیاسەت دارێژێت.. ئەم مرۆڤەو نەقلیەتی، هی ئەوە نین چارەنوسی خۆیان ومرۆڤایەتی وگەردونیان بدرێتە دەست! هی ئەوەش نین وازیان لێ بهێنرێت، کە خۆیان بگەنە خواناسیو خواپەرستیو یاساورێسا دارشتن! چونکە دوایی دەکەونەوە ئەو نەفامێتیەی، کە خوای گەورە وەکو، کە پێویستە ناناسن و قەدری وەکو، کە پێویستە ناگرن. خوای گەورەو زاناو میهرەبان دەیزانی، کە دەبێ لە رێی پێغەمبەرەکانیەوە عەقیدەو پەرستن وشەریعەتیان بۆ بنێرێت..

خوای گەورە دەیزانی، کە ئەگەرچی سروشتی مرۆڤایەتی بە پاك دروست کردووە، بەڵام هی ئەوەش نیە کۆڵی لێبدرێت و فەرامۆش بکرێت، چونکە ئەویش وەکو ژیریی، دەکەوێتەوە ژێر تین و تەوژمی پاڵنەری لارێ بون و ئینحیراف.. تین و فشاری حەزو ترس، ئەویش لاسەنگ دەکات، مرۆڤەکان بە ساویلەکەیی خۆیان زوو فریوی نەفس و شەیتان دەخۆن، شەرخوازانی ئینس وجینن، زوو مرۆڤە سادەو دڵپاکەکان لە خشتە دەبەن، ئەمان، کە دڵپاکانە رەفتاریان لەگەڵدا بکەن، ئەوان چەواشەکارانە دەیانقۆزنەوە! سەرەنجام سەرمەقولات بە مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی گشتی دەدەن و فریووی دەدەن!! بێ ئەوەی هۆشیان لە خۆ بێت، ئەمان بەردو دۆزەخیان لێ دەخورن!

لەبەر ئەمانەو دەیان هۆی ترە، کە خوای میهرەبان و بەبەزەیی و بەخشندە، خوای کارزان و کارجوان و دانا، ئاراستەی مرۆڤایەتیەکەی لای خۆی هێشتۆتەوەدو،

بە پێغەمبەرانی هەڵبژێرراوی خۆیدا بە ڕێی وەحیەوە بۆی ناردوون.. نێرراوانی خۆی هەر لەو خەڵکە هەڵبژارد، پەیامی خۆیان لەبەرچاوی خۆیان بۆ نارد، تا لەسەر سروشتی پاکی خۆیان ڕایانگرن، تا شنەی ڕۆح و ئاسودەیی دەروون و چێژی جەستەیان، بە پارسەنگی دنیاو قیامەتیان پێ ببەخشێت.. تا ژیریی و پەی پێبردنیان ئاراستەی ئەو بوارانە، کات، کە مەیدانی خۆیانەو دەتوانن داهێنانی تێدا بکەن.. تا لە ڕووی جەستەو ڕۆحەوە، لە ژیانی دنیاو قیامەتیاندا پارسەنگ بن، تا ماهییەتی شتەکانی دەوروبەریان وەك خۆیان ببینین، تا لە ڕووی ژیرییانەوە تەندروست بن..

ئەمە لایقی لوتفی خوایە، نەك فەرامۆش کردنیان! ئەمە لە دادی خوای دانا دەوەشێتەوە، نەك بەرەڵا کردنیان.. ئەمە لە بەزەیی خوای بەخشندە دەوەشێتەوە، نەك پشت گوی خستن و وێڵ کردنیان! لە خوای گەورە ناوەشێتەوەشتێك دروست کات و پاشان هەقی بەسەریەوە نەمێنێت، لە دیدی دینیدا ڕای وا گێلانە جێی نابێتەوە!! چونکە خوای پەروەردگار قیامەتی داناوە، کە پاداشتی چاکەکارانی تێدا دەداتەوەو سزای تاوانبارانی تێدا دەدات، ئەوەش ئەوە دەخوازێت، کە هەر لەسەرەتاوە وەك دروستی کردوون ئاراستەی خۆیان بۆ بنێرێت، ئاراستەیان بە کەسانێکدا بۆ بنێرێت، کە ناسراوی کۆمەڵگەکانی خۆیان بن تا مژدەی ڕەزامەندی خواو بەهەشتیان بدەنێ و، هۆشیاری غەزەبی خواو دۆزەخیان بخەنە پێش چاو.. چونکە لەسەر هەڵوێستیان لەسەر حسێب دەکرێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولا﴾ ١٧ الاسراء / ١٥ واتە: تا نێرراو نەنێرین ئازاردەری کەس نابین..

ر

## بەندی شەشەم: ئەرکی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت)

پێغەمبەرانی بەڕێز سەلامی خوایان لێ بێت پەیامهێنەرن، مژدەدەرو هۆشدەری خواین، ئەمە کاریانە، ئەمە ئەرکی سەرەکیانە، ئەوان ئەم بانگەوازە دەگەێنن، ئەمما خەڵکی کێ وەدەنگیانەوە دێت، یا نایەت، ئەوە هەڵوێستی سەربەستانەی خۆیانە، ئەمان تەنها ئەوەندەیان لەسەرە، کە دینەکە روون کەنەوەو، ئەو خەڵکەش لەوە ئاگادار کەنەوە، کە هەر هەڵوێستێك لەو بانگەوازە خواییە بینوێنن، پاداشت یان سزای دوایی دەکەوێتە سەر.. خوای گەورە دەفەرموێ: (وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ فَمَنْ آمَنَ وَ أصلَحَ فَلَا خَوفٌ عَلَيهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ، والَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا يَمَسُّهُمُ الْعَذَابُ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ) ٦ الانعام / ٤٨- ٤٩ واتە: ئێمە هەر پێغەمبەرو نێرراوێك بنێرین، هەربە مژدەدەرو هۆشدەریان دەنێرین، هەرکەس باوەڕی هێناو کەوتە چاکەخوازیی، ئیدی ئەوە نەترسی دەمێنێت نە خەمو پەژارە. ئەو کەسانەش، کە نیشانەو پەیامی ئێمەیان بە درۆخستۆتەوە سەرەنجامی ئەو لاڕێبوونەیان، سزایان بەردەکەوێت!!

ئەم دینە مرۆڤایەتی بەرەو ئاستێکی کامڵ بوونی ژیریێتی بەرز دەکاتەوە، وای ئامادە دەکات، کە ئەم ئامێرە بەڕێزو بەنرخەی خوا پێی داوە لە ڕێی ناسینی حەقدا بخاتە کار، بەوەی سەرنجی ژیرانە بداتە ئەو بەڵگەو نیشانانەی، کە خوای کردگار لە خودی مرۆڤ و ژیان وگەردووندا نیشانی دەدات، بۆ ئەوەی لە بونەوەر بکۆڵێتەوەو پەی بە نهێنیەکانی ببات، کە قورئان بۆ ڕێنیشاندانی ئەم مرۆڤە بەو ئاراستەدا، هاتووە..

ئەمەش ئەوەی دەخواست، کە مرۆڤایەتی لە قۆناغی نیشاندانی موعجیزەی ماددی بەرچاویانەوە، کە پێچەوانەی ڕێساکانی بوون وگەردوون، بوون بگوێزرێنەوە بۆ قۆناغی تر، لە قۆناغی رابوردوودا، دەبوو بە زۆر ملیان پێ کەچ کرێت، دەبوو

بە موعجیزەی نائاسا، قەناعەتیان پێ بکرێت، کە پێغەمبەران نێرراوی خوای تاك‌و پاکن! تا ئەوەندە نکوڵی نەکەن‌و گوێڕایەڵی بۆ پەیامی خوایی دەربڕن، بەڵام لە قۆناغی هاتنە خواردوەی قورئاندا، دەبوو ژیرێتیان بخرێتە کار، دەبوو بە دواندنی ئەقڵیان بگەێنرێنە پەی بردن بە حەقیقەتی گەردوون‌و دروستکراوانی، بە حەقیقەتی وەحی‌و پێغەمبەرایەتی‌و پەیامی خوایی.. ئەمیشیان هەر موعجیزە بوو، بەڵام موعجیزەیەکی بەردەوامی هەمیشەیی، لە هەمان کاتیشدا بەرنامەی دیدو تێڕوانینێکە، کە هەموو ژیانی هەموو مرۆڤایەتی لە هەموو کات‌و شوێنێکدا لەسەر دادەمەزرێت!

بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی لەم قۆناغە نوێیەیدا پەی بەو حەقیقەتانە ببات، دەبوو خوای گەورە کتێبێکی تریان بۆ بنێرێتە خوارێ، کە لە هەموو لایەنێکیەوە موعجیزە بێت، تا ئەوەی مرۆڤایەتی، هەموو کات وشوێنێك دەستەوستان لەبەردەستیدا راوەستن، بە بەڵگەی ژیرێتیەك بیاندوێنێت، کە خۆیان پێی رازین، تا ئازادانە بیانگەێنێتە قەناعەتی ئەوەی، کە ئەم پەیامە موعجیزەیە، نەك هەر لەلایەنی دارشتنیەوە، بەڵکو لە رووی بەرنامەرێژییەوە، لە رووی ئاراستەکردن‌و پەروەردەکردنیەوە، لە رووی پێکەوەنانی کیانێکی کۆمەڵایەتی‌و بزاڤێکی گۆڕانکاریی کۆمەڵگەوە، کە وەکو کۆئەندامانی یەك جەستە، کۆمەڵگەو دەسەڵاتێکی سیاسی وا پێك بێنن، کە هاوشێوەی نەبێت!

ئەم کۆمەڵکاری وئامانج و رێبازە، پەروەردە کردنێکی رەسەن وپشوودرێژی دەخواست، ئاراستەی بەردەوامی شەووڕۆژانەی دەخواست، دەبوو ئەم گۆڕانکاریەی لە واقیعەکەدا دروست ببێت، چونکە پێشتر لە دیدو تێڕوانیندا دروست بووبوو.. دەبوو ئەم مرۆڤایەتیە زۆر هێدیانە بەرەو ئەو ئاسۆیە هەڵکشێت.. سەرەتای ئەوەش راست خوێندنەوەی مرۆڤ و ژیان وگەردوونە، پەی بردنە بە بەرفراوانی ئەم سێ جیهانە (مرۆڤ و ژیان وگەردوون).. جا بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی تووشی گومڕایی فیکریی ودەردەسەری دەروونی وخەستەیی جەستە نەبێت، دەبوو ئاراستەی خوایی بێتە خوارێ، تا یەك یەك ماهیەتی ئەو سێ روکنە لە سیفاتی خۆیانەوە بە

مرۆڤایەتی بناسێنێت، نەك لە دیدی پێشتری خۆیانەوە، نەك لە روانگەیەکی فەلسەفی ماندووکەری ئیغریقیەوە، یان لە دیدێکی مەسیحیەوانانەوە، کە دۆزینەوەی وەسف و پێناسەی شت، دەڵێی مەتەڵە! یان لە رێی دیدو تێڕوانینی هەستەوەرێکی ماددی هیندۆسی، یان میسری، یان بودایی، یان مەجووسی ئەو سەردەمەوە.. بەدەر لەوشێوە سادەو ساویلکەش، کە بەسەر دیدو تێڕوانینی عەرەبەکاندا زاڵ بووبوو!!

لایەك لەو پەیام و ئاڕاستەیە بریتی بوو لە زانینی ئەرکی پێغەمبەران و حەقیقەتی ئەو رۆڵەی، کە دەبێت لە بزاڤێکی کۆمەڵکاریدا بۆ گۆڕانکاریی کۆمەڵگەکە ببینن، بەو شێوەیەی، کە ئەو دوو ئایەتەی سەرەوە روونی دەکەنەوە..

پێغەمبەران مرۆڤن، وەکو هەر مرۆڤێکی تری ئەو خەڵکە، بەڵام خوای گەورە بۆ ئەوەی ناردووە، تا مژدەو هۆشداری (تبشير و انذار) بداتە خەڵکی، لێرەدا کۆتایی بە ئەرکی پێغەمبەرە بەڕێزەکە دێت، ئینجا رۆڵی قەدەری خوایی دێت لە هیدایەت دانی خەڵکەکە، کە کێ وبۆچی وەدەنگ بانگەوازی ئەو پێغەمبەرەوە هات، یان نایەت، پاداشتی خواییش بۆ ئەو کەسانە دەبێت، کە وەدەنگ بانگەوازەکەوە هاتوون پێوەی پابەند بوون، ئەوی باوەڕی هێناوەو خوای ناسیووەو پەرستوێتی وبە شەریعەتەکەیەوە پابەند بووە، هیچ خەمێکی نیەو چارەنوسی مسۆگەرە، لەوە ناترسێت، کە لە داهاتوودا دێت! خەفەت بۆ رابوردووی ناخوات وخەمی داهاتووشی نیە! ئەو کردارە بەدانەی کردوونی، رابوردن، ئەوە مادام تۆبەی لێ کردوون و وازی لێ هێناون، خوای گەورە بە بەزەیی خۆی بۆی سڕیوەتەوە، ئەو کردارانەش کە چاکەن، ئەوە خوای گەورە بە لوتفی خۆی پاداشتی دەداتەوە.. ئەوی باوەڕی نەهێناوەو پێغەمبەرەکەی بەدرۆ خستۆتەوە، ئەوە حەتمەن بە هۆی کافربوونەکەیەوە وەبەر سزای سەخت و بەژان دەکەوێت! نابینیت خوای گەورە دەفەرموێ: (بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ) لەبەر ئەو خراپانەی کە ئەنجامیان دەدا.. ئەمە شێوەی قورئانە، کە سەرپێچیەکان بە زاراوەی شیرك و کوفرو زوڵم و فسق ناو دەبات..

دیـدو تێـڕوانین و پێناسـەو وەسـفێکی ئاسـان وسـادەیە، راسـت و ڕاسـتەو پێچاوپێچی تێدا نیە، هیچ لوغزێکی لەخۆ نـەگرتووە.. ناسـاندنی پێغەمبـەران و ئاشکرا کردنی کـارو ئەرکیانـە، بـە راشـکاوی دیـاری کردنـی پلـەو ڕۆڵیانـە لـە ماهییەت وبەرپرسێتی ئەم دینەدا.

لەم دیدو تێڕوانینەدا، تەنها خوای گەورە مافی خوایـەتی هەیـە، هـەموو کـارو روداوێك بۆ وویستی ئـەو دەگەڕێتـەوە، بـەڵام ئـازادی مرۆڤـەکان لـە وەرگـرتن و وەرنەگرتنی دینەکەدا والآیە و، خەڵکی سەربەسـتن بـەم ئاڕاسـتەدا دەڕۆن یـان نـا، تەنها ئەوەیە، کە خوای گەورە بـەم پەیامـەی خـۆی ولەسـەر زمـانی پێغەمبـەرە هەڵبژاردە بەڕێزەکانی سەلامی خوایـان لێ بێـت، پاشـەڕۆژی موسـوڵمان وکـافری خستۆتە بەرچاوان.

ئەم دیدو تێڕوانینە هەرچی دیدو تێڕوانینی وێڵ و هەڵەو پەڵە هەیە خـستوێتیە کەنار، هەرچی باوەڕی لارو وێرو ئەفسانەی پووچەڵ هەیە کەشـفی کـردووەو، ئـەو درۆو دەلەسانەی فەزح کردووە، کە لە ناو کۆمەڵگەی جاهیلییـدا دەربـارەی خـواو پێغەمبـەران و وەحـی هـەبوو، ئـەوەی لـە کۆمەڵگـەی جاهیلییـەتی یەکـەمجاری عەرەبەکاندا هەبوو، یان ئەوەی لـە هـەموو جاهیلییـەتێکی پـێش و پـاش ئـەوان هەبووەو هەیە..

ئیسلام بەم قورئانە، کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ئـاوا بـەرەو قۆنـاغی پـەی بردنـی ژیرێتی هێنا، بـێ ئـەوەی بیخاتـە کەنـدەلآن وبێـشەلآنی لاهـووتی وتێکـچڕژانی شەڕەقـسەی فەلـسەفەوە، ئـەوی تەمـەن ووزەی هـەزاران بیرمەنـدی لـە نـەوە جیاوازەکانی مرۆڤایەتیدا بە هەدەردا.

دەروونی هەموو مرۆڤێك (هی پێغەمبەرانیش) حەز دەکات زوو ئەم بانگـەوازە سەرخات، حەز دەکات موعجیزەیەك لەسەر راستی ئەم دینە نیـشان ئـەو خەڵکـە بدرێت، تا ز ووتر واز لەو کەللەڕەقی وهەڵوێـستە نەفامیـەی خۆیـان بهێـنن وزوو وەدەنگی ئەم بانگەوازەوە بێن و باوەڕی پێ بهێنن، بەڵام ئەوە شتێك نیە لەدەست

کەسدا بێت، ئەوە ماف و دەسەڵاتی خوای کردگارەو بەس: (وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَنْ يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلا بِإِذْنِ اللهِ) هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیە نیشانەیەك (موعجیزە) بهێنێت، مەگەر بە مۆڵەتو ڕێپێدانی خوای گەورە.. خوای پەروەردگار، کە ئەو نیشانە موعجیزەیان زوو زوو ناخاتە بەردەست، دەیەوێت پێغەمبەرە ئازیزەکانی فێرە سەبر کات، بە ئارامو پشوو درێژیان پەروەردە کات، دەیەوێت ئەوان خۆیان لەسەر کاری دوورمەدا رابهێنن، بۆیە پێشیان دەفەرموێت: ئێوە هەقی ئەنجامی کارتان نەبێت، ئێوە کاری سەرەکی خۆتان ڕوونکردنەوەی دینەکەیە، ئەمما موعجیزەو کاتی نیشاندانی لێگەڕێن بۆ خوای کارزانو کارجوان، ئەو دەزانێت نیشاندانی موعجیزە کەی و بەرامبەر بە کێبێت زەروریە نیشان بدرێت..

دیسان خوای گەورە دەیەوێت، کە خەڵکەکەش ماهییەتی خوایەتی و سروشتی بانگەوازی خوایی بزانن، لەوە دڵنیابن، کە پێغەمبەرانو نێرراوانی خوای گەورە، هەر مرۆڤی وەکو ئەمانن، خوای کارجوان لە ناو خۆیاندا هەڵیبژاردوونو ئەو کارو ئەرکەی پێ سپاردوون، ئەوان فەرمانبەری خواینو بۆیان نیەو ناتوانن و، هەوڵیش نادەن ئەو سنورە ببەزێنن، کە خوای گەورە بۆی دیاری کردوون..

# بەندی یەکەم: مەسەلەیەکی دژوارو ڕوون

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصتَ بِمُؤْمِنِينَ) ١٢ یوسف/ ١٠٣ واتە: هەرچەند سووریش بیت لەسەر بانگهێشت کردنی خەلکی، بەلام زۆرینەیان هەر موسولمان نابن.. هەروەها دەفەرموێ: (وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللّهِ إِلا وَهُم مُّشْرِكُونَ) ١٢ یوسف/ ١٠٦ واتە: زۆرینەیان وا باوەڕ بە خوا دێنن، کە هاوەلیشی تێدا بۆ خوا بڕیار دەدەن!! تەنانەت ئەوانەش، کە باوەڕیان هێناوە شیرکێکیان لە شێوەیەك لە شێوەکانیدا خزاندۆتە ناو باوەڕەکەیانەوە!

باوەڕی ڕاستەقینە وورياییەکی زۆری دەوێت، ئاودێرییەکی بەردەوامی دەوێت، کە بە پالفتەکراوی وپاراوی بیهێلێتەوە.. چاودێریەکی وای دەوێت، کە چاوی لێ نەتروکێنێت، نەبادا شەیتان تێی خزێت وتێیدا بتروکێت! پاسەوانێتیەکی وای دەوێت، کە لە ناکاودا هەواو هەوەس یان ئارەزوو، یان تەفرەدانێکی دنیایی دزە نەکاتە ناوی، تا بە تەواوی بۆ خوا ساغ بووبێتەوەو هەروایش بەردەوام بۆ خوای بەئاگا بمێنێتەوە..

ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (أَنَا أغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ، مَنْ عَمِلَ عَمَلاً أشْرَكَ مَعِي فِيهِ غَيْرِي، تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ)[١] واتە: من لە هەموو کەسێك بێ نیازترم بە هاوەڵ و هاوبەش، هەر کەسێك کارێك لەبەر خاتری من بکات و هاوەلێکی تێدا هاوبەش کات خۆی و شیرکەکەی واز لێ دێنم و، خۆی و شیرکەکەی دەدەمەوە دەست هاوەڵەکەی!

هەر ئەو خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (إِنَّ أَوّلَ الناسِ يُقْضَى يَومَ القيامَةِ عَليهِ رَجُلٌ اُسْتُشْهِدَ. فأتِي بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعْمَتَهُ فَعَرَفَهَا، قالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيها؟ قالَ: قاتَلْتُ فِيكَ حَتى اسْتُشْهِدْتُ. قالَ: كَذَبْتَ! وَلَكنَكَ قاتَلْتَ لأنْ يُقالَ جَرِيٌ، فَقَدْ قِيلَ. ثُم أُمَرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وجْهِهِ حتى أُلْقِيَ في النارِ، وَرَجُلٌ تَعلَّمَ العِلْمَ وَعَلَّمَهُ وَقَرأَ

---

[١] ئیمامی موسلم لە الزهد والرقائق (٢٩٨٥).

الْقُرْآنَ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: تَعَلَّمْتُ الْعِلْمَ وَعَلَّمْتُهُ وَقَرَأْتُ فِيكَ الْقُرْآنَ قَالَ اللهُ تَعَالَى: كَذَبْتَ وَلَكِنَّكَ قَرَأْتَ لِأَنْ يُقَالَ: قَارِيءٌ تَعَلَّمْتَ الْعِلْمَ لِيُقَالَ عَالِمٌ وَقَرَأْتَ الْقُرْآنَ لِيُقَالَ قَارِئٌ فَقَدْ قِيلَ ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ. وَرَجُلٌ وَسَّعَ اللهُ عَلَيهِ وَأَعْطَاهُ مِنْ أَصْنَافِ الْمَالِ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: مَا تَرَكْتُ مِنْ سَبِيلٍ تُحِبَّ أَنْ يُنْفَقَ فِيهَا إِلَّا أَنْفَقْتُ فِيهَا لَكَ قَالَ كَذَبْتَ وَلَكِنَّكَ فَعَلْتَ لِيُقَالَ جَوادٌ فَقَدْ قِيلَ ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ)[1] رواه مسلم. واتە: یەکەمین کەسێك، کە لە رۆژی دواییدا داوەری دەکرێت، کابرایەکە، کە شەهید بووە. دەهێنرێتەوە خزمەت خوای پەروەردگار. ئەویش نیعمەتەکانی خۆی دەخاتەوە بیری، ئەمیش هەموویان دەناسێتەوەو ئیعتیرافیان پێ دەکات. ئینجا خوای پەروەردگار لێی دەپرسێت، کە چیت بەم نیعمەتانە کرد؟ دەڵێت: خوایە، تا شەهید بووم لە پێناوی تۆدا جیهادم کرد. خوای گەورە دەفەرموێ درۆت کرد! بۆیە دەجەنگایت، تا پێت بڵێن ئازاو قارەمانە! ئەوا وتیان.. پاشان فەرمانی بۆ دەردەچێت بە راکێشان لەسەر روو رایدەکێشن، تا فرێی دەدەنە نێو ئاگری دۆزەخەوە..

هەروەها کابرایەکە، کە زانستی شەرعی فێر بووەو قورئان خوێن بووە، ئەویش دەهێننە پێشەوەو خوای گەورە نیعمەتەکانی خۆی دەخاتەوە بیر، ئەمیش هەموویانی وەبیر دێتەوەو ئیعتیرافیان پێ دەکات، دوایی خوای گەورە لێی دەپرسێت: دەی چیت لەم نیعمەتانەی من کرد؟ ئەویش دەڵێ: خوایە زانستی فێربووم وخەڵکیشم فێرکردو لە پێناوی جەنابتدا قورئانم خوێندووە، خوای گەورە پێی دەفەرموێ: درۆت کرد بۆیە زانستیت دەخوێند، تا پێت بڵێن زانایە (مەلایە، شەرعناسە) قورئانیشت بۆیە دەخوێند، تا پێت بڵێن قورئان خوێنە (یان دەنگی خۆشە) ئەوا وتیان! پاشان فەرمانی بۆ دەردەچێت بە راکێشان لەسەر ڕوو رایدەکێشن، تا فرێی دەدەنە نێو ئاگری دۆزەخەوە..

---

[1] ئیمامی ئەحمەدو موسلیم و نەسائی ریوایەتیان کردووە لە موسلیمدا ژمارە (٩٠٥) یە.

هەروەها کابرایەکی تر، کە خوای گەورە رزق و رۆزی زۆری پێ بەخشیبوو، جۆرەها سەروەت و سامان و ماڵی پێدابوو، ئەویش دەهێنرێتە پێشەوەو خوای پەروەردگار نیعمەتەکانی خۆی دەخاتەوە بیر، ئەمیش هەموویانی وەبیر دێتەوەو ئیعتیرافیان پێ دەکات، دوایی خوای گەورە لێی دەپرسێت: دەی چیت لەم نیعمەتانەی من کرد؟ ئەویش دەڵێ: خوایە، بوارێکی کاری خێر نەما، کە جەنابت حەزت پێی بووبێت ئیللا لەبەر خاتری جەنابت پارەیەکم تێدا خەرج کرد! خوای گەورە دەفەرموێ: درۆت کرد، ئەمانەت بۆیە دەکرد، تا پێت بڵێن سەخیە، خێرەومەندە! ئەوا ووترا!! پاشان فەرمانی بۆ دەردەچێت بە راکێشان لەسەر روو رایدەکێشن، تا فرێی دەدەنە نێو ئاگری دۆزەخەوە..

بەڵێ باوەڕی ساغ و پاك جیددیەتی وا دەخوازێت، دەبێت ئەوەی تێدا بەڵگە نەوویست بێت، کە نابێت بە هیچ شێوەیەك هیچی بۆ غەیری خوای گەورە تێدا بێت، نابێت هیچ هەست و نەست و ختوورەیەکی بۆ غەیری خوا تێدا بێت، نەبادا چەکەرە بکات! هەر وەکو، کە نابێت هیچ رەفتارو هەڵسوکەوتێك لەبەر خاتری غەیری خوا بکرێت! دیسان هەروەکو، کە نابێت هیچ پەرستنێك بۆ غەیری خوا ئەنجام بدرێت. باوەڕی پتەوی بۆ خوا سوڵحاو ئەم بۆخواساغ بوونەوەیە دەخوازێت. نابێت هیچ شتێکی دنیایی لە دڵدا بمێنێت! دەبێت دوا کەلێنی هەست ونەستی بۆ خوا پڕ بووبنەوە

خوای گەورە کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللَّهِ إِلا وَهُم مُّشْرِكُونَ﴾ ١٢ یوسف/ ١٠٦ واتە: زۆرینەیان وا باوەڕ بە خوا دێنن، کە هاوەڵیشی تێدا بۆ خوا بڕیار دەدەن!! لەبەر ئەوەی، کە ئەوانە بە نەفامی، یان بە هەوەسخوازیی بەهایەکی دنیاییان زۆر لا بە نرخ بووەو، گەیاندویانەتە ریزی بەها پیرۆزەکانی خوابەیەکناسین!

لەوانەیە لە دیدو تێڕوانینیاندا وایان چووبێتە مێشکەوە،کە هۆکارێکی تری غەیری وویستی خوای گەورە، کاری لە رووداودا هەیە، یان لە هەبوون و نەبوونی کەس و روداوو خودی هۆکاردا هەیە!!

یان لەوانەیە وایان لە مێشك چەسپی بێت، کە هۆکاری تر هەیە غەیری خوای پەروەردگار، کە کارتێکردنی لەسەر زیانبەخشین، یان سوودگەیاندن هەبێت!

یان لە هیواو ئاواتیاندا ئومێدێکیان بە غەیری خوای خاوەن دەسەڵات بووبێت!

یان لەوانەیە قوربانیەکیان بۆ غەیری خوا کردبێت! یان پەرستنێکیان لە ناخیاندا، یان بە زمان یان بە کردەوە بۆ غەیری خوا ئەنجام دابێت!!

یان لەوەدا تووشی شیرك بوون، کە پێیان وا بووە دەشێت تەسلیم بەیاساو ڕێسای تری غەیری خوای کردگار بن، کە فەرمانی پێچەوانەی شەریعەتی خوای دەرکردووە!

یان لەوانەیە لە جیهاددا شەریکیان لە نیەتیاندا بۆ خوای تاك و پاك بڕیار دابێت! یان پێیان وابووبێت، کە بە هێزێکی تری غەیری خوای گەورە دەتوانرێت سەرکەوتن بە دەست بهێنرێت، یان نوشوستی و شکستی دوور بخرێتەوە!!

یان لە خودی نوێژو ڕۆژوو پەرستنەکاندا شیرکیان لا دروست بووە!!

لە هەر مەیدان و جۆرێکی شیرکدا بووبێت، هەرچەند شاراوە بێت هەر دژوارە، چونکە شیرك کردەوە پووچەڵ دەکاتەوە. بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (لَلشِّرْكُ فِيكُمْ أَخْفَى مِنْ دَبِيبِ النَّمْلِ) بوخاری لە(ادب المفرد)واتە: شیرك لە جێ پێی مێروولە لێتان شاراوەترە! فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر هەن کە شێوازو جۆری شیرك و پەنهانیەکانی روون دەکەنەوە، هەندێك لەوانە:

- عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێت گێڕایەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللهِ فَقَدْ كَفَرَ او أَشْرَكَ)[1] ترمزی. واتە: هەر کەسێك بە غەیری خوای گەورە سوێند بخوات، کوفری کردووە، یان شیرکی بڕیار داوە..
- ئیبنو مەسعود خوا لێی ڕازی بێت گێڕایەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (إنَّ الرُّقِىَ والتَّمَائِمَ شِرْكٌ)[2] ئیمامی ئەحمەدو ئەبوداوود. واتە: نوشتەو دوعا شیرکن[3]..

---

[1] الترمذي له النذور والإيمان، باب: ما جاء في كراهية الحلف بغير الله (١٥٣٥)، والحاكم له المستدرك (٤/٣٣٠)، والبيهقي له الكبرى (١٠/٢٩)، الترمذي فەرموویەتی: "حسن صحيح"، وصححه الحاكم على شرط الشيخين، والألباني له صحيح الترغيب (٢٩٥٢).

[2] لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێ: (إنَّ الرُّقِىَ والتَّمَائِمَ والتِّوَلَةَ شِرْكٌ) واتە نوشتەو دوعاو متفەرك و ئەو دەزوو داوەی بۆ لەرزو تا دەیکەنە مەچەك هەموویان شیرکن..

[3] ئەمە ئەو نوشتەو دوعایانە ناگرێتەوە، کە ئایەت و حەدیسیان تیدایە. ئەمەیان بیدعەیە، بەڵکو ئەو هەڵەق و مەڵەقانەی جادووکەرەکان دەیکەن مەبەست لەوەیەو بۆنوشتە بۆ کراوەکەش ئەوەیە، کە هەموو ئیعتیقاداتێکی وای لێ هاتبێت، کە ئەو نوشتەو موتفەرکە چاکی دەکەنەوە!! ئەمەیان شیرکە.. والله اعلم..

- ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ، مَنْ عَمِلَ عَمَلاً أَشْرَكَ مَعِي فِيهِ غَيْرِي، تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ)[١] موسلیم واتە: من لە هەموو کەسێك بێ نیازترم بە هاوەڵو هاوبەش، هەر کەسێك کارێك لەبەر خاتری من بکاتو هاوەڵێکی تێدا هاوبەش کات، خۆیو شیرکەکەی واز لێ دێنمو لا ناکەم بە لایانەوە.

- ئەبو سەعیدی خودری لە ئەبو فوزاڵەوە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (إِذَا جَمَعَ اللهُ الأَوَّلِينَ والآخِرِينَ لِيومِ الْقِيامَةِ لِيَومٍ لا رَيْبَ فِيهِ نَادَى مُنَادٍ مَنْ كَانَ أَشْرَكَ فِي عَمَلِهِ لِلَّهِ أَحَداً فَلْيَطْلُبْ ثَوَابَهُ مِنْ عِنْدِهِ فَإِنَّ اللهَ أَغْنَى الشُّرَكاءِ عَنِ الشِّرْكِ)[٢] ئیمامی ئەحمەد واتە: ئەو کاتەی خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا مرۆڤەکانی سەردەمانی یەکەمو ئەوانەی سەردەمانی کۆتایی دنیا کۆدەکاتەوە، یەکێك بانگ لەو خەڵکە دەکات: ئەرێ ئەوەی کارێکی کردووەو شەریکی تێدا بۆ خوا بڕیارداوە، با بڕوا پاداشتەکەی لە شەریکەکەی وەرگرێتەوە! چونکە خوا بێ نیازە لە شەریکایەتی و، پێویستی بە هاوبەشی هیچ هاوبەشێك نیە..

- ئیمامی ئەحمەد بە سەنەدیەوە لە محمدی کوڕی لەبیدەوە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَيكُمْ الشِّرْكُ الأَصغَرُ) قالوا: ومَا الشِّرْكُ الأَصغَرُ يا رسُولَ اللهِ؟ قالَ: الرياءُ، يَقُولُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ لَهُمْ يَومَ الْقِيامَةِ إذ جَـزَى النَّاسَ بِأَعْمَالِهِمْ اذهَبُوا إِلَى الذينَ كُنْتُمْ تُرَاؤنَ فِي الدُّنيا فَانْظُرُوا هَلْ تَجِدُونَ عِنْدَهُمْ

---

[١] ئیمامی موسلم لە الزهد والرقائق (٢٩٨٥).

[٢] وعن أبي سعيد بن أبي فضالة وكان من الصحابة قال سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (إذا جمَعَ اللهُ الأوَّلِينَ والآخِرِينَ لِيومِ الْقِيامَةِ لِيَومٍ لا رَيْبَ فِيهِ نَادَى مُنَادٍ مَنْ كَانَ أَشْرَكَ فِي عَمَلِهِ لِلَّهِ أَحَداً فَلْيَطْلُبْ ثَوَابَهُ مِنْ عِنْدِهِ فَإِنَّ اللهَ أَغْنَى الشُّرَكاءِ عَنِ الشِّرْكِ) رواه الترمذي في التفسير من جامعه وابن ماجه وابن حبان في صحيحه والبيهقي وغيرهم وصححه الألباني في صحيح سنن الترمذي..

جَزَاءً)[١]، واتە: ئەوەی، کە زۆر لێی دەترسم تووشتان ببێت شیرکی گچکەیە! ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا شیرکی گچکە چیە؟! فەرمووی: ریابازیی.. خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا، کە پاداشتی خەڵکی دەداتەوە بەوانەی شیرکیان کردووە دەفەرموێ: برۆن بۆ لای ئەوانەی لە دنیادا کردبووتاننە هاوەڵی من، بزانن داخۆ هیچ پاداشتێکتان لایان دەسدەکەوێت؟!!

ئا ئەمە شیرکی شاراوەیە، کە هەمیشە دەبێت دڵی مرۆڤی موسوڵمان لێی بە ئاگا بێت و لێی غافڵ نەبێت، نەبادا کاریگەریی لەسەر باوەڕەکەی دروست کات..

جۆرێکی تری شیرکی راشکاوو ئاشکرا هەیە، کە ئەویش بریتیە لە ملکەچ نەبوونو گوێرایەڵی نەکردنی پەیام و شەریعەتەکەی خوای گەورە.. بەوەی کە دینەکەی نەکرێتە بەرنامەی ژیان!! بەوەی، کە خەڵکانێك داوەری خۆیان لە ناکۆکیدا نەبەنەوە لای یاساو رێساکانی ئەو، ئەمەش هیچ گومانێکی تێدا نیە، کە شیرکە.. ئەمە خۆ تەسلیم نەکردنە بە دینی خوا، جا ئیتر بە لادانی شەریعەتەکەی بێت، یان بە هێنانی بۆنەی جەژن و مەراسیمی کۆمەڵایەتی تر! یان بە پۆشینی بەرگو پۆشاکێکی وا، کە داپۆشینی شەرعی پێ نایاتە ئەنجام! کە پێچەوانەی شەرعی خوا دەوەستێتەوە، کە فەرمانی بە داپۆشینی ئەو ئەندامانە داوەو ئەم پێی حەڵاڵە دایاننەپۆشێت!! ئەمەش شیرکە.. ئەمە گوناح کردن نیە، ئەمە تاوانێك نیەو کرا بێت، ئا ئەمەیان سنوربەزاندنی یاساو رێسایە! ئەمەیان

---

[١] توێژینەوەی حەدیسەکە بەم شێوەیە: عن محمود بن لبيد أن رسول الله قال (إن أخوف ما أخاف عليكم الشرك الأصغر)، قالوا: وما الشرك الأصغر يارسول الله؟ قال: (الرياء، يقول الله عز وجل لهم يوم القيامة إذا جزى الناس بأعمالهم اذهبوا إلى الذين كنتم تراؤن في الدنيا فانظروا هل تجدون عندهم جزاء). أخرجه أحمد (٥/ ٤٢٨ و٤٢٩) واللفظ له، والبيهقي في شعب الإيمان (٥/٣٣٣)، والبغوي في شرح السنة (١٤/٣٢٤) وقال المنذري في الترغيب (١/٦٩): "إسناده جيد"، وقال الهيثمي في المجمع (١٠/٢٢٢: "رجاله رجال الصحيح غير عبد الله بن شبيب بن خالد وهو ثقة"، وقال ابن حجر في بلوغ المرام (ص ٣٠٢): "أخرجه أحمد بإسناد حسن"، وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب (٣٢)..

لادانی فەرمانێکی شەرعیە بۆ نەریتێکی جاهیلی، کە مـرۆڤ هێناویەتـە کایـەوە، ئەمە لادانی فەرمانەکەی خوایە بـۆ بەرژەوەنـدی مرۆڤێـك، کـە خۆشـی بەنـدەی خوایە!! ئەمەیان لە خانەی گوناحدا نەماوەو چۆتە خانەی شیرکەوە، چـونکە بۆتـە نیشانەی ئەوە، کە خاوەنەکەی بەرنامەیەکی تری گرتۆتە بـەر، کـە دژی دینەکـەی خوای گەورەیە، لەم لایەنەوەیە، کە کارێکی زۆر دژوارە..

با کۆمەڵێك حەدیس لەسەر دژواری شیرك بهێنینەوە، پاشان دێینەوە سەر ئەم خاڵە:

- لەبەر دژواری ئەو شیرکەو پەنهانێتیەکەیەتی، کە پێغەمبەری نـازدار (ﷺ) لـە دوعـاکانیدا دەیفەرموو: (اللَهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ أنْ أشْرِكَ بِكَ وأنا أعْلَمُ وأسْتَغْفِرُكَ لِمَـا لا أعْلَـمُ)[1] واتـە: خوایـە پـەنا دەگـرم بـە جـەنابت لـەوەی، کـە بـە زانینـەوە شەریکێکت بۆ بڕیار بدەم و، داوای لێبوردنیشت لێ دەکەم لـەوەی، کـە بـەبێ ئاگایی کەوتبمەوە ناویەوە.. شیرکی گەورە ناکەوێتە بازنـەی لێبـوردنی خـوای گەورەوە، وەکو کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (إنَّ اللَّـهَ لا يَغْفِـرُ أن يُـشْرَكَ بِـهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء) ٤ النساء /٤٨ واتە: خوای گەورە خۆش نابێت، کە شیرکی بۆ بڕیار بدرێت، بەڵام لەو گوناهانەی لەو کەمترە خۆش دەبێت، بۆ هەر کەسێك، کە خۆی حەز بکات..
- ئیبنو مەسعود خوا لێی رازی بێت دەفـەرموێ لـە پێغەمبـەرم (ﷺ) پرسـی چ گوناحێك زۆر گەورەیە؟ فەرمووی: (أنْ تَجْعَلَ لله نِداً وَهُوَ خَلَقَـكَ)[2] واتـە: ئـەوەی کە شەریکێك بۆ خوا دانێیت، کە ئەو خۆی دروستی کردوویت!
- ئەو حەدیسەی، کە لە ریوایەتی ئیبنو عەبباسدایە خوا لێیـان رازی بـێ، کـە دەفەرموێ: (قالَ رسولُ اللهِ (ﷺ): (إذا حَلَفَ أحَدُكُمْ فَلَا يَقُلْ: مَا شَاءَ اللهُ وَشِـئْتَ،

---

[1] أخرجه أحمد من حديث أبي بكر برقم ١٨٧٨١، وهو في مسند ابي يعلى (٦٢/١) من حديث ابي بكر ولفظه (اللهم إني أعوذ بك أن أشرك بك وأنا أعلم وأستغفرك لما لا أعلم) وفي الأدب المفرد (برقم: ٢٥٠) للبخاري إلا ان حديث ابي بكر ضعيف. وفيه ليث بن ابي سليم. وفي اسناده ضعف.

[2] البخاري (٤٢٠٧)، مسلم (٨٦) عن عبد الله بن مسعود.

وَلكِنْ لِيَقُلْ: مَا شَاء اللهُ ثُمَّ شِئْتَ)[1] واتــە: ئەگــەر یــەکێکتان ســوێندی خــوارد نەڵێ: ئەگەر تۆو خوا حەز کەن، با بڵێت: ئەگەر خوا حەز کـات، پاشـان تـۆ حەز کەیت[2]..

- عن أبي هُرَيرَةَ رضِيَ اللهُ عنهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (إجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَـاتِ: الشِّرْكُ باللهِ، والسِّحْرِ، وقَتْلِ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ إلَّا بالْحَقِّ، وأكْلِ الرِّبَـا، وأكْـلِ مَـالِ الْيَتِيمِ، والتَّوَلِّي يَومَ الزَّحْفِ، وَقَذْفِ الْمُحْصنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ الغَـافِلاتِ)[3] متفـق عليـه. واتە: توخنی حەوت گوناحە پەڵەکارەکە نەکەون: شەریك بۆ خوا دانان، سـیحر، کوشتنی مرۆڤ، کە خوا حەرامی کردووە مەگەر لەسـەر هـەق، سـوو خـواردن، خواردنی سامان و ماڵی هەتیو، هەڵاتن لەبەرەی جەنگ لەکاتەکانی ڕووبـەڕوو بوونەوەدا، تۆمەتبارکردنی ئافرەتی موسوڵمانی بێ ئاگا بە داوێن پیسیی..
- ترمزی وئەحمەدو حاکم گێڕاویانەتـەوە، کـە عوبـادە شـەددادی کـوڕی ئەوسـی بینیبوو خوا لێی ڕازی بێت لە مزگەوت دەگریا، لێی پرسیبوو بۆچی دەگریت " فەرمووی: لەبەر حەدیـسێکە، کە لە پێغەمبەرمـەوە (ﷺ) بیـستووە، ئـەویش ئەوکاتە بوو، کە بینیم پێغەمبەر (ﷺ) مـاتو مەلوولـە، لـێم پرسـی دایـكو باوکم بە قوربانت بن چیە وا بە پەژارەوە دەتبینم؟ فەرمووی: (أمْرَاً أتَخَوَّفَهُ عَلَى أُمَّتِي مِنْ بَعْدِي) قُلْتُ: مَا هُوَ يَا رسولَ الله ؟ قَالَ: (الشِّرْكُ والشَّهْوَةُ الخَفِيَّةُ ) قُلْتُ: يَـا رسُولَ الله !وَتُشْرِكُ أُمَّتُكَ مِنْ بَعْدِكَ؟ قَالَ: (يَا شَدَّادُ أمَّا إنَّهُـمْ لَـا يَعْبُـدُونَ شَمْـسَاً ولا قَمَراً ولا حَجَراً ولا وَثَنَاً ولكِنَّهُمْ يُرَاؤونَ بِأعمَالِهِمْ ) قُلْتُ: وَالرِّيَاءُ شِرْكٌ هُوَ؟ قَالَ: (نَعَم) قُلْتُ: فَمَا الشَّـهْوَةُ الخَفِيَّةُ ؟ قَالَ: (يَصـبَحُ أحدُهُمْ صائِمَاً فَتُعْرَضُ لَـهُ شَـهَواتُ الـدُّنْيا

---

[1] أخرجه ابن ماجة في الكفارات، باب: النهيَ أن يقول: ما شاء الله وشئت (٢١١٧)، وقال الألبـاني في الـصحيحة (١٠٩٣): "إسناده حسن"، وذكر له شواهد أخرى بأرقام (١٣٦، ١٣٧، ١٣٩).

[2] ئەوانەی کوردیش جائیز نیە، کە دەڵێن: هەموو هیوایەکم تۆو خـوای گەورەیـە!! یـان، کـە دەڵـێن: پشتم بە تۆو خوا بەستووە!! یان وا ئەو کورەم سپارد بە خواو تۆ!! نابێت، جائیز نیـە، هـەر دەبێـت بڵێ: هەموو هیوایەکم خوای گەورەیە پاشان تۆیە.. دەبێت وشەی پاشـان بخاتـە نێـوان نـاوی خـوای گەورەو ئەو کەسەوە..

[3] البخاري (٣/١٠١٧ ژمارە ٦٦٧٥) و مسلم (١/٩٢ ژمارە ٨٩).

فَيَفطُرَ) واتە: شتێك هەیە، كە دەترسم دوای خۆم ئوممەتەكەمی تێ كەوێت! ووتم: چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: شیركو حەزە پەنهانەكە.. ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا چما ئوممەتەكەت دوای خۆت شیرك بۆ خوا بڕیار دەدات؟! فەرمووی: شەدداد! خۆ وایان لێ نایەت بچن خۆرو مانگو بەردو دار بپەرستن، بەڵام كە كار دەكەن بۆ ئەوەیە بوترێت كردوویانە! (كاریان بە ریابازی دەكەنو بەوەش دەكەونە ناو شیركەكەوە)! ووتم: چما ریا شیركە؟ فەرمووی: بەڵێ، ووتم: ئەدی حەزە پەنهانەكە چیە؟ فەرمووی: یەكیان بەرۆژوو دەبێت لە كاتی رۆژوەوانێتیەكەیدا لەزەتو حەزێكی دنیایی بۆ دێتە پێش، یەكسەر رۆژووەكەی بۆ دەشكێنێت!![1]..

موسوڵمان هەر لە سەرەتاوە لەبەر ئەوەی باوەڕی بە خوای تاك و پاك هێناوە، كە هەر ئەو كردگارەو، هەر ئەویش خاوەنەو، هەر ئەویش مافی ئەوەی هەیە یاساو رێسا بۆ بەندەكانی دابڕێژێت.. دیسان لەبەر ئەوەی هەر لە سەرەتاوە باوەڕی بەوە هێناوە، كە هەرچی بە وەحی بۆ محمد (ﷺ) هاتووە فەرمایشتی خوای گەورەیەو حەقە، ئەوی ئەم نێرراوە بەڕێزەی خوای لەسەر بووە، رێبازی خوایەو بەرنامەی ژیانە، كەوابوو هەر دیدو تێڕوانین و هەر یاساو رێسایەكی سیاسی، یان كۆمەڵایەتی، یان ئابوری، هەروەها هەر بەرنامەو رێبازێكی تری غەیری ئەم دینو شەرعە لای موسوڵمان رەفزەو، هەر لەسەرەتاوە كەناری دەداتو دژیشی دەوەستێتەوە، چونكە دژایەتی ئەو پەیامە دەكاتەوە، كە خوای گەورە پێی رازی بووە، كە ببێتە بەرنامەی بەندە پیاوچاكەكانی.. لەم روانگەشەوەیە، كە هەر جۆرە ئیعتیرافێك بە دیدو دینێكی تر، یان بە بەرنامەیەكی تر، یان بە یاساو رێسایەكی تر، یان بە دەسەڵاتێكی تری سیاسی، یان كۆمەڵایەتی، یان ئابووری، كوفرەو هەڵگەڕانەوەیە لەو دینەی، كە خوای گەورە بە محمد الموستەفادا (ﷺ) ناردویێتی و، ئەویش بەو راشكاویە روونی كردۆتەوە!!

---

[1] ئەمردین ئەو دین لاوازیەمان لە ساڵانی پێش حەفتاكاندا بینی! دراوسێیەكمان كوڕە مەلا بوو، لە رەمەزاندا بەرۆژوو بوو، فلیمی هیندی لە سینەما نیشی دەكرد، رۆژووەكەی شكاندو چوو بۆ سینەما!!

لەم ڕوانگەوەیە، کە ئیسلام تەنها دینی خوای گەورەیەو دەبێت مرۆڤایەتی لە هەموو لایەنەکانی ژیانی خۆیاندا تەسلیمی بن..

ئیمامی ئەحمەدی کوڕی نەسری مرووزی لە کتێبی (الصلاة) دکەی خۆیدا ریوایەتێکی هێناوەتەوە، کە لە قودامەوە دەگێڕێتەوە، کە گوتویەتی وەکیع بۆی گێڕاینەوە، کە ئەبو جەعفەری ڕازی لە ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە، ئەویش لە ئەبول عەتاهیەوە گێڕاویێتیەوە، کە گوتویەتی: کاتێك ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە: (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوا أَعْمَالَكُمْ**) **٤٧ محمد / ٣٣** واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ملکەچ و گوێڕایەڵی خوای گەورە بن و، ملکەچ و گوێڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بن و کارو کردەوەکانتان پوچەڵ نەکەنەوەو بە فیڕۆی نەدەن.. لەبەر ئەوەی لەگەڵ هەبوونی شیرکدا، کردەوەی چاکە نرخی نیە، یاوەران لەوە ترسان، کە بە گوناح کردن کردەوەکانیان پوچەڵ ببێتەوە!

لە ڕێی عبداللەی کوڕی موبارەکەوە، لە ئیبنو عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە، کە گوتویەتی: ئێمەی یاوەرانی پێغەمبەر (ﷺ) وامان دەزانی هەموو چاکەیەك لای خوای گەورە قبووڵە، تا ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوا أَعْمَالَكُمْ**) واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ملکەچ و گوێڕایەڵی خوای گەورە بن و، ملکەچ و گوێڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بن و کارو کردەوەکانتان پوچەڵ نەکەنەوەو بە فیڕۆی نەدەن.. دوای ئەوە وتمان ئەوی کارو کردەوەکانمان پوچەڵ دەکاتەوە چیە؟! وتمان: دیارە گوناحە گەورەکانن، ئیتر ئەو ئایەتەی تر هاتە خوارەوە کە دەفەرموێت: (**إِنَّ اللَّهَ لا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاءُ**) **٤ النساء/ ٤٨** واتە: خوای گەورە لەوە خۆش نابێت، کە شیرکی بۆ بڕیار بدرێت، بەڵام لەو گوناهانەی لەو کەمترە، بۆ هەر کەسێك، کە خۆی حەز بکات خۆش دەبێت.. ئیتر وازمان لە قسەی پێشوومان هێنا، بەڵام هەر خەمی ئەو کەسانەمان بوو، کە گوناحی گەورەیان ئەنجام دەدا، ئومێدی زۆریشمان هەبوو بۆ ئەوانەی نەکەوتوونەتە گوناحی گەورەوە!!

# بەندی دووەم: سەرچاوەی لێوەرگرتن

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوَاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقًا مِّنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ كَافِرِينَ. وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَى عَلَيْكُمْ آيَاتُ اللّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُ وَمَن يَعْتَصِم بِاللّهِ فَقَدْ هُدِيَ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ) ٣ ال عمران / ١٠٠ - ١٠١ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر ملکەچی و گوێڕایەڵی بۆ هەندێك لەو کەسانە دەربڕن، کە بە خاوەن پەیامی ئاسمانی حسێبن، لە دینەکە پاش باوەڕهێنانتان پاشگەزتان دەکەنەوە. جا ئێوە چۆن پێتان قبوڵە کە کافر ببنەوە لە کاتێکدا، کە ئایەتی قورئانتان بەردەوام بە وەحی بۆ دێتە خوارەوەو نێرراوەکەی خواشتان لە ناودایە ئەوە بزانن، کە هەر کەسێك پەنابەخوا بگرێت وبە راستی دەست بە دینەکەی خواوە بگرێت، ئەو کەسە بەرەو پەیامی راستی خوایی رێنمایی کراوە..

دوای باوەڕهێنانو هیدایەت وەرگرتنی خوایی، هیچ شتێك موسوڵمان وا نارەحەت ناکات وەکو ئەوەی، کە خۆی ببینێتەوە وا بەرەو جاهیلییەت گەڕاوەتەوەو، دوای ئیسلامەتی و دینداریيەکەی بەرەو کوفر چۆتەوە! چونکە دڵنیایە لەوەی، کە ئەمە دوای دۆزینەوەی رێی بەهەشت و رووتێکردنی، رێ بزر بوون وبەرەو دۆزەخ چوونە، دوای ئەوەی لێی قوتار بووبوو! ئەمە هەڵوێستی هەموو موسوڵمانێکی سەر راستە لە هەموو کات وشوێنێکدا. بۆیە ئەم هۆشدانو ئینزارە قورئانیە بە درێژایی نەوەکانی ئیسلامەتی، قامچیەك بووەو ویژدانی پێ داخ کراوە! هاوارێك بووەو بەردەوام ویژدانی راچڵەکانداووەو زیتی کردۆتەوە. ئای چ کردەوەیەکی ناقۆڵایە، کە موسوڵمان دوای باوەڕ هێنان ودینداریی کافر ببێتەوە؟! بە تایبەتی بۆ ئەو کەسانەی، کە ئایاتی قورئانی خوای گەورە دەبینن ودەبیستنو دەیخوێنێتەوە، یان بۆی دەخوێننەوە! ئەم پاشگەزبوونەوە دزێوە چیە لە کاتێکدا، کە زەمینەی باوەڕو پاڵنەریی دینداریی لەبەرچاوە؟! لە کاتێکدا کە بانگەوازدکەی

خوا بەردەوامەو بە گوێی خەڵکیدا دەدرێت؟! لە کاتێکدا کە دو ریبانەکەی کوفرو ئیمان رۆشن کراونەتەوەو بە روونی نیشان دراون و دیارن؟!

بەڵێ.. بە دڵنیاییەوە پاشگەز بوونەوەی موسوڵمان لە ئیسلامەتیەکەی و، گەڕانەوەی بۆ کوفر، شتێکی ناقۆڵایە، تاوانێکی گەورەیە، بە تایبەتی لە بارودۆخێکدا، کە هەمووی یارمەتیدەری باوەڕ هێنان وپابەندی دینداریە.. باشە راستە وا خوای پەروەردگار پێغەمبەرە نازدارەکەی (ﷺ) بۆ لای خۆی بردۆتەوەو کۆچی دوایی کردووە، بەڵام خۆ ئایەتەکانی قورئان ولەبەر دەستدان، خۆ فەرموودەو سیرەتی ئەو لەبەر چاون، ئەمڕۆ لەم سەردەمەی ژیانمدا روویان لە ئێمەشە، ئێمەش هەر وەکو خەڵکی سەردەمی هاتنە خوارەوەی وەحیەکە بەم قورئانە دەدوێنرێین، ئێمەشی بۆ بانگهێشت دەکرێین، رێی خواوویستیەکە ئەمڕۆش دیارە، رۆشنە، ئاڵاکەی خواناسی بڵندەو دەبینرێت ودەناسرێتەوە، ئەمڕۆش دیارە، کە هەر کەسێك پەنا بە خوا بگرێت وبە راستی دەست بە دینەکەی خواوە بگرێت، ئەو کەسە بەرەو پەیامی راستی خوایی رێنمایی کراوە.. بەڵێ.. ئەوەی ئەمڕۆش پەنا بە خواگرتن ودەستگرتنە بە دینەکەی خواوە، خوای گەورەش زیندووەو ماوە..

پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) خۆی و یاوەرە بەرێزەکانی خوا لێیان رازی بێت، لە مەسەلەی وەرگرتنی ئەم عەقیدەو بەرنامەو پێوە پابەندبوونیاندا زۆر توند بون، لە هەمان کاتیشدا رێ بە رایان دەدرا، یان بە ئاڵوگۆڕی ئەو دیدو بۆچوونەی لە ئەزموونی ژیانی کردەوەییانەوە فێری بووبوون دەدرا، لەوانەدا، کە پەیوەندیان بە سەرچاوەی دین وتەعلیماتەکەیەوە نەبوو، لەو مەیدانانەدا، کە بە رەوتی بانگە کۆمەڵایەتیەکەوە پەیوەست نەبوو، یان بەو بنەمایانەوە نەبەسترابوونەوە، کە ژیانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لەسەر رێك دەخرێت.. جیاوازی نێوان ئەم دوو هەڵوێست و رەفتارە زۆرە.. ئەو ئیسلامەی بۆ ئەوە هاتووە، تا پێشەوایەتی ژیانی ژیان بە بەرنامەی خوا بکات، هەر ئەو ئیسلامەشە، کە ژیریی هان دەدات، تا زیاتر بکەوێتە گەڕو زانیاری زیاتر پەیداکات و، چاك سوود لە رێساکانی هەبوون بکات

بۆ باشتر چەسپاندنی دینەکەو بەختەوەری زیاتری مرۆڤایەتی ڕاست ڕەفتاریان لەگەڵدا بکات..

ئیمامی ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ: عبدالرزاق لە سوفیانەوەو ئەویش لە جابرەوە گێڕایەوە، کە ئیمامی شەعبی لە عبداللەی کوڕی سابیتەوە گێڕاویتیەوە، کە جارێك عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێت هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا، برایەکی جولەکەی بەنی قورەیزەم ڕاسپاردبوو، کە هەندێك تەورات باسی تەوراتم بۆ بنوسێتەوەو بۆم بهێنێت، وا بۆی هێناوم، پیشانتانی بدەم؟! عبداللەی کوڕی سابیت دەڵێ: دەم و چاوی پیرۆزی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر گۆڕا! بۆیە خێرا بە عومەرم ووت: مەگەر نابینیت دەم و چاوی پێغەمبەر (ﷺ) چەند گۆڕا؟ عومەر (یەکسەر بە دەنگی بەرز) فەرمووی: بە پەروەردگار ڕازیم خوام بێت، بە ئیسلامەتی ڕازیم دینم بێت، بە موحەممەد (ﷺ) ڕازیم پێغەمبەرم بێت، ئیدی ڕووی پێغەمبەر (ﷺ) خۆش بووەوەو بە هەموانی فەرموو: (**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَو أَصبَحَ مُوسى ـ عليه السلام ـ ثُمَّ اتَّبَعْتُمُوهُ وَتَرَكْتُمُونِي لَضَلَلْتُمْ، إِنَّكُمْ حَظِي مِنْ الامَمِ، وانَا حَظُكُمْ مِنْ النَّبِيِّنَ**)[1] واتە: بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر موسا سەلامی خوای لێ بێت بێتەوەو شوێن ئەو بکەون و واز لە من بهێنن، گومڕا دەبن، ئێوە بەشە خەڵکی منن، منیش پشکی ئێوەم لە ناو پێغەمبەراندا.

حافز ئەبو یەعلا دەڵێ: حەماد لە شەعبیەوە، ئەویش لە جابرەوە گێڕایەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (**لا تَسْأَلُوا أَهْلَ الكِتابِ، فَإِنَّهُمْ لَنْ يَهْدُوكُمْ وَقَدْ أَضَلُّوا**

[1] أخرجه الإمام احمد ٣/٣٨٧ والدارمي ١/١١٥، وابن أبي شيبة ح٢٦٤٢١، وابن عبد البر في جامع بيان العلم ٢/٤٢، والبزار وأبو يعلى والبيهقي في شعب الإيمان. قال الحافظ ابن حجر في الفتح ١٣/٣٣٤: "رجاله موثقون إلا أن في مجالد ضعفاً". وبمثله قاله الهيثمي في المجمع ١/١٧٩. قال الشيخ الألباني: وفيه مجالد بن سعيد وفيه ضعف، ولكن الحديث حسن عندي لأنه له طرقاً كثيرة عند اللالكاني والهروي وغيرهما. (انظر: المشكاة ح١٧٧. والإرواء ٦/٣٤ ح١٥٨٩).

أنْفُسَهُمْ. فتُكَذِّبوا بحَقٍ أو تُصدِّقُوا بِبَاطِلٍ، وَانَّهُ،وَاللهِ لَوكَانَ مُوسى حَيَّاً بَيْنَ أظْهُرِكُمْ مَا حَلَّ لَهُ إلَّا أنْ يَتَّبِعَنِي)[1] واتە: پرسیار لە ئەهلی کیتاب مەکەن، چونکە ئەوان، کە خۆیان گومڕان، ناتوانن ڕێی ڕاستتان نیشان دەن، کە لێتان پرسین، یان ئەوەیە هەقێك بە ناهەق بە درۆ دەخەنەوە، یان ناهەقیەك بە ڕاست دەزانن، سوێند بە خوا، گەر موسا زیندوو بوایەو لە ناوتاندابوایە، بۆی نەبوو، هەر دەبوو شوێن من کەوێت..

لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێ: (لَو كَانَ موسى وعيسى حَيَّيْنِ لَمَا وَسَعَهُمَا إلَّا اتِّبَاعِي)[2] واتە: ئەگەر موساو عیسا زیندوو بوونایە، هەردەبایە شوێن من کەون..

ئەوە ئەهلی کیتابە، ئەوە ڕێبازی پێغەمبەرە (ﷺ)، ئەوەش هەڵوێستی پێغەمبەرە (ﷺ) لە وەرگرتنی دیدو بۆچوونی ئەهلی کیتاب! ئیدی لە عەقیدەو روکنی باوەڕ بێت، یان لە بەرنامەو شەریعەت..

بە پێی ئاراستەی ئیسلام هیچ بەربەستێك لە ڕێی سوود وەرگرتنو ئاڵوگۆڕی راوبۆچوون نیە لە زانستو زانیاریو، چەسپاندنو پراکتیزەکردنی تیۆرو دیدێکی زانستیانە، لەوانەی سوودی مرۆڤایەتی تێدایە، نەك ئاڵوگۆڕی بنەمای عەقائیدی.. تەنانەت لە ڕەدو بەدەلی زانستەکانیشدا، دەبێ موسوڵمان هۆشی لەوە بێت، کە دەبێت ئەویش لە چوارچێوەی دینەکەیدا بێت، دەبێت ئەویش پەیوەست ببێتەوە بە بەرنامەکەی خواوە، لەو لایەنەیەوە، کە کارێکی باشە، کە خوای گەورە بۆ ئاسانکاریی ژیانی خەڵکی لەبەر دەستیاندا دەستەبەری کردووە، ئەمانیش دەتوانن لە بەرژەوەندی خەڵکیدا بەکاری بهێننەوە، مادام هۆکارێکە بۆ ئاسوودەیی مرۆڤایەتی، بۆ ژیانێکی بەختەوەریی بۆ بەگەڕ خستنی خێروبێری ژیانو زەمین، لە پێناوی ڕێزی مرۆڤایەتیدا.. ئەمە شتێکی چاکەو نیعمەتێکی تری خوای گەورەیە، کە پێویستە سوپاسی خوای گەورەی لەسەر بکرێت، پێویستە

---

[1] أخرجه ابن عبد البر في جامع بيان العلم ٢/٤١، وقال الحافظ ابن حجر: أخرجه عبدالرزاق من طريق حريث بن ظهير فذكره، وأخرجه سفيان الثوري من هذا الوجه، وسنده حسن. (انظر: فتح الباري ٦/٣٢٤)

[2] رواه احمد بروانه: تفسير ابن كثير (١/٣٧٩).

خوای لەسەر بپەرستریت، چونکە ڕێنمایی ئەم سەرکەوتنەی کردوون.. بەلام وەرگرتنی دیدو تێڕوانین و بۆچوون و پێناسە، ئەمانەی پەیوندیان بە باوەڕەوە هەیە، بە لێکدانەوەی ژیان و گەردوون و مرۆڤەوە هەیە، یان بە هەبوونی مرۆڤەوە هەیە لە سەر زەوی، یان پەیوەندیان بە خودی بەرنامەکەوە هەیە، بە سیستم و یاساو ڕێسای ڕێکخستنیەوە، یان بە پێناسەی خێرو شەڕی ڕەفتارو ڕەوشتەوە، ئەمانە هەمووی هەر دەبێت لە دینەکەی خواوە وەرگیرێن و بەس، لە هیچ یەکێك لەمانەدا، نابێت و ناشێت موسولمان لە غەیری دینەکەیەوە وەریگرێت، لەبەر ئەمەشە، کە دەبینینت ڕووی پێغەمبەری نازدار (ﷺ)، کە سادەترین هەلوێستی لە یەکێك لە شوێن کەوتووەکانی بینی، ئاوا گۆڕا، دواتریش وای لەسەر ئەوانو ئومەتەکەش گەورە کرد، کە هەموو ئەوەیان لا ببێتە بەلگەنەوویست، کە سەرچاوەی دیکەو لێوەرگرتنی وا لەو جۆرە مەیدانانەی ئاراستەو پەروەردەدا، هەلوێستێکە حەتمەن بەرەو کوفریان دەبات..

ئەمەیە ئاراستەی خوای گەورە، ئەوەشە ڕێبازو هەلوێستی پێغەمبەر (ﷺ)، کەچی ئێمەیەك، کە لافی ئیسلامەتی وموسولمان بوون لێدەدەین، دەبینین تەنانەت لە تێگەیشتنی قورئان وحەدیسەکەشدا لە ڕۆژهەلاتناسانەوە وەردەگرین!! یان لە قوتابیەکانیانەوە!! نابینیت دیدی فەلسەفیو تێڕوانینمان دەربارەی ژیانو گەردوونو مرۆڤ لەوانەوە وەردەگرین؟! کە دەشزانین ئەوان کێنو ئەو دیدو لێکدانەوانەیان لە کوێوە هێناوە!! مەگەر لە فەیلەسووفو بیرمەندەکانی ئیغریقو ڕۆمانی کۆنو ئەورووپاو ئەمریکای سەردەمیانەوە نەهێناوە؟!

دەبینیت سیستمی ڕێکخستنی ژیان و یاساو ڕێساکانمان، هەمووی لەو سەرچاوە پیسانەوە هاتووە! دەبینیت دابو نەریتو ڕەفتارو ڕەوشتمان لەو زەلکاوەوە هەلهێنجاوە!! ئەو زۆنگاوەی، کە ڕۆژئاوا دوای ئەوەی دینی ڕاستی لا نەما، تێی کەوت.. ئینجا سەرباری ئەوەش هەر سوورین لەسەر ئەوەی، کە موسولمانینو زۆر دینداریشین! بە ڕاستی ئەمە درۆیەکە گوناحەکەی زۆر گەورەترو قورسترە لە گوناحی

کـوفری ڕەق و زەق! ئەمــە مانــای شــایەتیدانمان لەســەر ئــەوەی، کــە ئیــسلامەتی سەرنەکەوتووەو پوکاوەتەوە، چـونکە ناتوانێـت کـەسمان بگۆڕێـت! ئەمــە بەراسـتی شایەتیەکی ئەوەندە درۆیە، کە کەسانێك خۆیان بـە موسـوڵمان بـزانن، نـەك وەکـو ئێمەومانان لافی ئیسلامەتی لێ دەدەن، شایەتی وا تاوانکارانە نادەن..

ئیسلام بەرنامەیە، بەرنامەیەکە سیفاتی تایبەتی خۆی هەیە، چ لەلایەنی دیدو تێڕوانینی عەقائیدیەوە، چ لەلایەنی یاساو ڕێسایەوە، کە هەموو چالاکیەکی ژیـان ڕێك دەخات، چ لەلایەنی ڕەفتارو ڕەوشتەوە، کـە هـەموو پەیوەندیـەکانی لەسـەر دادەمەزرێنێت، لە ئیسلامدا ئەستەمە لایەنی ڕەفتارو ڕەوشت سیاسـی بـن، یـان ئابووری، یان کۆمەڵایەتی لەو بنەما ڕەوشتیە گشتیانە جویێ ببنەوە.. ئیسلام بـەم جیهانبینیەوەیە، کە بۆتە ئەو بەرنامەیەی، کە دەبێت سەرکردایەتی هـەر هـەموو مرۆڤایەتی پێ بسپێررێت..

بۆ چەسپاندن وپراکتیزە کردنی ئەم بەرنامەیە، حەتمەن دەبێ کۆمەڵـە خـەڵکێك بێنە پێشەوەو پێشەوایەتی کۆمەڵگەکە بەم بەرنامەیەوە بکەن.. ئەوەی لـە بزاڤـی ئەم کۆمەڵە مەنهەجیەشدا دەبێتـە بەڵگەنەویـست ئەوەیـە، کـە ئەسـتەمە ئـەم کۆمەڵـە دینـدارە، هــیچ ئاڕاسـتەیەك لــە غــەیری بەرنامەکـەی خۆیانــەوە، کـە خواوویستیە وەربگرن..

ئەم بەرنامەیە کاتێك، کە بۆ مرۆڤایەتی هات، هەر بۆ ئاسوودە کردنـی هـات، مۆچیارو داعی وکەسانی ئیسلامی ئەمڕۆو سبەییش، هەر بۆ چەسـپاندنەوەی ئـەم بەرنامەیە دێنەوە کایە، بگرە پابەندی ئەمڕۆ بەم بەرنامەیەوە پێویـستترە، چـونکە ئـەوەتا مرۆڤایـەتی دەبینرێـت، کـە چ موعانــات وکارەسـاتێکی لـە دووری ئـەم بەرنامەیەدا بەسەردا دەچەسپێنرێت؟! قوتار کردنی ئەم کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لەو هەموو تەنگژەی تێـی کـەوتووە، مەحاڵـە بـە غــەیری بەرنامەکـەی خـوا.. ئـەو بەرنامەیەش دەبێت هەر بەو سیفات ومۆرك وسیمایەوە بخرێتـەوە بەردەسـت، کـە هەیەتی، تا بتوانێت جارێکی تر ڕۆڵی خۆی ببینێتەوەو قوتاری بکاتەوە..

مرۆڤایەتی لە بواری دەستەبەر کردنی هێزە گەردوونیەکان بۆ بەرژەوەندی خۆی، سەرکەوتنی باشی بە دەست هێناوە، لە بواری پیشەسازیدا باش چۆتە پێش، لە بواری پزیشکیدا ئەوەی پێی گەیشتووە، ئەگەر بەراورد بکرێت بەوەی لە کۆندا هەبوو، ئەمەی ئێستا بە موعجیزە دادەنرێت، بەردەوامیشەو بەرەو لوتکەی سەرکەوتنی تر دەچێت! بەڵام کاریگەریی ئەم هەموو پێشبردووییە لە ژیانی خودی مرۆڤایەتیەکەدا چەند بووە؟! چەندی لە ژیانی دەروونیدا پێ بەخشیوە؟ ئایا ئەم هەموو پێشکەوتنە، ئاسودەیی پێ بەخشی؟ دڵنیایی دایێ؟ ئاشتی بۆ فەراهەم هێنا؟! نەخێر.. بەڵکو کارەساتی زیاتری هاتە ڕێ! دەردەسەری، کوێرەوەریی، نەحەوانەوە!! خەم و ترسو دڵەڕاوکێی ڕۆژانەی تاکو گەلو دەوڵەتان!! نەخۆشیە دەروونیە وێرانکاریەکان لە زیادبووندان! نامۆیی ڕەوشت و تاوانکاریی زۆرتر تەشەنەیان کردووە!! لە رووی ڕوونکردنەوەی ئامانج لە هەبوونی مرۆڤ و گەردونو ژیانەوە، هیچ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی ڕاستی بۆ مرۆڤایەتی بە ڕاستی نەخستۆتە پێش! ئێستا ئەم پیاوە شارستانێتیەی سەردەم، نازانێت ئامانج لەم ژیانەی سەر زەمین چیە؟! لەگەڵ کەشف بوونی ڕۆژانەی نهێنیەکانی گەردوون و بزاوتی چرکەیی ژیاندا، نازانێت مەبەست لە هاتنە ژیانی خودی مرۆڤ چییە؟!!

ئەو دیدو تێڕوانینو پێناسەو لێکدانەوەیەی ئەم شارستانێتیەی سەردەم بۆ مرۆڤو ژیانو گەردوونی دەکات، لەچاو ئەوەی ئیسلامدا، نەك هەر لە دیدی زارۆکیش ناچێت، بەڵکو زۆریان هەر لەعنەت و نەگبەتی مرۆڤایەتین! زۆرینەی زۆریان وا لە ئاستی ڕێزی مرۆڤ کەم دەکەنەوە، کە پلەو پایەو هۆی هەبوونو خەلق کردنەکەی دەبێت بە ژێرەوە، دادەخزێتە کەندەڵانی دژواری بێ ئامانەوە، ئیتر لەوێدا بایەخدانەکانی بچووك دەبنەوە، شەوقو گەشەی بڵندبوونەوەی دەپووکێتەوە، سەرقاڵیو هانا بەتاڵیو بێ هۆشیەکەی دڵەڕاوکێی زیاتر دەکات! ماندوێتی زیاتر دەبێت، وێڵیو بزربوونی ئاڵۆزتر دەبێت.. مادام هەر دەڕواو بێ ناسینی خوا هەنگاو هەڵدێنێتەوە هەروا دەمێنێتەوە!! مادام کوێرەو تابلۆ خواییەکانی ڕێ

نابینیت و، گوێ بە بینین‌و خوێندنەوەیان نادات، هەر وا کوێرانە دەڕوات‌و خۆی بە کۆسپدا دەدات دوای سەد سەرسم‌و هەڵەنگوتن، ئینجا دەگاتە ئاڕاستەیەکی خواناسیی، کە دەیتوانی هەر لەسەرەتاوە باوەڕیان پێ بهێنێت‌و پێیانەوە پابەند بێت و، ئەو ڕەنجی ساڵ و ئەزموونە تاڵو ئەو ڕەنجە بەتاڵە بە هەدەر نەدات!! ئەگەر لە سەرەتاوە بەرنامەی خوایی بناسیایەو وەریگرتایەو(وەك تەعلیماتی سایەقی) پێوەی پابەند بوایە، ڕێی سەرفرازی دەسدەکەوت‌و زۆر ئامانجی بۆ نزیکتر دەبۆوە، دەیتوانی هەر هەموو دەسکەوتەکانی بکاتە خواپەرستی‌و وەك زەخیرەی قیامەتی خۆیان گەنجینەیان کات! ئەم مرۆڤایەتیە زۆر پێویستی بە نووری خوایی هەیە، تا حەقیقەتی خۆی بۆ دەرکەوێت، تا لەبەر ڕۆشنایی ئاڕاستەی خوای کارزاندا بکەوێتە سوود وەرگرتن لەو زانیاریانەی خوای گەورە دەیخاتە بەردەستی.. ئەو کاتە ئەم بەرنامە خواییەی دەدۆزیەوەو لە وەرگرتن‌و پابەندبوونیدا پێوەی دڵنیا دەبوو، کە بزوتنەوەی خۆی بزاوتی گەردوون زۆر بە ڕێکوپێکی‌و سازاوی دەڕۆن، لە یەکتر دەوەشێنەوە، هەروەها هەستی دەکرد، کە سروشتی مرۆڤیانەی خۆی لەگەڵ سروشتی بونەوەردا هاوڕێ بوون، یاساو ڕێسای خۆی لەگەڵ خولگەو ڕێسا گەردوونیەکاندا تەبان.. ئەو کاتەی ئەم مرۆڤایەتیە ئەم بەرنامە خواییە دەدۆزێتەوەو باوەڕی پێ دەهێنێت‌و پێوەی پابەند دەبێت، هەست دەکات ئیسلام هەموو ووزەکان بە شێوەیەکی زۆر دانایانە دەخاتە گەڕ، ئیسلام ناهێڵێت هیچ ووزەیەکی خێرخوازی بە هەدەر بڕوات، ناهێڵێت دنیاو قیامەت لێك یاخی بن، تاك‌و کۆکان ململانێ کەن، میللەت‌و دەسەڵات پێك بکێشرێن، ئیسلام ئەرك و مافی هەمووان لە ناخیاندا، پاشان لە کۆمەڵگەکەیاندا، پاشان لە دەستورو یاساو ڕێسایاندا دیاری دەکات..

ئیسلام ئەم مرۆڤایەتیە لەسەر دیدو تێڕوانینی فیکرو، بانگەوازی گۆڕانکاریی‌و، ڕەوشتی ڕەسەن و پەیوەندی کۆمەڵایەتی پەسەند پەروەردە دەکات.. هەمووشیان بە تەفاهومێکی کاریگەر، کە لەسەر تەقوای خواناسی بینا ددکات..

زۆرێك لە خەڵكی هەوڵ دەدەن ئەم مرۆڤایەتیەی لە بەرنامەی ڕێنمایی خوایی بێ بەشی کەن، لەوانەی، کە هەموو هەوڵدانێك بۆ گەڕانەوە سەر ئەم بەرنامەیە ناو دەنێن (کۆنەپەرستی) و، پێیان وایە گەڕانەوە بۆ ئیسلام سۆزێکە بۆ یادگارە کۆنەکانی مێژوو! نازانن، کە بەم نەفامێتیو پەی پێ نەبردنەی خۆیان ئەم کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیە مەحرووم دەکەن لە بەرەو ئاسۆ چوون، لە بڵندبوونەوە بۆ لوتکەی ڕێز، لە حەوانەوەی ژێر سایەی ئاسوودەیی تەقواو دینداریی، لە پشووی بن سایەی پانو پۆڕی بەزەیی ئەو بەرنامە خواوویستیەی، کە زۆرئاسان ئەم مرۆڤایەتیە بەرەو ئاشتیو هێمنیو دادو گەشە دەبات..

ئێمە کە خەڵکی بۆ ئەم بەرنامەیە بانگهێشت دەکەین، دەزانین بۆ چییان بانگ دەکەین، ئێمە واقیعی داماوانەی مرۆڤایەتی دەبینین، هەست بە بۆگەنی ئەو زەلکاوە دەکەین، کە ئەم مرۆڤایەتیەی تێ پەستێنراوەو دەبینین.. ئەویش دەبینینو ئەو ئاسۆی هەوارگەشمان لێ دیارە، کە ڕێبوارانی دەشتی بێڕوونی جاهیلییەت بە ماندوویی دەیگەنێنو ئەو ئاڵای سەرکەوتنەمان چاو لێیە، کە ئەو ڕێبوارانەی بە هیلاکی بیابانیان بڕیووە لە لوتکەی عززەتو دەسەڵاتدا دەیچەقێنن! ئەو ڕێبازە نورانیەشمان چاو لێیە، کە خەڵکانێکی خواناس گرتوویانەتە بەر، دوای ئەوەی لە زەلکاوەکەی جاهیلییەت هێنرانە دەرێ و پاك کرانەوەو خرانە سەر ڕێی هیدایەت!!

ئەو چارەنووسەش لە دوورەوە دەبینین، کە ئەم مرۆڤایەتیە داماوە لە بێ بەرنامەیی خواناسیدا بۆی دەخزێتو ئەو بارودۆخەشمان بە بیردا دێت، کە لە فەوتانی قیەمی مرۆڤدا لە سایەی تەماعکاریی جاهیلییانەدا بۆ تاك تاکی مرۆڤ دەخولقێت!

یەکەمین هەنگاوی گرتنە بەریی ئەم بەرنامەیە ئەوەیە، کە هەست بەوە بکرێت ئەمە بەرنامەیەکی ناوازەو تاك وبێ وێنەیە، شوێنکەوتوانو هەڵگرانی ئاڵاکەی بە هیچ شێوەیەك ئاڕاستەی ئەهلی ئەو جاهیلییەتە وەرناگرن، کە لە دەوروبەریان جمەی دێتو خۆی بە دەسەڵاتیەوە بادەدات! دەبێ ئەمە یەکەمین هەڵوێستی دیندارانە بێت، تا بەرنامەکە بە پاکیو تاکی وەکو خۆی بمێنێت، بەو ئومێدەی

جارێکی تر خوای پـەروەردگار رێـی بداتـەوە، بێتـەوە سـەرکردایەتی و ئاڕاسـتەی کۆمـەڵگەی مرۆڤایەتیبکات، خـوای کـارزانیش بەرامبـەر بـە عەبـدەکانی خـۆی بەبەزەییە، حـەز ناکـات ئـەهلی جاهیلییـەت لێـرەو لـەوێ بـەرەو ئـەو زەلکـاوو زۆنگاوەی خۆیان رایکێشن، هەر وەکو، کە لەسەرەتای وەحیشەوە حەزی نەکرد لەو خەڵکە داماوە گەڕێ، زهێزو ملهوڕان بە کـەیفی خۆیـان بـەرەو هێنانـەدی حـەزە مونحەریفەکانی خۆیانیان بڕەتێنن، ئەوەش هەمووی لەو ئاڕاستە خواییـەوە دیـارە، کە بەردەوام بە وەحی خوایی بۆ پێشەوا نازدارەکە (ﷺ) دەهات..

کێشەی خوایەتی خوا[1] زۆر جێی نکوڵی کردنـی جیددیانـەی کافرەکـان نـەبوو، چونکە ئەوان دەیانزانی، کە خوا هەیـە، دانیـان بـەوەدا دەنـا، کـە خـوا کردگـارو رۆزیدەرو ژێنەرو مرێنەرو کارگێڕی بە توانـاو دانایـەو دەسـەڵاتی بەسـەر هـەموو شتێکدا دەشکێت.. بەڵام ئەم ئیعتیراف کردنەیان وای لێ نەدەکردن داواکاریـەکانی خوایەتیش وەرگـرن وجێبـەجێی بکـەن، دەبـوو ئـەوان وەك، کـە ئیعتیرافیـان بـە خوایەتی خوا دەکەن ئیعتیرافیش بە پەروەردگارێتیەکەی بکەنو حەتمـەن هـەر ئـەو بپەرستن، چونکە پەرستن لە داواکاریەکانی پەروەردگارێتیە. تا هـەموو ملکەچـیو گوێڕایەڵیەکیان بۆ خوای پەروەردگار بێت، هەر وەك، کە پێی دەفـەرموون: (ذٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ) ١٠ یونس / ٣ واتە: ئەو خوایە پەروەردگارتانە دە بیپەرستن..

لە جاهیلییاتدا بواری خوایەتی تەسك دەبێتەوە، خواپەرستی یەکسان دەبێت بە باوەڕ هەبوون بە هەبوونی خوا!! بۆیە خەڵکی وا دەزانن هەر بەوەندەی باوەڕیان بـە هـەبوونی خـوا هێنـا، ئـیتر نـەك هـەر موسـوڵمانن، بـەڵکو گەیـشتوونەتە پلـە داواکراوەکانی باوەڕو شایانی ڕەحمەتو بەهەشتی خوان!! ئیتر بێ ئەوەی داواکاریـە

---

[1] سەیید ڕەحمەتی خوای لێ بێت زاراوەی خوایەتی (کە ئێمە بە مانای الالوهیە بـەکاری دەهێـنین) لـە جێی پەروەردگارێتی بەکار دەهێنێتو پەرومردگارێتی (کە ئێمە بە مانای الربوبیە بەکاری دەهێـنین) ئەو بە مانـای خوایـەتیو پەرسـتن بـەکاری دەهێنێت. بۆیـە لێرەشـدا سـیفەتەکانی کردگـارێتیو خـاوەنێتیو ژیانـدنو مرانـدن دەکاتـە سـیفەتی خوایـەتی، کـە ئێمـە پێمـان وایـە سـیفەتی پەروەردگارێتین.. لەوە ئاگادار بین..

سەرەکیەکەی خوایەتی خوای گەورە بهێننە دی، کە پەروەردگارێتیەکەیـەتی! واتـە وەرگرتنو پابەندبوون بە دینی خوای خاوەنەوە.. دینی ئەو خوایەی، کـە خوایـەکی تر نیە شایانی پەرستن بێت، ئەو نەبێت.. ئەو خوایەی کە هەموو مافی یاساو ڕێسا دانان هی ئەوەو، کەس هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی لـە هـیچ گۆشـەو کـەنارێکی ئـەم بازنەیەدا نیە..

هەروەها لە جاهیلییەتـدا مانـای پەرسـتنی دەشـێوێت، پەرسـتن لای خەڵکـە داماوەکە هەر ئەوەندە دەگەیێنێت، کە دروشمە پەرستنیەکان ئەنجام دەدرێنو بـەس، هەر کەسێك نوێژو ڕۆژووەکەی کـرد، ئـیتر ئـەوە خواپەرسـتی خـۆی ئەنجامـداوەو لێبۆتەوە!! لە کاتێکدا کە سەرەکیترینو سەرەتاییترین مانای (عَبَدَ) بریتیە لـە (دانَ وَخَضَعَ: واتە ملکەچ بوو گوێڕایـەڵی کـرد)، ئەنجامـدانی دروشمـەکانی خواپەرسـتی بەشێکە لە دەربڕینی ملکەچیو گوێڕایـەڵی خـوای گـەورە، خـۆ هـەموو مـۆرکو ڕواڵەتی خواپەرستی ناگرنەوە..

ئـەو دینـەی خـوای گـەورە ناردوێتیـە خـوارەوە ئیـسلامە، ئیـسلامیش یـەعنی ملکەچیو گوێڕایـەڵی دەربـڕین بـۆ شـەریعەتەکەی، واتـە داوەری بردنـە لای یاسـاو ڕێسایو تەسلیم بوون پێی.. ئەوی وا نەبێت و وا نەکات فڕی بەسەر ئیـسلامەوە نیـە، بە تەئکید بە موسوڵمان ناژمێررێت، با خۆشی خـۆی لـە ریـزی موسـوڵمانان حـسێب بکاتو وا لافو گەزاف لێدا، کە لە دینەکەی خوادایەو ئیسلامەتی وەرگرتووە!!

خوای گەورە خۆی دینەکەی خۆی پێناسە دەکات، خۆی دیاری دەکاتو ڕوونـی دەکاتەوەو حوکمی پێ دەکات.. ئەمە مافێك نیە یەکێکی تر بـۆ خـۆی، یـان بـۆ کەسانی تری زەوت بکات، کەس بۆی نیە بـە گـوێرەی دیـدو تێـڕوانینی مرۆڤـ و حەزو هەواو هەوەسی مرۆڤیانەی خۆی، یان هی وەکـو خـۆی دیـنی خـوا پێناسـە کاتو ئەحکامەکانی لێکدادەتەوە..

# بەندی سێیەم: مانای باوەڕ

باوەڕ هێنان بە خوای گەورە بریتیە لە باوەڕ هەبوون بەوەی، کە تەنها خوای گەورە پەروەردگارو کردگارو پەرستیارە، پاشان دان نان بەوەدا، کە تەنها ئەو دەسەڵاتی بەسەر دڵ و دەروون و ڕەفتاری مرۆڤدا هەیەو، هەر ئەو بۆی هەیە ئاراستە بۆ هەموو کاروبارێکی ژیان بە هەموو لایەنەکانیەوە دانێت..

کەوابوو هاوەڵ (شەریك) بۆ دانان شتێکی نامومکینە، چ لە پەروەردگارێتیەکەیدا، چ لە کردگارێتیەکەیدا و، چ لە پەرستنیدا.. هیچ شتێکی تر هاوەڵی خوا نیە، نە لە بوارو توانای دروست کردندا، نە لە کارگێڕی کاروباردا. هیچ شتێك لەم گەردوون و ژیانەدا کاریگەریی بێ وویست و مۆڵەت و ڕەزامەندی ئەو نیە، کەس ڕۆزی کەس نادات، کەس زیان یان سوود بە کەسێکی تر، بێ خوای گەورە ناگەێنێت، هیچ شتێك، هیچ ڕوداوێك، گەورە یان بچووك لەم گەردوونە بەرفراوان و ژیانە پان و پۆڕەدا، بێ ڕەزامەندی خوای گەورە ڕوونادات..

لە پەرستندا هیچ هاوەڵێك نیە، ڕووی پەرستنێکی خەڵکی تێ بکرێت، نە دروشمی پەرستن (وەك نوێژو ڕۆژوو) نە ملکەچی و گوێڕایەڵی بۆ دەربڕین.. هەموو سیماو کرۆکی پەرستن بۆ خوایەو بەس.. لە پەرستندا هەر روو لەو دەکرێت، لە ملکەچی و گوێڕایەڵیەکەشدا بۆ ئەو، یان بۆئەو کەسە دەردەبڕرێت، کە ئەو ڕێی داوە، ئەوی مافی دەسەڵات و حوکمی لە خوای گەورەوە وەرگرتووە، کە کەس دەسەڵاتی بەسەر ئەودا ناشکێت و هەموو شتێك ملکەچی دەسەڵاتی ئەوە!!

دەسەڵات بەسەر ویژدانی خەڵکیدا، هەروەها بەسەر ڕەفتارو هەڵسوکەوتیاندا، تەنها بە هۆی ئەم باوەڕ بە خوا هێنانە بەو شێوەیە دەبێت، ئەوانەی بەم باوەڕە تەسلیم بەو دینە بوون و قبووڵیان بوو کەسانێکی موسوڵمان بە هەمان باوەڕ بە خوا هێنان ببنە دەسەڵاتدار، بەربەستیان لەبەردەمدا نابێت بۆ ئەوەی، کە حوکمی

ئەو باوەڕدارا نە لە یاساو ڕێسای ئیداری و کۆمەڵایەتی و ئابووری داڕێـژن، مـادام ئـەوانیش بنـەماکانی ئـەم یاسـاو ڕێـسایانەیان هـەر لـە خـوای تـاك و تـەنهاوە وەرگرتووەو، ئەوانیش بەو باوەڕ هێنانە بە تەواوی تەسـلیمی فەرمانـەکانی خـوای پەروەردگارو کردگار بوون.. ئەمە مانای باوەڕ هێنانە.. ئیـدی دوای ئەمـە مـرۆڤ ئازادە، چی دەکات بیکات، بەڵام بۆی نیە ئەو سـنورە ببـەزێنێت، کـە خـوا بـۆی دیاری کردووە، ئازادە چ پەیوەندیەك و لەگەڵ کێ دەیبەسـتێت، کـەس دەسـەڵاتی بەسـەریەوە نابێـت، مەگـەر بـە مافێـك، کـە خـوای گـەورە پێـی دابێـت و لای هەموانیش روون و ئاشکرا بێت..

باوەڕ هێنان بریتی نیە بە هەموو شێوەیەکی باوەڕ بە خوا بـوون، بـەڵکو یـەك شێوە باوەڕبوونە، شێوەی خوا بەیەکناسین (تەوحید)، کە دەبێت مـرۆڤ بـۆ پەرسـتن وەکو هەموو مەخلووقاتی تری گەردوون هەر روو لەو کەن و بەس.. دەبێ تەسـلیم بەوەش بن، کە تەنها خوای تاك و پاك دەسەڵاتی رەهای بەسەر هەموو گەردوون و ژیان و مرۆڤدا هەیەو بەس..

هیچ شتێك بێ ئیزنی خوا نابێت، هیچ کەسێك دەسەڵات بەسەر هـیچ شـتێکی تردا ناسەپێنێت مەگەر بە فەرمانی خوا نەبێت، ئا ئەم قەناعەتە ئەو باوەڕەیە، کە خوا دەیەوێت، چونکە ئەمە ئەو ئیسلامەیە، کە خـوای گـەورە نـاردوێتی و داوای کردووە خەڵکی وەریگرن، ئەم ئیسلامە بەم مانایە، خۆ تەسلیم کردنی تـەواوە بـە دەسـەڵاتی خـوایی و، وەرگـرتنی فەرمانـەکانی ئـەو بـۆ بەرنامەرێـژیی هـەموو لایەنێکی ژیانی مرۆڤایەتی، ئەمە واتە داوەری بردنە لای قورئان بەو ئیعتیبارەی، کە ئەو شەریعەتەی خوایـەو قبـووڵ کـردنێتی بـە داوەر لـەو روانگـەوە، کـە لـە دەسەڵاتی رەهای خواوە هاتووە..

باوەڕ هێنان بە خوای گەورە بەم شێوەیە، واتە خـاڵی وەرچـەرخان لـە مێـژووی ژیانی مرۆڤایەتیدا، خاڵی گۆڕانکاریی لە فرەپەرستراویەوە، لـە روو کردنـە شـتانی وا، کە خوا نین، تەسلیم بوون بە شتانێك، بە کەسانێك، کـە کردگـارو پـەروەردگار

نین بۆ روو کردنە خوای کردگارو پەروەردگار.. وەرچەرخانە لە توولە رێ و بەهاو نەریتانێك، کە مایەی ئەو قەدرو نرخە نین بۆ دیدو بیرێکی خواناسیی، کە دڵ و دەروونی تێدا رزگار دەبێت، کە هەموو نەفسەکانی تێدا یەکسان دەبێت! چونکە هەموویان لەبەرامبەر خوای تاك و پاکدا یەکسانن، یەك تواناو قەبارەو رادەو برو ئاستیان لە سەرەتایاندا وەکو یەك بووە.. ئینجا دواتر بەقەدەر توانای بەرز بوونەوەو سوڵحانیان ئاستیان بەرز بۆتەوە، نرخی زیادەیان چۆتە سەر!

ئەم باوەڕ بە خوا هێنانە، قوتار بوونە لە پشێوی و گەرەلاوژێی دیدو بیرو رێبازو نەریتی تێکچرژاوی دەستەویەخەبۆوە، بۆ رێکخستن، لە وێڵیەوە بۆ نیەتی خواناسیی، بۆ راست رەوا بوونی بەرەو یەکخواچوون!! لە چاوگێڕان و پەرتەوازەیی رەنجەوە بۆ چەق گرتن و، تەرکیز کردنە سەر وەستان لەسەر پنتی راگیربوون لەسەر رێبازی خواناسیی، بۆ بزاڤێکی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی، کە لەگەڵ بزاوتی گەردوون و ژیاندا یەکانگیر بۆتەوە، بۆ ئەو هەست و هۆش و قەناعەتەی، کە ئەمیش و ئەوانەی لەدەوروبەرین لە نیازو ئاراستەو ئامانج و رەنج دا روویان لە یەك خوایە، کە هەموویان وایان باوەڕ پێ هێناوە، کە کردگارو پەروەردگارو پەرستراوی هەموویانە..

ئەمە ئەو خوابەیەکناسینەیە، کە بە هیچ شێوەیەك بواری هاوەڵ دانانی لە هیچ بوارێکدا تێدا نابێتەوە، بواری لاڕێبوونی نیە، ئەم دینە لەو دینانە نیە دەسکاری کردن قبووڵ کات، ئەم دینە وەکو دینەکانی تر ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەردا نایات، کە هەر بە نەمانی پێغەمبەرە عەزیزەکان رووی دەدا.. ئەم دینە لەسەر بناغەی یەکەم (اللّهُ لا إلَـهَ إلا هُـوَ) ٢ البقـرة/ ٢٥٦ کە دامەزراوە لە هەموو کاروبارو رەفتارێکیدا هەر ئەم خوابەیەکناسینەیەو عەکس دەبێتەوە.. ئەم رێسایە ئەو بناغەیە، کە هەر لە سەرەتاوە دیدو بیروهۆش وبۆچوونی ئیسلامی لەسەر دامەزراوە، پەیڕەو وپرۆگرامی ئیسلام و سیستمی رێکخستنی ژیانەکەش لەسەر پێناسەی ئەم بۆچوونە دارێژراوە.. خواناسیی و بەرەو خواچوونیش هەر لەم

زەمینەوەیە.. لەم دیدەوەیە، کە موسوڵمان ملکەچی بۆ هیچ دەسەڵاتێك دەرنابڕێت، تا بە ئیزن و ڕەزای خوای گەورە نەهاتبێتە پێش، واتە تا لە دینی خواوە نەهاتبێت.. هانای بە پێی شەریعەتەکەی دامەزرابێت و فەرمان و بەرهەڵستیەکانیشی، کە لە بڕیارو یاساو ڕێسایدا دەردەکەوت بە پێی شەریعەتەکەی خوا بن و بەس.. ڕێسای (حاکمێتی مافی خوایەو بەس ) لەم زەمینەیەوە هاتوود، واتە تەنها خوای گەورە مافی یاساو ڕێسا دارشتنی بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگەکەی هەیە.. دەبێت ئەو یاساو ڕێسایانەش، کە مرۆڤەکان بۆ ڕێکخستنی ژیانی رۆژانەی خۆیانی دادەڕێژن، هەر لە ڕێسا گشتیەکانی شەریعەتی خواوە هاتبن.. لەم روانگەوەیە کە دەووترێت: دەبێت هەموو بەهاو نەریتێك لە خواوە وەربگیررێت، بەم مانایەشە، کە دەوترێت: هەر بەهاو نەریتێك لە چوارچێوەی شەریعەتی خوادا جێی نەبێتەوە مایەی قبووڵ کردن نیە، واتە هەر دیدو بیرێکی فیکریی، هەر ڕێبازو خەباتێکی سیاسی، هەر ئیدارەو دەسەڵاتێکی حکومی، هەر داب و نەریتێکی کۆمەڵایەتی، هەر ڕەفتارو ڕەوشتێکی تاك و کۆ پێچەوانەی دینی خوا بێتەوە، ڕەفز دەکرێتەوەو نابێت لە ژیانی موسوڵماناندا جێی ببێتەوە، هەروەها هەر هەست و سۆزو ئینتیمایەك لە ناخدا بێت، یان لە ڕەفتارو هەڵسوکەوتی ژیانی تاك و کۆ، لە کۆمەڵکاریدا بێت یان لە بەرنامەی ژیاندا، شەریك بۆ خوا بڕیار دانەو پێچەوانەی خوابەیەکناسینە..

نا ئەم خوابەیەکناسینە راشکاوو ئاشکرایە (اللَّهُ لا إِلَـهَ إِلا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ) ٢ البقرة/ ٢٥٦ ئەم دیدە خواوویستیە دووریێانە، فاسڵی نێوان باوەڕی موسوڵمان و دیدی عەقائیدی غەیرە موسوڵمانە، دیدی مسقۆف (مولحید) ەکان بێت، یان دیدی جولەکەو دیان و دیندارانی تری مەزهەب و گروپی تری ئەهلی کیتاب، یان دیدی غەیرە موسوڵمان لە خەڵکانی دیکە، هەر وەکو کە دووریێانی نێوان موسوڵمان و غەیرە موسوڵمانە لە دارشتنی ژیانی موسوڵمان و غەیرە موسوڵماندا.. چونکە باوەڕ لێرەدا ئەو دیدو زەمینەیە، کە بەرنامەی ژیان و سیستمی کۆمەڵگەکە و ڕەفتارو ڕەوشت و نەریتی بە ووردی لەسەر دادەمەزرێت..

خوابەیەکناسین دووڕێیانی دیدو بیروباوەڕە، هەر وەکو کە دووڕێیانی رەفتارو رەوشتە.. ئەو کەسەی کە هەست و نەستی دەبێتە خوابەیەکناسین، کە قەناعەتی موتلەقی بەوە دەبێت، کە خوای گەورە تەنها کردگارو پەروەردگارو پەرستراوو دەسەلاتداریی دڵ و دەروون و رەفتارو رەوشت و داڕێژەری یاساو رێسای کۆمەڵگەیە، کە خوایەکیشە شەریکی لە هیچ دیدو تێڕوانینێکدا، یان لە پەرستنێکدا، یان لە یاساو رێسایەکدا، یان لە هەست و نەستێکی تاك و کۆو ئینتیمایەکیاندا نیە، کە لە ناخی خۆیدا قەناعەتی موتلەقی بەوە کردووە، کە هەر هەموو گەورەو گچکەیەکی ژیان و گەوردوون و مرۆڤ لە رەزامەندی و وویست و ئیرادەی ئەوەوە بێت و، هەر هەموو مەخلوقات دەبێ روو لەو کەن، ئەوی ئەم قەناعەتەی بۆ دروست دەبێت، حەتمەن دەبێت پەیڕەوو پڕۆگرامی بزاڤی کۆمەڵکاریشی جیا بێت، حەتمەن دەبێت ڕێبازو بانگەوازو ئامانجی جیا بێت، چونکە هەر لە سەرەتایەوە دەزانێت، کە دارشتنی ژیانی خۆی و کۆمەڵگەکەی لەسەر بنەمایەکی جیا دادەمەزرێنێت، ئەم کەسە جیاوازی جەوهەری لەگەڵ ئەو کەسانەدا هەیە، کە لە سەرەتاوە دید لێڵن، لە سەرەتاوە تەمومژێکی چڕ بەرچاوی گرتوون، کە لە سەرەتایانەوە نەیانتوانیووە خوابەیەکناسین لە فرەخوایی جوێ کەنەوە، نەیانتوانیووە ویژدانیان بە خواناسیەکی تاك و پاك ئاسوودە کەن و بە دینداریەك گۆش کرێن، کە کاریگەریی لەسەر هەموو رەفتارو نەریتێکیان دەبێت تەقوایە.. ئەم کەسە خواناسە جیاوازی زۆرە لەگەڵ ئەو کەسانەی، کە هەموو لایەنەکانی ژیانی تاك و کۆیان وەکو ئەم، لەسەر بنەمای عەقائیدی راشکاوو ئاشکرای ئیسلام دانامەزرێت.. بۆیە ئەمی خواناس دامەزراوەو ئەوانی تر لەرزۆك، ئەم دید روونەو ئەوان دید لێڵ، ئەم راستەرێی گرتووەو ئەوان وێڵ.. ئەم، خوابەیەکناسین ئاراستەی ویژدان و رەفتارو خەبات و سیستمی حوکمی دەکات، ئەوان ویژدانیان وا لەژێر کاریگەریی دیدێکی فەلسەفی تر، رەفتاریان وا لەژێر ئاراستەی بانگەوازێکی رەوشتی تر، خەباتیان وا لەسەر ڕێبازێکی جوداتر،

سیستمی حوکمشیان لە هەواو هەوەسێکی سەرکەشەوە هاتووە.. بۆیە ڕاجوێن و لە ململانێیەکی بێ ئاماندان..

ئەمە دیدو ڕێی خوابەیەکناسین ڕاشکاوو ئاشکرایە، ساغ و بۆ خوا سولحاوە، هەر ئەو دەپەرستێت، جێی غەیری خوای تێدا نابێتەوە، هانا بۆ بردن و لێوەرگرتن لە غەیری ئەوەوە نیە، نە وەرگرتنی دیدو بۆچوون و پێناسە، نە وەرگرتنی هەست و هۆش ومەدەدی ڕۆحی، نە وەرگرتنی دروشمی پەرستن، نە وەرگرتنی یاساو ڕێساو سیستمی حوکمی سیاسی و ئابووری.. نە وەرگرتنی ڕەفتارو ڕەوشتی تاك و کۆ، نە وەرگرتنیداب و نەریتی کۆمەڵایەتی تاك و کۆ!! بە هیچ کلۆجێك جێی غەیری خوا، لە هیچ گۆشەو کونجێکی ژیان و ئاڕاستەیدا نابێتەوە..

ئەمما لە دیدە لێڵەکاندا، لە بیرە ئاڵۆزەکاندا، لە تێڕوانینە تێکەڵ و پێکەڵەکاندا، شتی نەگۆڕ نابینیت، نە پێناسە، نە ڕێباز، نە ئاڕاستە، نە بڕیار.. نە بڕیاری حەڵاڵ، نە بڕیاری حەرام!! نە ڕاست وەك ڕاستێکی هەمیشەیی دەناسرێت، نە چەوت! نە لە هەست و هۆشدا، نە لە کۆمەڵکاریی و خەباتدا، نە لە یاساو ڕێساو سیستمدا، بێ گومانیش نە لە ڕەفتارو ڕەوشتدا، نە لە داب و نەریتیشدا.. هەر هەمووی بە گوێرەی پێناسەی ڕۆژانەی ئاڕاستەوانانی جوداو دوور دەگۆڕڕێن!! تا لایەنی ئاڕاستە کردنەکە دیاری نەکرێت، کە دەبێت هەموو ئاڕاستەیەکی هەقی لێوە وەربگیرێت، دیدی لێڵ و پێناسەی چەوت و پێشوی ڕەفتارو ململانێی بێ ڕەحمانە بەردەوام دەبێت، ئەگەر ئەو لایەنە دیاری کرا ـ وەکو کە لە ئیسلامدا دەیبینین ـ کە دیدو بیروهۆش پاراستن، یاساو ڕێسا، ڕەفتارو ڕەوشت هەر لە یەك خواوە وەردەگیرێت، یەك لایەنە، کە ئاڕاستەی هەموو لایەنەکانی ژیان و مرۆڤ دەکات، هەر ئەو خوای کردگارو پەروەردگارو پەرستراوە تاك و پاکەیە.. ئەمە ناوکۆیی بنبڕە، بۆیە وا جیددیانەو حەددیانە دەفەرموێت: (اللَّهُ لا إِلَـهَ إِلا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ) ٢ البقرة/ ٢٥٦..

جودابوونەوەش هەر لێرەوەو، ئاوا دەست پێدەکات، هەموو پێناسەکان لە دیدی خواناسی موسوڵماندا لەم ڕێسایەوە هاتوون، سروشتی ژیانو مرۆڤ و گەردوون لەم ڕوانگەوە پێناسە کراون.. چونکە چۆنیەتی سروشتی باوەڕ بەخواهێنان لای موسوڵمان و غەیری موسوڵمان جیاوازە.. هەر هەموو ژیانو هەرچی لەلایەنەکانیەوە دەردەکەوێت، لە دیدی موسوڵماندا لە ڕوانگەی خوابەیەکناسینەوە هاتووە..

سروشتی ئەم خوابەیەکناسینەش وایە، کە تا سیماو مۆرکی خواوویستی بە کردەوە لە ژیانی خەڵکیدا دەرنەکەوێت، تا لە ڕەفتارو ڕەوشت و داب و نەریت و کۆمەڵکاریی و خەبات و سیستمی حوکمیاندا دەرنەکەوێت، باش وەکو عەقیدە لە ناخی دڵ و دەرونیشیان ناچەسپێت، بۆیە بۆ ئەوەی بەڕاستی ئیماندار بن و لە دینداریاندا سەرکەوتوو بن، دەبێت شەریعەتەکەی خوا هەموو ئاراستەیەکی ژیان ـ گەورەو گچکەی ـ بگرێتەوە، یەعنی هەر هەموو ژیانیان بە پێی شەریعەتەکەی خوا دامەزرێنن، تا دینداریتیەکەیان بگەشێتەوەو بدرەوشێتەوە..

ئێمە لە قورئاندا دەبینین، کە خوای پەروەردگار هەر پەرستنەکان فێری موسوڵمانان ناکات، هەر ئاداب و نەریتیان فێر ناکات، ئێمە ـ نەك ئەو خەڵکە داماوە سادەو ساویلکەی وا حاڵی کراوە، کە دین هەر پەرستن و ئادابەکانە ـ دەبینین کە خوای پەروەردگار هەر لەو قورئانەدا، هەر هەموو لایەنەکانی ژیانی موسوڵمانان ئاراستە دەکات، هەرچی شتێك لە واقیعیاندا قابیلی ڕوودانە بۆیان باس دەفەرموێت.. دەبینین کە ئەوەیان لێ قبووڵ ناکات وا لە دینەکە حاڵی بن، کە خۆیان پێناسەی دەکەن!! نا، خوای گەورە ڕوونو ڕاشکاوانە پێیان دەفەرموێت، کە نە لە تاکی موسوڵمانو، نە لە کۆمەڵگەی موسوڵمان ئەوە قبووڵ ناکات، کە بە پێی شەریعەتەکەی ئەو هەڵسوکەوت نەکەن، یان هەر هەموو ژیانیان بە پێی ئاراستەی ئەو دانەڕێژن.. ڕاشکاوانەو بە ئاشکرا پێیان دەفەرموێت، کە بە هیچ کلۆجێك ئەوەی قبووڵ نیە سەرچاوەی بەرنامەڕێژیی خۆیان زۆر کەن، بە هیچ

شێوەیەك لێیان رازی نابێت فرە دیدو فرەڕێ بن.. نابێت دروشمی خواپەرستی و رەفتارو رەوشت و ئاداب و نەریتیان لە شەریعەتەکەی ئەمەوە وەربگرن و، لەولاوەش چۆنیەتی سەوداو مامەڵەو یاسای ئابوری ودەستووری سیاسی ورێسای دیبلۆماسی نێو دەوڵەتی، لەلایەنێکی ترەوە وەربگرن، نابێت ئەمانە لە هیچ دیدو تێڕوانین و پێناسەیەکی فیکرییەوە وەربگرن..

ئەرکی بیرکردنەوەی مرۆڤ ئەوەیە، کە پەی بەوە ببات کە چۆن ئەحکامی ووردەکاریی ژیانی خۆی لە قورئانەوە وەرگرێت،، چۆن یاسای رۆژانەی وای لێ هەڵدەهێنجێت، کە هاوجووتی گۆڕانکارییەکانی رۆژانەی خۆی و کۆمەڵگەکەی بێت، کە گۆڕانکارییان بەردەوام بەسەردا دێت، ئەم مرۆڤانە دەتوانن لەم بوارەدا ووزەی بیرو ژیریی خۆیان بخەنە کارو لە ئیسلامەکەوە وەرگرن، نەك لە سەرچاوەیەکی تری جیاوازەوە، ئەگینا نە باوەڕیان دەمێنێت، نە ئیسلامەتیەکەیان.. ئەگەر پێیان وابوو، کە دەتوانن لە سەرچاوەیەکی ترەوە وەرگرن، ئەوە نەك هەر باوەڕیان نامێنێت، بەڵکو بەڵگەی ئەوە دەخەنە ڕوو کە هەر لە سەرەتاوە باوەڕیان نەهێناوە! هەر لەسەرەتاوە دانیان بەوەدا نەناوە، کە سەرەکیترین داواکاری (أشهد أن لا إلـه إلا الله) ئەوەیە، کە قەناعەتی وا بێت و بڕیاری ئەوەی دابێت، کە غەیری خوای گەورە هیچ کەسێك مافی یاساو رێسا دارشتن و حوکمڕانی نیە.. کافر بوون بە نکوولّی کردنی ئەحکامی دینەکە، یان رێگرتن لە راپەڕاندنی، یان بە داوەری نەبردنە لای و جێبەجێ نەکردنی، هەموویان وەکو یەك لە دین هەڵگەڕانەوەن و مایەی هاتنەخوارەوی غەزەبی خوای گەورەن..

ئەم دید لێڵیە، ئەم بیرئاڵۆزیەی ئەمڕۆ، کە ئەم خەڵکەی سەرزەمینی لەسەرە لە نەوەی موسوڵمانان، کە خۆیان ـ بە ناهەق ـ بە موسوڵمان دەناسێنن، ئەو لێهاتوویی و لێوەشاوەییەیە، کە خۆیان ئامادە کردووە تەقدیمی خوای گەورەی کەنەوەو خۆی پێوە ببەنە پێش، کە ئەوەتا ئێمە موسوڵمانین!! دەشیانەوێت پاداشتی لەسەر وەرگرن!! نابێت، ئەمە مایەی غەزەبی خوایە، ئەم دید لێڵی و

نەناسینەوەی ئیسلامە، ئەمڕۆ هەلآرۆسکانە بە دینەکەوە، ئەم لاف لێدانی ئیسلامەتیە، هۆکاری ئەم وازلێهێنانەی خوای گەورەیە، ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی خوای گەورە لێ گەڕێت ئەم زەلیلی و تێکشکان و ژێردەستییە روو لەم خەڵکە فریوو خۆرو چەواشەکارە بکات! ئاخر هەقە، کە یەکێك دەڵێ: باشە بۆچی ئێمە موسوڵمانیشین و ئاوا شکست دەخۆین؟! خێرا پێی بووترێتەوە: کوا موسوڵمانێتیتان؟ کامەیە؟ موسوڵمانەکان کامانەن؟

ئێمە ئەم ماناو واتایانە دووبارە دەکەینەوەو جەختی لێ دەکەینەوە، چونکە ئەو ماوە زۆرەی، کە ئەم ئیسلامەی تێدا دوور خراوەتەوەو، لە حوکمڕانێتیدا کەنارگیر کراوە تێیداو نەهێڵراوە بەرنامەی ژیانی کۆمەڵگەیەك بێت ـ وەکو کە دەبوو هەبێت و وابێت ـ وای کردووە، کە ماناو واتای دینەکە زۆر کورت هەڵێنێت، زۆر بەو ماناو واتا بەرفراوانەی قورئان پێناسەی کردووەو خستوێتیە روو، نامۆ بێت..
وشەکانی (حەڵاڵ) و (حەرام) لە دیدو بیرو پێناسەی خەڵکیدا ئەوەندە کورت و سست بوون لەوە تێناپەڕن، کە ئەو گۆشتە حەڵاڵە، چونکە سەربڕینەکەی بە پێی شەرع بووەو، ئەوی تریان حەرامە، چونکە بە پێی شەرع سەرنەبڕاوە!! یان ئەو خۆراکە، ئەو خواردنەوەیە حەڵاڵەو ئەوی تریان حەرامە! ئەمما لایەنەکانی تری ژیان، یان کاروبارە گەورەکانی کۆمەڵگە، ئەوە زۆر ئاسایی دەچن یاساو ڕێسای تریان لە دین و تیۆرو دەستورەکانی تریانەوە ـ کە لە جێی دینەکەی خوا دانراون ـ بۆ دەهێنن و کەس لە حەڵاڵێتی و حەرامێتیەکانیان ناپرسێتەوە!!

هەر هەموو سیستمی کۆمەڵایەتی، هەر هەموو دەستوری سیاسی، هەر هەموو ڕێسای نێو دەوڵەتی، هیچیان لە شەریعەتی خواوە وەرنەگیراون، ئاراستەو کاریگەریی شەریعەتی خوای گەورە وا خراوەتە کەنار، کە تەنانەت لە بڕگەیەکی یاسادا لە شوێنێکەوە لە ژیانی خەڵکیدا دەرناکەوێت!!

ئیسلام بەرنامەی هەر هەموو ژیانە، هەر کەس شوێنی کەوێت و بیچەسپێنێت، ئەوە لە دینی خوادایەو موسوڵمانە، هەر کەس شوێت بەرنامەی

دیکە بکەوێت و حوکمی پێ بکات، با لە بڕگەیەکیشیدا بێت، ئـەوە باوەڕهێنـانی بە خوای گەورە ڕەفز کردۆتەوەو، دەستدرێژیی کردۆتە سەر مافی خوای گەورەو، بـە ئاشکرا لە دینی خوا دەرچووەو فڕی بەسەریەوە نەماوە.. با بۆخۆشـی هـەر هـاوار کات، خەڵکینە! موسوڵمانم و ڕیزی عەقیدەکەم دەگرم!!

هەر کەسێك شوێن یاساو ڕێسایەکی تری غەیری شـەریعەتەکەی خـوای گـەورە بکەوێت و، لاف و گەزافی ئەوە لێدا، کە موسوڵمان ماوە، ئەوە درۆ دەکات، ئـەوە بە ئاشکراو راشکاوانە مۆری کافر بوونی لە خۆی داوەو ئاشکرا لە دینەکـە چـۆتە دەردوە، ئەمە ئەو کێشە سەرەکیەیە، کە دەقە زۆرەکانی قورئان بەردەوام جـەختی لەسەر دەکەنـەوە، ئەمـە ئـەو تـەوەرە باسـەیە، کـە هەمیـشە قورئـان دووپـاتی دەکاتەوەو دەیکاتە کێشەی سەرەکی بوون و نەبون.. دینی خوا، یان زەوت کردنـی دەسەڵاتی خوا..

ئەمەیە ماناو واتـای سـەرەکی پـەروەردگارێتی و کردگـارێتی، کـە هەمیـشە قورئان باسیان لێوە دەکات، ئا ئەمەشە ماناو واتای باوەڕ، کە هەموو ئایەتـەکانی قورئان بۆ ڕوون کردنەوەی ڕەهەندەکانی تەرخان کراون..

# بەندی چوارەم: شایەتی خوا

(شَهِدَ اللّهُ أَنَّهُ لا إِلَـهَ إِلا هُوَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُواْ الْعِلْمِ قَآئِمَاً بِالْقِسْطِ لا إِلَـهَ إِلا هُـوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ) ٣ ال عمران / ١٨ واتە: خوای گەورە شایەتی داوە، کە تەنها ئەو خوایەو شایانی پەرستنە، هەروەها فریشتەکان و خاوەن زانیاریەکان شایەتیان داوە، کە خوای گەورە دادپەروەریی دەستەبەر دەکات ـ هیچ خوایەك نیە شایانی پەرستن بێت جگە لە الله، ئەو باڵادەست و دانایە..

ئەمە حەقیقەتی یەکەمە، کە دیدو بیروهۆشی ئیسلامی لەسەر دادەمەزرێت، ئەمە حەقیقەتی خوابەیەکناسینە، خوابەیەکناسین لە پەروەردگارێتی و، یەکبوونی دەسەڵات و، یەك ڕێسایی لە دەستەبەر کردنی دادپەروەریدا.. ئەم حەقیقەتە دەخوازێت مەبەستێکی دی بێنێتە دی، کە بریتیە لە سەلماندنی ڕاستێتی عەقیدە ئیسلامیەکەوەلە لایەکی ترەوە نەهێڵێت تۆزو خۆڵی هیچ جۆرە گومانێك لە عەقیدەکە بنیشێت..

شایەتی خوای گەورە لەسەر ئەوەی، کە هیچ خوایەك نیە جگە لە الله، خۆی لە خۆیدا لای هەموو ئیماندارێك بەسە، بەوەی کە خوا خۆی ئەو شایەتیە دەدات.

موشریکەکانی عەرەب خۆیان باوەڕیان بە خوای گەورە هەبوو، بەڵام لەو لایەنەوە کەوتبوونە گومڕاییەوە، کە شەریکیان بۆ بڕیار دەدا، بتیان دادەناو وەکو ئەو پیرۆزیی و مەزنییان بۆ بڕیار دەدان!! شایەتیەکەی خوای گەورە لێرەدا داواکاریەکەی دوایی پێ مەبەستە، کە دەبێت خواپەرستی تەنها بۆ خوا بکرێت و بەس.. بە پاکی و تاکیش هەر بۆ ئەو بکرێت و بەس.. پەرستنەکەش بە مانا بەرفراوانەکەی خودی دینەکەی خوایە، کە بریتیە لە وەرگرتن و پابەندبوون بە هەموو ئیسلامەکەوە، نەك هەر وەرگرتنی لایەنی عەقیدەو خواپەرستیەکان(وەك نوێژو ڕۆژووەکە)! نا، بەڵکو دەربڕینی ملکەچی و گوێڕایەڵی تەنها بۆ خوای

کردگارو پەروەردگار، واتە شوێن کەوتنی بەرنامەکـەی ئـەو، کـە بـۆ مرۆڤایـەتی ناردۆتە خوارێ، پەرستن بەم مانایەیـە، کـە موسـولّمانان تەسـلیم بـە ئـەحکامی قورئانەکەی خوا بن و بەس، لە کورت بینی ئەم دیدو بیروهۆشـەدایە، کـە ئـەمڕۆ هەر وەکو سەردەمانێکی تر، دەبینین زۆر کەس دەڵـێن باوەڕمـان بـە خـوا هەیـەو دەشیپەرستین، بەڵام دەبینین لە هەمان کاتـدا شـەریك بـۆ خـوا بڕیـار دەدەن، بـە تایبەتی لەو لایەنەوە، کە داوەری کێشەکانی خۆیان دەبەنە بـەر یاسـاو ڕێـسایەك، کە مرۆڤ دایڕشتووە، یان بەوەی، کە ملکەچی و گوێڕایەڵی بۆ بیروباوەڕو کەسانێك دەردەبڕن، کە شوێن قورئان و حەدیسی پێغەمبەر (ﷺ) ناکەون! یان بـەوەی دیـدو بیرو باوەڕو ڕێبازو بەهای ڕەفتارو ڕەوشت و داب و نەریتی کۆمەڵایەتیان لە غەیری ئیسلامەکەوە وەردەگرن، ئەمانەش هەمووی پێچەوانەی ئەو باوەڕ هێنانەیانـە بـە خوای پەروەردگار، کە قورئان داوای کردووە، چونکە لەگەڵ ئـەو شـایەتیەی خـوای گەورەدا یەك ناگرێتەوە..

شایەتی خوای پەروەردگار و شـایەتیدانی فریـشتەو زانایـان لەسـەر یـەکبوونی خوای گەورە، لەسەر خوابەیەکناسـین ئـەوە دەسـەلمێنێت، کـە خـوای پـەروەردگار دادپەروەرە، ئەم سیفەتەشی زاتیەو لەگەڵیـەتی، سـیفەتێکی ئـەو خوایەتیەیـەتی، سیفەتێکی ئەو دەسەڵاتەیەتی کە هەیەتی، سـیفەتێکی ئـەو کارگێڕیەیـەتی، کـە ئیدارەی گەردوونی پێ هەڵدەسوڕێنێت، سـیفەتێکی ئـەو ئیدارەشـە، کـە ژیـانی مرۆڤایەتی پێ تاوتوێ دەکات، کەوابوو سیفەتێکی نـەگۆڕی ئـەو شەریعەشـیەتی، کە ناردویێتی بۆ ئەوەی ڕەفتاری مرۆڤ بە بزاوتی گەردوون پارسەنگ کـات، چـونکە هەموو زیندەوەرێکی دیکە لەم گەردوونە بەرفراوانەدا، هەر یەکەیان ڕۆڵێك دەبینن لەسەر یاساو ڕێسایەکی نەگۆڕ دێن و دەڕۆن، بۆیە دەبێـت، ڕۆڵـی مـرۆڤیش لـە ژیانی خۆیدا لەم گەردوونەدا گونجاوی هەمان سیـستمی بونـەوەر بێـت.. ئەمـەش بەوە دەبێت کە بە پێی شەریعەتی خوای دادپەروەر بێت و بچێت.. گەر وای نـەکرد ئەوە واتە ستەمکاریی و دەستدرێژیی. واتە پێککێشرانی بە بزاوتی ئەوانی دیکـە،

واتە بزر بوون و سەرلێشێوانی خۆی و سەرلێتێکدانی ئەوانی تریش!! ئەمەش حەقیقەتێکە، کە خۆمان لە بەدوواداچوونی مێژوودا دەیبینین، هەر کاتێك ئەم مرۆڤایەتیە ژیانی خۆی بە پێی پەیامی خوایی دامەزراندووە دادپەروەربووە، رزق و رۆزی و ئەمانی مسۆگەر بووەو ئاسوودە ژیاوە، چونکە هەموو هەڵسوکەوت و رەفتارێکی لەگەڵ رەوتی گەردوونیدا سازاو بووە، چونکە ئەوەندەی مرۆڤ توانیوێتی ملکەچی و گوێڕایەڵی شەریعەتی خوایی بووەو، خۆی لە گوناح و سەرپێچی و تاوانکاریی بەدوور گرتووە، بۆیە خوای گەورەش زیاتر پێی بەخشیووە.. لە بەرامبەریشدا هەر لە بەدوودا چوونەکەی مێژوودا دەبینین، کە هەر کاتێك ئەم مرۆڤایەتیە لە یاخی بووندا بووەو لە رێبازی خوایی لایداوەو، سەرکەشانە خۆی ملی رێی گرتۆتە بەر، کەوتۆتە لاسەنگی و زوڵم و ستەمکاریی و بێدادیەوە، کەوتۆتە بەر دەستدرێژیی کەسێك، کە تاکڕەوی کردۆتە مۆرکی فیرعەونێتی خۆی! کەوتۆتە بەر دەستی چینێك، یان کۆمەڵە کەسێکی تری ملهوڕ، کە چەوساندنەوە بۆتە سیمای دیارو زەقی دیدو رەفتاریی..

تەنها دادی خواویستیە، کە دوورە لە هەموو حەزێکی خوارو مەیلێکی لادەریی.. تەنها دینی خوایە، کە ناهێڵێت ئەو ملهوڕانە سەرکەشانە هەواو هەوەسی خۆیان بکەنە یاساو رێسا، چونکە لە دینی خوادا، خوای گەورە، خوای هەموانە، خوایەکی کارزانەو هیچ شتێکی، نە لەسەر زەوی و، نە لە ئاسمانەکاندا لا شاراوە نیە، پەروەردگارێتی و کردگارێتیەکەی خوای مەزن، حەتمەن دەسەڵاتی رەهای خواستووە، حەتمەن دادو دانایی خواستووە، بۆیە ئایەتەکە دەربارەی خوای گەورە دەفەرموێ: (لا إِلَـهَ إِلا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ) ئەو باڵادەست ودانایە، دەسەڵات ودانایی هەردووکیان بۆ پیادە کردنی دادپەروەریی پێویستن، چونکە دادپەروەریی ئەوەیە، کە هەموو شتێك لە شوێنی خۆیدا بێت، ئەمەش هێزێکی دەوێت، تا داینێت و مانەوەشی لەو شێوە وکات و ماهیەتەدا بەو بڕو رادە بپارێزێت.. هەموو سیفاتەکانی خوای گەورە ئیجابی وکاریگەرن، لە دیدی ئیسلامیدا سیفەتی خوایی

سلبی نین[١]، کە کەم و کورتی بگەیێنن، ئەوە لە دیدو بیروباوەڕی ئیسلامیدا نیە.. لە دید بیروباروەڕی ئیسلامیدا، سیفاتی خوای گەورە رەهایەو لە هەموویاندا تەواودو،و لە هیچ سیفەتێکیدا کەس نایگاتیّو هاوشێوەو هاوتاو هاوێنەی ئەو نیە..

نرخی ئەم ئیجابیەتیە لە دڵو دەروندایە، لە کارتێکردنو کاریگەرێتیدایە، کە چۆنو چەند دڵو دەروونی موسوڵمان بە خوای خاوەنی دەسەڵاتو داناوە پەیوەست دەکاتەوە.. ئەمەشە کە ناهێڵێت عەقیدەی ئیسلامی ببێتە دیدو تەسەوراتێکی وشكو ساردی زانیاریی، بەڵکو بەو سیفەتانەی خوای گەورە دەیکاتە پاڵنەریی زیندووی ژیان، ئەمەش هەمووی لەوەوە دێت، کە خاوەن عەقیدەکە باوەڕی وا هێناوە، کە خوای پەروەردگار یەکەو کەس، لە هیچ سیفەتێکیدا وەکو ئەو نیە..

کەوابوو تەنها یەك لایەن مافی ئەوەی هەیە خەڵك بکاتە عەبدی خۆی، بیانکاتە پەرستیارانی خۆی، خەڵکی ناچار کات بە حاکم وەریگرنو ملکەچیو گوێڕایەڵی بۆ حوکمی شەرعەکەی دەربڕن، هەر ئەو لایەنەشە، کە ماهیەتی ڕەفتارو ڕەوشتو نەریتی کۆمەڵایەتیان بۆ دیاری دەکاتو، فەرمان بە هەموان دەکات، کە بیگرنە بەرو خۆی پێوە رابهێنن، تەنها ئەو یەك لایەنە بۆی هەیە ژیانی ئەو خەڵکە وا ئاراستەکات، کە لەگەڵ بەرنامەکەی خۆیدا بسازێت.. هەر ئەو یەك لایەنەش پەروەردگارێتیو خواپەرستیان بۆ دیاری دەکات، کە چۆنو کەی دەیکەن؟!

کەوابوو خوای گەورە ئەوی پێی رازیەو لای قبوڵە، یەك عەقیدەیە، عەقیدەیەکە، کە لەسەر خوابەیەکناسینەکی ڕاستو پاك دامەزراوە، لە بەڵگەنەوویستەکانیشی ئەوەیە کە: **(إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّهِ الإِسْلاَمُ) ٣ ال عمران/ ١٩** واتە: ئەو دینەی کە لای خوا پەسەندە ئیسلامەو بەس، ئەو ئیسلامەی، کە لافو

---

[١] ئاماژە رەخنەیە بۆ دیدو بیروباوەڕی مەسیحیەکان بەخوای پەروەردگار، کە لە ئینجیلەکاندا هاتووە، کە گوایە خوای گەورە لە ساتی زۆرانبازیدا لەگەڵ سەیدنا یەعقوب بە پشتدا کەوتووەو هاواری کردووە: هەستەرەوە سپێدەی دا خەڵکی دەمانبینن!! نەعوزوبیللا لە دیدو کوفری وا گەلۆرانە.. یان نەزانین و رق لێبوونەوە لە کەسێك، کە نەیتوانیووە بەرامبەریشی هیچ بکات!!

گەزاف لێدان نیە، ئەو ئیسلامەی شتێك نیەو بە زمـان ڕاگـەیێنرێت و بـەس، ئـەو ئیسلامەی، کـە تـەنها ئالاّیـەك نیـەو بـەرز بکرێتـەوە، تـا لەبەرچـاوی خـەڵکی بشەکێتەوە، تەنانەت بـە تـەنها بـاوەڕێکی نـاخیش نیـە، کـە هەسـت و هۆشـی کەسێکی کردبێتە هەست و نەستی دینداریی، دیسان تەنانەت بریتی نیە لەو نوێژو ڕۆژوو حەجەی کەسانێك بە تـەنها بـۆ خۆیـان ئـەنجامی دەدەن.. نـا.. ئـەوە ئـەو ئیسلامە نیە، کە خوای گەورە ئەو نەبێت، هیچی تر لە بەندەکانی قبووڵ ناکـات، ئەوە ئەو ئیسلامە نیە، کە تەنها دینێکە، کـە لـە لای خـوای گـەورە پەسـەندە.. ئیـسلام بریتیـە لـە خۆبەدەسـتەوەدان! لـە ملکەچـیو گوێڕایـەڵی، ئیـسلام ئـەو بەرنامەیە، کە ئاڕاستەی هەر هەموو لایەنـەکانی ژیـانی تـاكو کـۆ، کۆمـەڵگـەو دەوڵەت دەگرێتەوە، ئیسلام واتە خوایەتیو دەسەلاّتی.. لەم دیدو پێناسەوەیە، کـە هەر جۆرە هاوبەشی کردنێکی تر لە ئاڕاستەی ژیـانی تـاكو کـۆدا، هێنـانی هـەر بەرنامەیەکی تر، هەر یاساو ڕێسایەکی تر، کە مرۆڤـ دایڕشتووە، چوونە دەرەوەیـە لە ئیسلام، پاشگەزبوونەوەیە لێی.. چونکە جگە لەوەی پێچەوانەی ئەو قەناعەتو تێگەیشتنە سەرەتاییە سـەرەکیەی ئیـسلامەتیەکەیە، لـە هـەمان کاتـدا تەسـلیم کردنی دەسـەلاّتی خیلافەتی خوایی لەسەر زەمینـدا بـە کەسـانێکی کـوێرو وێڵـی ناشیو نەشیاو.. ئەوانەی کە دوای بەیعەت دانیان بە خواو ئیعتیراف بە دینی ئەو، پەشیمان بوونەتەوەو هەموو پەیوەندیـەکیان بـە خـوای گـەورەو بـە پیاوچـاکانەوە پساندووەو، لـەم سـەر زەمینـەدا کەوتوونەتـە خراپـەکاریی!! ئـەم خراپەکارییـەی سـەرزەمین هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ تەسـلیمکردنی سـەرکردایەتیو ئاڕاسـتەوانێتی ئەو کوێرو وێڵە ناشیانە! کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بە درێـژایی مێـژووی خـۆی، کـە دەکەوتە خراپەکارییەوە بە هـۆی ئـەوەوە دەبـوو، کـە سـەرکردایەتیەکەی دەدایـە کەسانی وا ناشی و خراپەکار.. بۆیـە ئـاوا دەکەوتـە بـەر ڕەشـەبای کـوێرەوەریی‌و مۆنجی بێ ئامـانی پـشێوییەوە.. چـونکە دەکەوتـە بـەر ئاڕاسـتەی لێـڵو پێـڵو هەمیشەگۆڕ.. هەر جارەو بە سیستمێك، لە دیدێکەوە، بە پێی یاسا گۆڕکێیـەکی

خێرا خێرای ئەو کوێرو وێڵە ناشیانە ئاڕاستە دەکران، کـە بـە درێـژایی مێـژوو بـە ناوی هەڵکەوتوو رواڵەتی فەیلەسووف و کلاوی بیرمەنـد و قـاتی سیاسـەتمەدارەوە دەردەکەوتن و، کاروبارو دۆخەکانیان بە دیدی خۆیان دەگونجاند! بۆیە هیچ شتێکی تاك و کۆ لە شوێنی خۆی دانەدەمەزرا..

ئەم کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیە بە درێژایی مێژووی خۆی، قەت بەختەوەر نـەبووە، هەرگیز ئاستی مرۆڤایەتیەکـەی بـالا نەڕۆیـشتووە، هـەرگیزاو هـەرگیز نەهاتۆتـە ئاستی جێنشینی خواوە لەسەر زەوی، مەگەر لەژێر سایەی ئەم بەرنامـە خواییـەدا نەبێت، تەنها لەبەر سێبەری دینەکەی خوادا، کە بۆ ڕێکخستنی ژیانی تاك و کۆی مرۆڤایەتی دەنارد، ئەم مرۆڤایەتیە جارجـارە بـە گـوێرەی وەرگـرتن و راپەڕانـدنی بەرنامە راست و رەواکەی خواوە بەختەوەر بووە..

خوای گەورە لە شایەتیەکەی خۆیدا ئەوە دەسەلمێنێت، کە ئەو کەسـانەی وەدەم بانگەوازەکەی ئەمەوە نایەن و بەرنامەکەی وەرناگرن، کوێرن.. (أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَى) ١٣ الرعد / ١٩ واتە: چما ئەوی دەزانێـت، کـە ئەوەی لەلایەن خوای گەورەی خۆتەوە بـۆت نێرراوەتـە خـوارەوە هەقـە، وەك ئـەو کەسە وایە کە کوێرە!! مرۆڤ دەتوانێت رۆژانە ئـەم راسـتیە لـە خـەڵکێکی ئـاوادا ببینێت!! رۆژانە دەتوانێت خەڵکێك ببینێت، کە پشتیان لە بەرنامەی خوا کردووەو قبووڵیان نەکردووە، یان پێوەی پابەند نـەبوون و کـەناریان داوە، بـە چ ئاقـارێکی نادیـاردا کوێرانــە دێــن و دەڕۆن.. رۆژانــە دەبینیـت ئەوانــەی دیــنی خوایـان وا وەرنەگرتووە، لە چ ئاڵۆزیەکی دەروون و پشێویەکی ژیندان؟! خـەڵکانێك دەبینیـت بەڕێزترین لایەنیان مەفع بۆتەوە! لەسەر لا دەڕۆن!!

کاتێك دەبینین بە شـایەتی خـوای کـارزان، ئـەو کەسـانەی بەرنامـەی خـوایی وەرناگرن، ئەوانەی ئەو هەقەیان پـێ رەوا نیـە، کـە خـوای کردگـارو پـەروەردگار ناردویێتیە خوارەوەکوێر و نابینان، ئیدی چۆن ئەو کەسەی، کە بە راستی باوەڕی بە خوای کردگارو پەروەردگار هێناوە، باوەڕی بە وەحی خوایی هێناوە، بـاوەڕی بـەوە

هێناوە، کە ئەم قورئانە پەیامی خوایەو بۆ ئەوەی ناردووە بکرێتە بەرنامەی هەموو لایەنەکانی ژیان، ئەو کەسەی ئەمە قەناعەتیەتی چۆن ڕێ بە خۆی دەدات، چۆن پێی ڕەوایە، چۆن پێی ژیرێتیە بڕوات لە کوێرێکەوە بەرنامەی ڕۆیشتن وەرگرێت؟!! چۆن پێی وایە کوێرو وێڵێکی ناشی دەتوانێت بەرنامەی ژیانی بۆ داڕێژێت؟!! بەرنامەیەك، کە هەموو ووردەکاریەکانی ڕەفتارو ڕەوشتی تاك و بەهاو نەریتی کۆمەڵایەتی، هەر وەکو بنەمای فیکرو دیدی سیاسی لەسەر دابڕێژرێت!! ئەمە کەی ڕاستە؟!!

هەڵوێستی ئێمە بە گشتی بەرامبەر بەرهەمی فیکریی غەیرە ئیسلامی ـ نەك لە زانستی ڕووت و بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیاوە ـ لەم ڕوانگەوەیە.. لایەنی دیدو ڕێ شتێکەو، زانستی ڕووت و بەکارهێنانە عەمەلیەکانی شتێکی تر، ئەمەی دووەمیان لە ژیانی هەموو کەسێکدایەو، هەموو کەس بۆی هەیە لە هەر کوێوە بەرهەم هات وەریگرێت، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: (أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأُمُورِ دُنْيَاكُمْ)[1] ئیمامی موسلیم.. واتە: ئێوە لە کاروباری دنیایی خۆتاندا شارەزاترن..

---

[1] جێی سەرسوڕمانە، کە هەندێك خوێندکاریی کەرە سەلەفی هەوڵی ئەوە دەدەات، کە نکوولّی لە سەنەدی ئەم فەرموودەیە بکات بە بەهانەی ئەوەی، کە عەلمانیەکان کردوویانە بە بەڵگەی خۆیان، کە دەبێت دین لە دەوڵەت جیا بکرێتەوە! بەڵام هەردوو هەڵوێستی کەرە سەلەفی و عەلمانیە قەرەچەناغانەکان یەك لە یەك لاوازترە.. چونکە حەدیسەکە سەلمێنراوە، وەکو لە موسلیمدا لە چەند جێیەکدا هاتووە، وەکو لە تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵەوە خوا لێی ڕازی بێت ژمارە (٢٣٦١) و لە ڕافیعی کوڕی خەدیجەوە خوا لێی ڕازی بێت (٢٣٦٢) و لە ئەنەسەوە خوا لێی ڕازی بێت (٢٣٦٣)، جگە لە چەندین ڕێی تری توێژینەوە کە هەمووی ڕاستی سەنەدو مانای حەدیسەکە دەسەلمێنن، کە ئێرە شوێنی ئەو توێژینەوەیە نیە، ئەوەندەش بەسە، کە دوای ئیمامی موسلیم و ئەوەوی یەکێکی وەکو ئەلبانی دوای هێنانەوەی ڕیوایاتی لە عائیشەو ئەنەسەوە خوا لێیان ڕازی بێت ڕەحمەتی دەفەرموێ سەحیحە.. صحيح الجامع ـ ١٤٨٨ ئەوەی عەلمانیەتیش دەیڵێت کوفرە، ئیتر بەهانەی هەبێت، یان نەبێت، چونکە ئیسلام هەر وەکو، کە لایەنی عەقیدەکەی ڕۆشنە لایەنی عیبادەتەکەشی ڕۆشنەو، لایەنی شەریعەتەکەشی ڕۆشنە، پاشان بزوتنەوە بەم سێ ڕوکنەی (عەقیدەو عیبادەت و شەریعەت) کە مانای گشتگیریی دینەکەیە بانگەوازێکی گۆڕانکاریی فیکریی و سیاسی و ڕەوشت و نەریتی کۆمەڵگەیە.. تا ئیسلامەکە لە سیستمی حوکمڕانی خۆیدا، کە خیلافەتە لە دار الاسلامێکدا دەردەکەوێت..

شتێکی نامومکینه موسـولْمانێك دیـنی خـوای وەرگرتبێـت، زانیبـێتی ئـەو هەقـەو، ڕێنمـایی خـوای وا ناسـیبێت، کـه پێغەمبـەر (ﷺ) ڕوونـی کردۆتـەوەو وەریگرتبێت، لەولاوە ڕێ بە خۆی بدات، بچێتە بەر دەستی کوێرێکدا ـ کە خـوای گـەورەو زانـا شـایەتی داوە، کـه کـوێرو نابینایـە ـ وەك قوتـابی دانیـشێت، تـا بەرنامەی ژیانی خۆی و کۆمەڵگەکەی بۆ دیاری بکات!چۆن ئەمـە لـە موسـولْمان دەوەشێتەوە؟! چـۆن موسـولْمان ئـاوا شـایەتی خـوا ڕەت دەکاتـەوەو خۆشـی بـە موسولْمان دەزانێت؟!!

ئێمە دەبێ ئەم دینەی خوا بە جیددی وەربگـرین، دەبـێ بڕیـارە بنبڕەکـانی بـە عەزم و جەزمەوە بێ پەروا ڕاپەڕێنین.. یـەق پێکردنـەوەی هەڵوێـستی دینـداریی، وشڵۆشێواو گرتنی ئەم باسە سەرەکیە، سووك کردنی عەقیدەکەیە، دیـن بەردانـە!! ئەگـــەر ڕەت کردنـــەوەی شـــایەتیەکەی خـــوا نـــەبێت و نەچـــێتە بازنـــەی پاشگەزبوونەوەوە!!

لە هەمووی سەیر تر ئەوەیە، کە خەڵکانێك خۆیان بـە موسـولْمان دادەنـێن و، بەرنامەو پەیڕەوو پرۆگرامی ژیانیان لە فلان و فیسارەوە وەردەگـرن، لەوانـەی کـە خوای گەورە دەرهەقیان شایەتی دا، کـە ئەوانـە کـوێرن، نابینـان، وێڵـن!! کەچـی لەملاشەوە هەر خۆیان بە موسولْمان دادەنێن!! ئەمە چۆن دەشێت؟!!

ئەم دینە هەموو شتێکی جیددیە، جێـی گاڵتـەو سـوعبەتی تێـدا نابێتـەوە.. سەرڕاستیە، جێی ملبادان و خۆدزینەوەی تێدا نیە، هەر هەموو دەقەکانی هـەقن، هەر هەموو حەقیش وا لە هەر یەکێك لە دەقەکانیـدا، وا لـە هـەر ووشـەیەکیدا، ئەوی ئەم جیددێتی و سەرڕاستیە لەخۆیدا نابینێت، تا بێـت و دینەکـە وەرگرێـت، دینەکە پێویستی نە بەوو نە بە هەموو جیهانیانە.. چونکە خوای خـاوەن دینەکـە پێویستی بە کەس نیە.

ژیانی خەڵکی بێ بەرنامەی خوایی ناسـازێت، بـێ هـەبوونی پێـشەوایەتیەکی خاوویست دانامەزرێت، پێشەوایەتیەك، کە لەسەر ڕێبازی خوا بڕوات و بە دیـدی

دینەکەی ئەو ببینێت، بە پێی ڕێنمایی خوایی پێ هەڵهێنێتەوە، تا بە گوێرەی ڕێسای شەریعەتەکەی ئەو، یاسا بۆ ڕێکخستنی کاروباری ڕۆژانەی داڕێژێت.. ژیانی مرۆڤایەتی بە پێشەوایەتی کوێرو وێڵ ڕوو لە ڕاستی ورەوایی ناکات، ڕوو لە ئاسوودەیی ناکات،

ئەو پێشەوایەتیە کوێرانە نازانن چ خێرو خۆشیەك وا لە بەرنامەکەی خوادایە کە بۆ پێغەمبەری پێشەوای (ﷺ) ناردووە! نازانن کە هەموو هەق وا لە دینەکەی ئەودایە، نازانن، کە نە دەرەبەگایەتی و سەرمایەداریی و، نە کۆمۆنیستی و سۆشیالیزمی زانستی! کێشەی ژیانی پێ چارەسەر ناکرێت.. چونکە بەرنامەی ئەوانە کێ دایڕشتووە، بەرنامەی ئەو کەسانەیە، کە پەییان بەوە نەبردووە، کە محمد (ﷺ) لە خوای کردگارو پەروەردگاری جیهانیانەوە هێناویەتی، نازانن تەنها ئەوەی ئەم هەقەو ناشێت و ناکرێت و نابێت کەس لێی لابدات.. ژیان بە تیۆکراسی ناڕوات بەڕێوە، هەر وەکو، کە بە دیکتاتۆرییەتی و دیموکراسییەتی ناڕوات بەڕێوە، هەر هەموویان بەرنامەی کوێرو نابینایانن، هەمووی هی ئەو کەسانەن، کە لە ناو خۆیاندا خوایان لە جێی خوای کردگارو پەروەردگار داناوەو، مافیان داونەتێ بەرنامەی ژیانیان بۆ داڕێژن!! سیستمی حوکمڕانی و یاساو ڕێسای لایەنەکانی تر داڕێژن.. دوور لە دینی خوا، دوور لە ڕەزامەندی خوای کارزان.. تا ملکەچی و گوێڕایەڵی خەڵکەکە بۆ ئەو خوادەسکردانە مسۆگەر کەن..

زەقترین نیشانەی ئەوەی، کە لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتە قورئانیەدا دەیلێین، ئا ئەو هەموو خراپەکارییەیە، کە سەرزەمینی تەنیووە، ئا ئەو نەهامەتی و کوێرەوەریەیە، کە باڵی ڕەشی لە ڕۆژهەڵات ورۆژئاوادا بەسەر مرۆڤایەتی ئەمڕۆدا کێشاوە.. چ ئەوانەی وان لەژێر سایەی دەرەبەگایەتی و سەرمایەداریدا، چ ئەوانەی وان لەژێر سایەی کۆمۆنیستی و سۆشیالیستی زانستیدا، یان ئەوانەی وان لەژێر پۆستاڵی دیکتارتۆرێتیدا هەموویان وەکو یەکن، لە هەموویاندا مرۆڤایەتی جۆرەهای جیاواز لە کوێرەوەریی و نارەحەتی و پشێوی دەچێژێت، لە هەموویاندا لە خەم و پەژارەی

ڕۆژانەدان.. چونکە بەرنامەکان، کوێرەکان دایانناوە، ئەوانەی پەی بەوە نابەن، کـە لـە خوای کردگارو پەروەردگاری جیهان وجیهانیانەوە بۆ محمد (ﷺ) هاتووە، یان نازانن کـە دەبێ بەو دینەی ئەوەوە پابەند بن و شەریعەتەکەی ئەو ڕاپەڕێنن.. نازانن کە ژیـان لـە سایەی شەریعەتی دادو ڕەوایی ئەودا ئاسوودانە دادەمەزرێت.. نـازانن کـە موسـوڵمان هەر لەسەرەتایەوە بە پێی سروشتی دین و دینداریەکەی، هەموو بەرنامەیەکی تر ڕەفـز دەکاتەوە، کە پێچەوانەی دینەکەی محمد (ﷺ) بێتەوە، چـونکە لـەوەیان دڵنیایـە، کـە ئەوەی بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) هاتووە، هـەر ئـەو هەقـەو، هـەر ئـەو ڕاسـت و ڕەواو دادپەروەرییە.. ئیدی هەرچی بەرنامەو ڕێبـازی دی هەیـە، هەرچـی دیـدی سیاسـی و بانگەوازی تری گۆڕانکاریی هەیە، هەرچی سیستمی سیاسی و ئابوری دیکە هەیە، کـە مادام لەگەڵ شەریعەتەکەی خوادا یـەك ناگرنـەوە، وەکـو پێغەمبـەری پێـشەوا (ﷺ) هێناویێتی ڕەفزە. موسوڵمان سوورە لەسەر ئەوەی، کە تەنها دیدو بـیری ڕاسـت، تـەنها ڕێبازی سیاسی ڕاست، تەنها ڕەفتارو ڕەوشتی ڕەسەن، تەنها نەریتی پەسـەند ئەوەیـە، کە لە شەریعەتی خواوە وەرگیرا بێت، کە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) ڕوونی کردۆتـەوەو لە ماوەی ژیانی پیرۆزی خۆیدا لە واقیعی کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتیدا چەسپاندوێتی..

موسوڵمان قەناعەتی تەواوی بەوە هەیە، کە تەنها ئیعتیراف کردنی بە ڕەوایـی هەبوونی بەرنامەیە، پەیڕەوو پڕۆگرامێکی دیکە، بە بەهاو نـەریتێکی دیکـە، بـە سیستمێکی سیاسی، یان ئابوری، یـان کۆمەڵایـەتی دیکـە لـە دەسـکردی مـرۆڤ ئیعـتیراف کردنـە بـە ڕەوایـی ملکەچـی دەربـڕین بـۆ غـەیری خـوای کردگـارو پەروەردگاریش! ئەمەش کوفرەو چوونە دەرەوەیە لە ئیسلام! چونکە ئیـسلام پـێش هەموو شتێك خۆ تەسلیم کردنە بە خوای کارزان، ملکەچی دەربڕین و گوێڕایەڵییە بۆ خوای کردگارو پەروەردگارو پەرستراو، ڕوو وەرگێڕانە لە خوایـانی تـرو ڕوو لـەو کردنەو بەس.. هەر جۆرە ئیعتیرافێك لەلایەن موسوڵمانەوە بـە ڕەوایـی هـەبوونی بەرنامەیەکی تـر بـۆ ڕێکخـستنی ژیـانی مرۆڤایـەتی، حەتمـەن دژایـەتی کردنـی سەرەتاییترین مانای سەرەکی ئیسلامەتیە، لـە هـەمان کاتیـشدا تەسـلیم کردنـی

جێنشینێتی خوای گەورەیە، کە دەبێت لەسەر زەمیندا هەبێت بە کەسانی کوێرو وێڵ و ناشی! بەو کەسانەی، کە ئەم هەموو خراپەکارییانەی سەرزەمین بەوانەوە پەیوەستەو هەمووی زرکەتاڵ و ژەقنەبووتی بەرنامەڕێژی ئەوانە.. تالآوی ناڕاستەوانی ئەوانە وا بە گەرووی ووشکی مرۆڤایەتیدا دەچێتە خواردەوە!! بۆیە نەك هەر نابێت ئیعتیراف بە ڕەوایی هەبوونی بەرنامەی ئەو کوێرو نابینایە بگیرێت، بەڵکو پێویستە ڕێشیان لێ بگیرێت و، نەهێڵرێت ئەوەندەی تر ئەم مرۆڤایەتیە چەواشەکراوە بە دوویاندا بەردو کوێرەوەری تری دوور لە بەرنامەی خوایی کێش کرێن.. تا زووتر بتوانرێت بەرنامەی خوایی بەو خەڵکە بناسرێتەوەو، بەرەو ئاسوودەیی ژێر سایەی وەحی خوایی بهێنرێنەوە، هەر وەکو ئەو قۆناغانەی مێژوو، کە جارجارە لەژێر سایەی وەحی خواییدا دەحەوانەوەو ئاسوودە دەبوون..

# بەندی پێنجەم: خوابەیەکناسین سرووشتە

خـوای گـەورە کێـشەی خوابەیەکناسـین لـە لایـەکی تـرەوە نیـشان دەدات، لەلایەنێکی بەرفراوان و دوورمەداوە، لەلایەنی سروشتی خودی مرۆڤـەوە، کـە لـە جیهانی ئەزەلیی یەکەمیاندا پەیمانی سەرەتایی پێش خەڵق بوونیـان لێ وەرگـرتن، پێش ئەوەی دروستیان کات..

ئیعتیراف کردن بە کردگارێتی خوا شتێکی سروشتیەو لە کیانی مرۆڤدا هەیـە، بەڵگەنەویستێکەو خوای گەورە لە کیانی ئەو مرۆڤەدا بـە ئاشـکرایی خـستویەتیە روو، بۆیە داوای لێ کرد، کە شایەتی لەسەر ئەوە بدات، کە لە ناخی خۆیـدا لـەوە دڵنیایە، کە خوایـەکی کردگـار هەیـە شـایانی پەرسـتنە، شـایانی ملکەچـی بـۆ دەربڕینە، ئەمەی لە ناخی خۆیدا لا قەناعەت بوو.. بەڵام کە بەردەوامیش پەیامی خوایی بۆ دەهات، هەر بۆ بیرخستنەوەی بوو، بـۆ مـژدەدان و هۆشـیار کردنـەوەی بوو، تا ئەوانەی لایانداوە بێنەوە سەر ڕێ سروشتیەکەی یەکەمین جاریـان، چـونکە ئەو لاڕێیانە بەردەوام پێویستییان بە بیرخستنەوەیان هەیە..

خوابەیەکناسین پەیمانە، تەنانـەت ئەگـەر خـوای پـەروەردگار بـە لـوتفی خـۆی پێغەمبەران و نێرراوە بـەڕێزەکانی خۆشـی نەناردایـە، تـا بـیری خـەڵکی بخەنـەوەو هۆشداریـیان دەربارەی بدەنێ، بەڵام ڕەحمەت و بەزەیی خـوا وای دەخواسـت، کـە بـە سروشتی خۆیانیان نەسپێرێت، تا سەرلێشێواو نەبن. وای دەخواسـت، کـە نەیانداتـە دەست ژیریی و بیری خۆیان، کە پێی داون، نەبادا گومڕا بن، بەڵکو نێرراوانی خۆیـان بەردەوام بۆ بنێرێت، تا مژدەدەرو هۆشدەر بن بۆیان، تا هیچ بەهانـەو هەنجـەتێکیان لە قیامەتدا بەدەستەوە نەمێنێت، کە بڵێن خوایە نەمادەزانی چۆن بتپەرستین!!

﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِـرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى شَهِدْنَا أَن تَقُولُواْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ﴾ ٧ الاعراف/١٧٢ واتـە:

یادی ئەو کاتە بکەرەوە، کە خواکەت نەوەی پشتاوپشت و ڕەچەڵەکی ئادەمیزادی کۆکردەوەو بە شایەت لەسەر خۆیانی گرتن، کە چما من خواتان نیم؟! هەموو ووتیان: بەدی، خوایە ئێمە شایەتی دەدەین.. فەرمووی: پاشان لە قیامەتدا نەڵێن: ئێمە لەم باسە بێ ئاگا بووین!!

ئەمە کێشەی نێوان سروشتو عەقیدەکەیە، کە خوای گەورە لە دیمەنێکی دەگمەندا نیشانی دەداتەوە، دیمەنی هەموو نەوەی ئادەم، لە جیهانێکی نادیاردا، پێش ئەوەی لە پشتاوپشتی بابو باپیرانیاندا خەلق ببن و، پێش ئەوەی چاو بە دنیادا هەڵهێنن.. هەموو لەبەردەست خوای کردگارو پەرستراودان.. جەنابی ئاوا لێیان دەپرسێت: چما من خواتان نیم؟! هەموویان بێ چەندو چوون، دەڵێن: بەدی، هەر جەنابت خوامانی.. هەموو ئیعتیراف بە کردگاریتی ئەو، بە پەروەردگاریتی ئەو، بە یەکبوونی ئەو دەکەنو لەو جیهانی نادیاری ڕەچەڵەکیەدا، شایەتی دەدەنو شایەتیەکەیان تۆمار دەکەن..

ئەمە دیمەنێکی گەردوونی بە هەیبەتو سەرسوڕهێنەرە، زمان ناتوانێت بە ووشەی خۆی ئەو وێنەیەی بکێشێت، کە لە ڕێی هەواڵی ڕاستەوە نەقڵ بووە، دیمەنێکە بە لای ژیریی مرۆڤەوە چەند خەیاڵ فراوان بێت، هەتا بیری لێ بکاتەوە سەیرو جێی تێڕامانە! هەر بیرکردنەوە لە کۆبوونەوەی ئەم هەموو سێڵەی جەستەی مرۆڤ، نە مرۆڤ و دوو، نەگەلێكو دوو، نە نەوەیەكو دوو، سێڵی جەستەی هەر هەموو ئادەمیزاد، کە لە ژمارە نایەن، کۆدەکرێنەوەو دەدوێنرێن! وەکو ژیر لێیان دەپرسرێت! ئینجا بەوپەڕی تواناياکەوە، کە خوای کردگاری گەردوونو ژیانو مرۆڤ تێیدا خەلق کردوون، ژیرانە وەڵام دەدەنەوە، وەڵامێکی ژیرانەش دەدەنەوە، ئیعتیرافی واقیعێك دەکەن، ئیعتیراف بە حەقیقەتێکی ڕەها دەکەن: بەدی. هەر جەنابت خوامانی.. شایەتی دەدەن، پەیمانێك دەدەن، خوای گەورەش ئەو پەیمانانەیان لەو جیهانی ڕەچەڵەکە نادیارەوە لێ وەردەگرێت.. !!

مرۆڤی ئیماندار، کە خەیاڵ لەو دیمەنە دەکاتەوە، لە ناخیدا دەلەرزێت.. بە هەیبەت و سامەوە سەیری ئەم دیمەنە سەرسوڕهێنەرە دەگمەنە دەکات، بە خەیاڵێکی قووڵ و بەرفراوان سەیری ئەو هەموو نەوەیە دەکات، لە یەك ساحەی پڕ سام و هەیبەت و مەزنییدا، کڕو کپ کۆبوونەتەوە، هەر هەموو ئادەمیزاد بە هەر هەموو جەستەیانەوە، هەر جەستەیەك بە هەر هەموو سێلێکەوە، کە تێیدا بووە، هەر سێلێك بەو هەموو ئامادەباشییەوە، کە تێیدابووە!! هەر هەموو لەم دیمەنەدا کۆبوونەتەوەو بە یەکجار پێیان دەوترێت: مەگەر من خواتان نیم؟! هەر هەموو بە یەکجار پەیمان و بەڵێن و بەیعەتێك دەدەن، شایەتی دەدەن: بەدی.. هەر جەنابت خوامانی و بەس[1]!!

---

[1] قورئانی پیرۆز ئەم دیمەنە سەرسوڕهێنەرو بە سام و هەیبەتە بە دەگمەنەی ئەو سەردەمە دوورو پەنهانەی ناخی مرۆڤایەتی بە ووردی باس کردووە، ئەوەی باس کردووە، کە چۆن ئیعتیرافێکی وا، شایەتیەکی وا، تەسلیم بوونێکی وا لە ناخی ناوەوەی سروشتی ئەم مرۆزایەتیەدا بووە، لە ناخی ناوەوەی هەبوونێکی نادیاردا، قورئانی پیرۆز پێش چواردە سەدە لەمەوبەر ئەم دیمەنەی بە نایەتی قورئان خستۆتەوە روو، کە لەو زەمانەدا هێشتا مرۆزایەتی هیچ وای دەربارەی چۆنیەتی پەیدابوونی مرۆزایەتی نەدەزانی، هیچی دەربارەی حەقیقەتەکانی بوون و ژیان نەدەزانی، کەچی ئەوەتا دوای ئەو هەزارو چوارسەد ساڵە (زانست) ڕێی بەرەو ئەو حەقیقەتانە دەچێت و لایەنێك لەو راستیە جەوهەرییانە، لەو سروشتە دەخاتە روو کە کرۆمۆسۆساتەکان، کە سێلی وەچەن، بریتین لە سجلێکی گەورەو هەرچی سیفاتی باوك و باپیران هەیە بۆ نەوەکانی دواتریانی نەقڵ دەکەن!! ئێستا (زانست) ئەوە دەسەلمێنێت، کە ئەم جیناتانەی هێشتا لە پشتاو پشتی باوکاندان، هەر هەموو سیفەتەکانیان لە خۆ گرتووەو بە ئەمانەتەوە بە نەوەی دوایی ئەو باب و باپیرانەیانی دەگەێنن!! ئێستا (زانست) لایەکی ئەوە دەردەخات، کە ئەم کرۆمۆسۆماتانە دەتوانن سیفەتی سێ ملیار (سێ هەزار ملیۆن) مرۆڤ لەخۆ بگرن و نەقلی کەن!! لە کلتێکدا کە کرۆمۆسۆمەکان لە سانتیمەترێك دووجا بچوکترن!! یان هەر هەموو ئەوانەی ئەو برە سیفەتانەیان لە کەسێکدا هەلگرتووە، ناکەنە سەری سوژنێك، یان دەرزیەکی سنجاق!! ئەم قسەیە ئەگەر پێش هەزارو سێسەد ساڵ لەمەوبەر بە مرۆڤایەتی بووترایە، خاوەنەکەیان بە شێت و خەیاڵپلاو ناوزەد دەکرد!! بەڵام هەر خوای کارزان ڕاست دەکات دەفەرموێ: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ) ٤١ فصلت/٥٣ واتە: لە داهاتوودا نیشانەکانی خۆمانیان کە لە خۆیان و ئاسۆدا هەن، نیشان دەدەین، تا بزانن خوا هەقە..

ئیبنو جەریری تەبەری وئەوانی دیکە بە سەنەدەوە لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕاویتیانەتەوە کە فەرموویەتی: خوای گەورە دەستی بە پشتی ئادەمدا هێنا، هەرچی نەوەیەکی تا ڕۆژی قیامەت لێ پەیدا دەبێت هاتە دەرەوە، ئینجا خوای گەورە پەیمانی لێ وەرگرتن و شایەتی پێدان کە مەگەر من خواتان نیم؟ هەموو وتیان: بەدی.. جەنابت خوامانی) ئیبنو کثیر دەفەرموێ ئەم ریوایەتە مەرفوعەو مەوقوفیشی هەیە.. مەوقوفەکانی زیاترن، بۆیە خۆشی ئەویانی هێناوەتەوە[1]..

---

[1] مەسەلەی شایەتی پێدان و پەیمانی یەکەمینی مرۆڤ لە سەردەمانی پشتاو پشتی ئادەمدا سەلامی خوای لێ بێت، کە خوای گەورە لە قورئاندا باسی فەرمووە، لە عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا شتێکی سەلمێنراوە، لە عەقیدەی تەحاویدا لەژێر ناونیشانی (المیثاق الذي أخذه الله تعالى من آدم وذريته حق) هاتووەو ئوممەتی ئیسلام لەسەری ڕێکن، کەس نکوولی لێ نەکردووە، بەڵام لە لێکدانەوەو ڕاڤەیدا ڕاجوێ بوون.. چونکە جگە لەوەی لە ئایەتی قورئاندا هاتووە کۆمەڵێك حەدیسی سەحیحی پێغەمبەری پێشەواشی (ﷺ) لەسەرە.. هەندێك ئەوەیان بۆ نەسەلماوە، کە ئەم کۆکردنەوەی زوڕییەتە بە واقیعی و ڕاستی بێت، بەڵکو پێیان وایە، کە ئەمە ئاماژەیەکی واتاییە بۆ پەیمان لێوەرگرتنیان، بەڵام ئەهلی سوننەت و جەماعەت وەکو شێخ سەفەر الحەوالی نەقڵی کردووە لەسەر ئەوە کۆکن، کە ئەمە هەر وەکو دەقە پیرۆزەکان ڕوونی دەکەنەوە، حەقیقەتێکی واقیعی بووەو هیچ پێویست ناکات ببرێتە لایەنی واتایی.. هەر وەکو لە پەراوێزی ڕابووردوودا ژمارە ٥٢ ئاماژەیەکی خێرامان پێدا، ئەمە نەك هەر بۆ خوای خاوەن دەسەڵات سەخت نیەو تێگەیشتنیشی لەم سەردەمی کەشف کردنی کرۆمۆسۆماتەدا سەخت نەماوە.. بەڵام ئەوەی پێویستی بە تەئکید کردنەوە هەیە لێرەدا ئەوەیە، کە خوای پەروەردگار ئەم شایەتی دان و پەیمان لێوەرگرتنەی لێ نەکردوونەتە هۆکاری دینداریبان، تا لەسەری موحاسەبەیان بکات، بەڵکو نێرراوانی خۆی بۆ ناردوون و موحاسەبە کردنەکەیانی لەسەر هەڵوێستیان لەو پێغەمبەرە نازدارانە دامەزراندووە، وەکو کە لێیان دەپرسێتەوە کە (مَاذا أَجَبْتُمُ الْمُرْسَلِينَ) ٢٨ القصص/٦٥ واتە: چۆن وەڵامی پێغەمبەرانتان دایەوە؟! یان: (فَلَنَسْأَلَنَّ الَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْأَلَنَّ الْمُرْسَلِينَ) ٧ الاعراف / ٦ واتە: حەتمەن پرسیار لەو خەڵکە دەکەین، کە پێغەمبەرانمان بۆ ناردوون ولێیان دەپرسینەوە و لە پێغەمبەرەکانیش دەپرسین (کە چۆن و کێ وە دەنگ بانگەوازە خواییەکەتانەوە هات؟! ).. هەروەها کە دەفەرموێ نێرراوانمان وەك مژدەدەرو هۆشدەر ناردووە، تا لە قیامەتدا خەڵکی بەهانەی ئەوەیان نەمێنێت، کە خوایە نەماندەزانی چی بکەین و چۆن بتپەرستین!! وەك دەفەرموێ: (رُسُلاً مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ) ٤ النساء/ ١٦٥..

بەڵام ئەو دیمەنە چۆن بووە؟ چۆن ئەو پەیمان و بەڵێنەی لەو هەموو نەوەی ئادەمــە وەرگرتوودو کردوونی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە؟! چــۆن بــە هــەموویانی فــەرمووە: مەگەر خواتان نیم؟! چۆن ئەوانیش هەموو پێکەوە یــان بــە جیــا ووتویانــە: بــەدی!! بەهەر حاڵ ئەم وەڵامانەش وەکــو دیمەنەکــەو ڕوودانــی هــەر نادیــارن و هــەر خــوای کردگارو پەروەردگار خۆی دەیزانێت چۆن بوون.. بیرو ژیریی مــرۆڤ، مــادام پــەی بــە زاتی خوا نابات کە چیەو چۆنە، پەی بە کارو کردەوەشی نابات تا بزانێت ئــەوە چــۆن ڕوویداوە.. چونکە زانینی چۆنیەتی، بەشــێکە لــە زانــینی ماهییــەتی شــت.. بۆیــە هەرچی شتێك کــە بــۆ خــوا دەگەڕێتــەوەو ماهییەتەکــەی نــازانین، ناشــبێت وا بــیر کەینەوە، کە دەگەینە زانینی چۆنیەتەکەی! نا.. وەکو ئەو ئایەتەی کــە دەفــەرموێ: (ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ)٤١ فــصلت/ ١١ واتە: پاشان بەرزبۆوە بۆ ئاسمان کــە دوکەڵێك بوو.. هەروەها ئایەتەکانی تری وەکو: (ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ) الاعــراف/٥٤ یان (يَمْحُو اللَّــهُ مَــا يَــشَاءُ وَيُثْبِــتُ) الرعــد/٣٩ واتــە خــوای گــەورە ئــەوی دەیــەوێت دەیسڕێتەوە یان دەیچەسپێنێت، یــان: (وَالــسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّــاتٌ بِيَمِينِــهِ) ٣٩ الزمــر/٦٧ واتە: ئاسمانە، کان لوول کراون بە دەستی ڕاستیەوە!! وە هــەروەها دەقــەکانی تــری قورئان، کە هەموویان هەق و ڕاستن، کەوابوو حەتمەن دەبێت پێیــان تەسـلیم بــین و باوەڕمان وابێت، کە هەن و ڕوو دەدەن، بێ ئەوەی هەوڵی ئەوە بــدەین، کــە بــزانین چۆن.. چونکە مــاهیەتەکان نازانین، کەوابوو چۆنیەتەکانیش پــەی پــێ نابــەین، بــە تایبەتی، کە لەوە دڵنیاین، کە هیچ شــتێك هاووێنــەی خــوای گــەورە نیــە، هــیچ شتێك هاوشێوەی خوای کارزان نیە.. ئێمە ماهییــەتی زاتی خوای پەروەردگار، کــە نازانین، چۆن تەســەوری ســیفەتەکانی دەکــەین؟! چــۆن دەزانــین کــارو کردەوەکــانی چۆنن؟! جەنابی ئەو، کە هیچ زاتێك لە شێوەی ئەو نیە، ئیدی چۆن تەســەوری زات وسیفات و کردارەکانی دەکرێت؟! حەتمەن ناکرێت. کەوابوو ڕێیەیــەکی تــر غــەیری تەســلیم بــوونی تــەواو بــە دەقــەکانی وەحــی لــەم باســەدا نیــە. هــەر ڕەنــج و هەوڵدانێکیش بــۆ زانــینی چــۆنیەتی کردگــارێتی، چــۆنیەتی خــەلق کردنــی، یــان

چۆنیەتی هەر سیفەتو کارێکی تری گومڕا کردنو وێڵبازییە.. چونکە هەر لە سەرەتاوە زانراوە، کە ماهییەتی جەنابی ئەو، هاوشێوەو هاووێنەو هاوتای نیە.. بۆیە ئەو فەیلەسووفو بیرمەندانەی خۆشیانو خەڵکی تریشیان لەم باسەدا ماندوو کرد، وێڵ بوونو نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێك، هەرچی ئەمڕۆ دەیانووت کۆتایەو دەستمان لێی گیر بووە، سبەی بۆیان دەردەکەوت، کە هێشتا هەر لە مۆنجی گوماندا خول دەخۆن!

لێکدانەوەیەکی تریش هەیە بۆ ئەم دەقە، کە دەڵێت: ئەو شایەتی دان و پەیمانەی خوای گەورە لە نەوەی ئادەمی وەرگرت، لەگەڵ سروشتیانیدا هەستی وەڵامدانەوەی باوەڕو دینداریی راستی تێدا خەلق کردن. واتە وای دروست کردوون، کە خۆیان هەر لەسەرەتایانەوە باوەڕیان بە خوابەیەکناسین هەبوبێت، هەر لە سەرەتایانەوە زانیویانە، کە خوا هەیەو کردگارو پەروەردگارەو هیچ هاووێنەیەکیشی نیە.. ئینجا دوایی بە هۆی کەسانی تری کاریگەرەوە، خراپەکار دەردەچنو سەرپێچی لە فەرمانی خوا دەکەنو لەو سروشتە دینداریەیان دەردەچن..

ئیمامی ئیبنو کەثیر لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێ: ئەوانەی سەلەف و خەلەف، کە فەرموویانە مەبەست لەم شایەتی پێدانە، دروست کردنیانە لەسەر بناغەی یەکخواناسین .

ئەو پەیماندانەی نێوان مرۆڤ و خوای کردگار، لە ناخی مرۆڤدا ڕوواوە، لە هەموو سێلێکی جەستەیدا هەر لەو کاتەوەی دروست بووە، هەیە، ئەوە پەیمانێکە لە پەیامی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت کۆنترە، هەموو سێلێکی جەستەی ئەم مرۆڤە شایەتی ئەوە دەدات، کە خوای کردگار خوایەکی تاكو پاکەو ویستو دەسەڵاتی سەربەستو پایەدارە، وویستی وا بووە، کە هەموو گەردوونو مرۆڤ و ژیان بەو شێوەیە دروست کاتو یاساو رێسایان بۆ دانێت، تا بە پێی ئەو یاساو رێسایە هەڵسوڕێنو پێك نەکێشرێن.. بۆیە دوای ئەم شایەتیدانە، دوای ئەم پەیمان دانە، کەس بۆی نیە بە زمانی حاڵ، یان بە قسە هاواری لێ‌هەستێتو بڵێ: خوایە

من بێ ئاگام و هیچم نەزانیوە!! بەڵێ: خوایە لە هاتنی پەیامی جەنابت و لە ڕێبازی پێغەمبەرانت بێ ئاگا بووم، لەو دینە بێ ئاگا بووم، کە خەڵکی بەرەو یەکخواناسین بانگ دەکرد، بۆیە بە نەزانی کەوتمە شیرکەوە!! یان بڵێ باوك و باپیرانی خۆم لەسەر ئەو شیرکە بینی و منیش شوێنیان کەوتم!! کەسیش نەبوو تێم گەیێنێت، کەسێك نەبوو ڕێی یەکخواناسینم بۆ شی کاتەوە!![1] ئیدی من بۆچی بەرپرسیارم؟ بەڵام لوتف و بەزەیی خوای گەورە وای خواست، کە پەیامی خۆی بە نێرراوانێکدا بنێرێت، کە هەر لەناو ئەو خەڵکەوە هاتن و پێشتر خۆو نەسەب وکەسوکاریان ناسراو بوون، تا خەڵکی بەرەو یەکخواناسین بێنەوە.. (وَكَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ) ٧ الاعراف/١٧٤ واتە: ئاوا نیشانەو بەڵگەکانمان بە دووروودرێژیی باس دەکەین، تا بەرەو لای خوا بگەڕێنەوە.. تا بگەڕێنەوە سەر سروشتەکەی خۆیان[2].. بگەڕێنەوە سەر هەستی پاك و هێزی ئیدراك و پەی پێ بردنەکەی سەرەتایان.. گەڕانەوە سەر ئەمان زامنە بۆ گەڕانەوە سەر

---

[1] لە هەردوو سەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ) واتە: هەموو زارۆکێك لەسەر سروشتی ئیسلامەتی لەدایك دەبێت، بەڵام دایك و باوکی دەیکەنە جولەکە، یان دیان، یان ئاگرپەرست..

[2] لە سەحیحی موسلیمدا لە عەیازەوە خوا لێی ڕازی بێت گێڕراوەتەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی (يَقُولُ اللهُ: إِنِّي خَلَقْتُ عِبَادِي حُنَفَاءَ، كُلَّهُمْ فَجَاءَتْهُمُ الشَّيَاطِينُ فَاجْتَالَتْهُمْ عَنْ دِينِهِمْ وَحَرَّمَتْ عَلَيْهِمْ مَا أَحْلَلْتُ لَهُمْ) خوای گەورە دەفەرموێ: من خۆم بەندەکانی خۆمم ئارەزوومەندی دینی حەق دروست کردووە، کەچی شەیتانەکان هاتنە لایان و ڕایانپسکاندن و لە دینەکەیان دوور خستنەوەو، ئەوی بۆم حەڵاڵ کردبوون لێیان حەرام کردن..

ئیمامی ئەحمەد ڕحمە اللە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (يُقَالُ لِلرَّجُلِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ لَكَ مَا عَلَى الأَرْضِ مِنْ شَيْءٍ أَكُنْتَ مُفْتَدِيًا بِهِ؟ فَيَقُولُ: نَعَم! فَيَقُولُ: قَدْ أَرَدْتُ مِنْكَ أَهْوَنَ مِنْ ذَلِكَ، قَدْ أَخَذْتُ عَلَيْكَ فِي ظَهْرِ آدَمَ أَلَّا تُشْرِكَ بِي شَيْئًا فَأَبَيْتَ إِلَّا أَنْ تُشْرِكَ بِي) متفق علیه، واتە: لە ڕۆژی دواییدا بە کەسێکی دۆزەخی دەوترێت: ئەرێ ئەگەر بە قەدەر زەوی سامان و ماڵت ببوایە، ئێستا دەتکاتە قوربانی خۆت؟ دەڵێ: بەڵێ! خوای گەورە پێی دەفەرموێ: بەڵام بە تەئکید من لەوە کەمترم لێ داوا کردیت، هەر لە پشاوپشتی ئادەمەوە داوام لێ کردیت، کە شەریك بۆ من بڕیار نەدەیت، کەچی گوێت نەدایەو هەر کردت!!

یەکخواناسیینەکەیان، بەڵام خوای گەورە دوای ئەوە نێرراوانی خۆی هەر بـۆ نـاردن تا مژدەو هۆشداریان بەردەوام بخەنە پێش..

ئەمە پەیمانی سروشتە، کە لە ناخی هەموو زیندەوەرێکدا رواوە، هەر یەکـەیان گەر لێی گەڕێن خوای کردگاری خۆ دەناسێت و بە خواپەرسـتیەکی راسـتەوە رووی تێ دەکاتەوە.. ئەم سروشتە پاکە خۆی برسـی ئـەو خواناسـیین و خواپەرسـتییەیە! خۆی شەیدای خواوویـستیە، بەڵام بە بێ کەسی گومڕا دەبێت، لاڕێ دەکـەوێت، لـە خۆشەویستی و مەزنداریـیدا دەکەوێتە دانانی شەریك بۆ خوای گەورە..

ئەم پەیمانە سروشتیە گرنگە، ئەمە هەر ئەوەیە، کە خوای گەورە مرۆڤی هانـدا لەسەری، کە ئەگەر بیپارێزێت و لەسەری بـەردەوام بێـت، خـوای گـەورە دەیکاتـە جێنشینی خۆی: (فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَـا تَبْـدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَـيِّمُ وَلَكِـنَّ أَكْثَـرَ النَّـاسِ لَـا يَعْلَمُـونَ) ٣٠ الـروم / ٣٠ واتـە: ئارەزوومەندانە روو لە دینەکەی خوا کە، ئەو دینەی کە خوای گەورە ئاوێنەی ئـەو سروشتەی کردووە، کـە خـەڵکی لەسـەر دروسـت کـردووە،، بـە هـیچ شـێوەیەك گۆڕانکاریی لە خەڵقی خوادا ناکرێت، ئەوە دینی راست و دروستە، بەڵام زۆرینـەی خەڵکی نایزانن..

ئەم دینە قەڵای پاراستنە لە رەشەباو گەردەلوولی هەواو هـەوەس، ئـەو هـەواو هەوەسەی، کە ناهێڵێت کەس پشت بە هەق ببەستێت و خۆی پێ قایم کـات، ئـەم دینـە دژی نـەزانی و نەفامیتیـە، کـە خـەڵکی لـە دیـار نەمانیـدا دەکەونـە جاهیلییەتەوەو شوێن ئاردزوو حەزی لاڕێیان دەکەون و بێ سنوور بۆ دانان دەکەونە هەڵپەی تێرکردنی حەزی مونحەریفیان!! خوای پەروەردگار ئەمە دەزانێت، بۆیە بەم دینە سنوری بۆ دیاری کردوون.. خوای گـەورە سروشـتی ئـەم مرۆڤـە دەناسـێت و دەشزانێت ئەم دینەی، کە بۆی ناردوون چەند و چۆن لەگەڵ سروشت و تەبیعەتیانـدا دەسـازێت و یارمەتیـدەریان دەبێـت لـە دامەزرانـدنی ژیـانێکی ئاسـوودەو بەختەوەردا.. چونکە هەردووکیان هـەر بـە فـەرمانی خـوا هاتوونەتـە سـەر ئـەم

زەمینە.. هەردووکیان لەگەڵ هەموو سیستم و ڕێساکانی گەردوندا گونجاون، هەموویان پێکەوە هاودەنگن و بەرەو یەك ئاسۆی خواوویستی بەڕێ دەکەون.. ئەو خوا کارزانەی دڵی ئەم مرۆڤەی دروست کردووە، هەر ئەویش ئەم وەحیەی بۆ ناردووە، هەر ئەویش ئەم پەیامەی بۆ ناردووە، تا بیکاتە بەرنامەی ژیانی دنیای.. خوای گەورەو کارجوان دەزانێت، کە دڵی ئەم مرۆڤە کە نەخۆش دەکەوێت ئەم قورئانە چارەسەرێتی، ڕەفتاری ئەم مرۆڤە، کە کەوتە لادان، ئەم قورئانە بە پارسەنگی ڕاستی دەکاتەوە.. سروشتی مرۆڤ نەگۆڕەو دینەکەش نەگۆڕەو هیچ گۆڕانێکیش بەسەر یاساو ڕێسای خواییدا نایات.. ئەگەر دڵ و دەروونەکان لە سروشتی دینداریی خۆیان لاڕێ کەوتن، هیچ شتێکی غەیری دینەکەی خوا ڕاستیان ناکاتەوەو، هیچ هێزێك نایانخاتەوە سەر ڕاستە شەقامی دادو سەرڕاستی، سەر سروشتە خواناسیەکەی خۆیان، کە لەگەڵ بزاوتی بونەوەردا دەکەوێتەوە ڕەوتی ڕێك و پێکی خۆی..

# ناوەڕۆك

ئەم بەرگی یەکەمی ڕێبازی بانگەواز، موسوڵمان دەخاتە سەرەتای ئاشنابوونی بە پەیامی ئیسلام، یەکەم، بە زانینی ماناو واتای دین، پاشان بە دۆزینەوەی ڕێبازی گۆڕانکاریی کۆمەڵگە، کە دیدێکی سیاسیەو لە زەمینە فیکریەکەوە دێت، ئەم دوو ڕوکنەش (دیدی فیکری و مومارەسەی سیاسەت پێی) چوارچێوەی ئەو بنەمایانەن، کە ڕەفتاری تاک و کۆی موسوڵمانەکانی تێدا لە قاڵب دەدرێت، ئینجا سەرەنجامی مومارەسە کردنی موسوڵمانان بۆ ئەم ڕەفتارانە، نەریتێکی کۆمەڵایەتی تایبەت بە خۆیان بۆ دروست دەبێت، ئەم دوانەش (ڕەفتارو نەریت) دەبنە ڕوکنی سێیەم و چوارەمی دیدە ئیسلامیەکە .









هەولێر - سەقامی مەحکەمە - ژێر تونێلی شیرین پالاس
ت: 2518138 -2221695 - 2230908
موبایل: 07504605122 – 07701387291
www.al-tafseer.com
E-mail: tafseeroffice@yahoo.com
altafseer@hotmail.com


بەرگ